## لەم ژمارەیەدا



الاشراف الفني: ص. ع


سەر نووسەر
مصلح مصطفی جەلالی

ڕۆشـــنبیری نـــوێ
گۆڤارێکی ڕۆشنبیری گشتی مانگانەیە
دەزگای ڕۆشنبیری و بلاوکردنەوەی کوردی دەری دەکات

له یادی یەکی حوزەیران‌دا :

# سەرکەوتنی بەردەوام لە خۆماڵی کردنی نەوت .. بۆ شەڕی قادسیەی صدام

له یەکەم رۆژی حوزەیرانی هەموو ساڵێك دا ، گەلی تێکۆشەری عیراق شۆڕش ، بیرەوەری خۆماڵی کردنی کۆمپانیای ئیحتیکاریی نەوتی عیراق یاد دەکاتەوە .

بڕیاری شۆڕشی ١٧ — ٣٠ی تەمووز له یەکی حوزەیرانی ساڵی ١٩٧٢ دا ، بە بڕیارێکی بەزەبرو دیار ، سەبارەت بە ڕووبەڕووبوونی گەورەترین پیلانی دەوڵەتی ، دەردەبردرێت .

وە سەرکەوتنی جەماوەریش لەم شەڕەی پڕ لە مەترسی دا ، ڕاستەو دروستی پەیڕەوی شۆڕشی تەمموزو پارتی سەرکردە ، پارتی بەعسی عەرەبی

سۆشیالست‌و بیروباوەری قایم‌و پتەوی سەرکردایەتی بە ژیانی سەربەرزیی‌و سەربەخۆیی گەل‌و وولات ، لەپێناو بنیات‌نانی کۆمەڵێکی ئازاد کە رۆڵەکانی بە سەربەست‌و ئابڕوومەندانە تێیدا بژین ، دووپات دەکاتەوە .

نزیکەی نیو سەدە ، کۆمپانیای ئیحتیکاریی نەوتی عیراق ، دەستی بەسەر (٦٥٪)ی تێکرایی سامانی نەوتی وولات‌دا گرتبوو و ، ئابووری وولات‌و سیاسەتی عیراق بەر لە شۆڕش – لەژێر رکێفی‌دا بوو . . وە بەگوێرەی بەرژەوەندی خۆی‌و خواستی بۆگەن‌و ئیستعماری‌یەوە ، دەستی دەخستە سەر کارەکانی پشکنین‌و دەرهێنان‌و ناردنەدەرەوەی نەوت ، کە ئەمەش بووبووە هۆی خولقاندنی بارێکی ئاڵوزو دوواکەوتوویی ئابووری وولات‌و تەگەرە خستنە پێش نەخشەکانی پەرەپێدان کە گشت بوارەکانی پیشەسازی‌و خزمەتگوزاری‌و کشتوکاڵیدا ، وە بلاوبوونەوەی هەژاریی‌و نەخۆشی‌و نزم‌بوونەوەی باری ژیانی هاووڵاتیان .

هەر لەبەر ئەوە بوو ، سەرکردایە پارت‌و شۆڕش ، دەستی دایە دەرهێنان‌و پاککردنەوەی پیزەکانی ئیستعماریی‌و هەنگاونان بەرەو بنیات‌نانی کۆمەڵێکی سۆشیالستی دیموکراتی یەکگرتوو .

راپۆرتی سیاسی کۆنگرەی هەشتەمی هەرێمایەتی پارتی سەرکردە ، ئەو راستیەی دووپات کردووەتەوە کەوا ئەو ئاڵۆزی‌و ئاژاوەو لادانەی کە لە سەردەمی کۆنەپەرست‌و دیکتاتۆریەت‌دا سەرانسەری وولاتی گرتبووەوە ، تەگەرەیێکی گەورەی خستبووە پێش رێگای سەربەخۆیی سیاسی‌و ئابووریی عیراق تێکۆشەر .

جا «شەڕی وەدی‌هێنانی سەربەخۆیی ئابووری لە هەرێمی عیراق‌و ، لەپاشان پتەوبوونی سەربەخۆیی سیاسی‌و ، ئازادو سەربەست‌بوونی ئیرادەی نیشتمانی لە تەوق‌و دیلێتی‌دا ، شەڕی رزگاربوونی سامانی زەوت بوو لەژێر چنگی پیس‌و پۆخڵی کۆمپانیا مۆنۆپۆڵە ئیستعماری‌یەکان‌و دەست‌بەسەراگرتنی تەواوی سامانە لە – نەخشەکێشان‌و بەرهەم‌هێنان‌و ناردنەدەرەوە – دا ، وە بەبێ ئەم شەڕە عیراق لەژێر رکێفی ئابووری ئیستعماریی رزگار نابێت‌و هەر سەرکەوتنێك لە مەیدانەکانی تر وەدی‌بێت ، سوودو کەڵکی نیەو ناتەواوە» .

بەم جۆرە . . سەرکردایەتی پارت‌و شۆڕش ، وە لەژێر ئاراستەو سەرپەرشتکردنی راستەوخۆی سەرۆکی تێکۆشەر صدام حسین ، دەستی دایە دانانی سیاسەتێکی ئەوتۆ کە بەهۆیەوە بتوانرێ سامانی نەوتمان خۆماڵی بکرێت .

یەکەمین لێدانی توندو تیژ کە لە یەکەمین رۆژی حوزەیرانی ساڵی ١٩٧٢ دا بوو ، هیواو ئاواتی لە دڵ‌و دەروونی جەماوەری تێکۆشەری عیراق نزیك خستەوە . . . ئینجا کارەکانی خۆماڵی‌کردنی کۆمپانیاکانی بێگانە لە کۆمپانیای نەوتی بەسرە دەستی پێ‌کرد .

بەڵێ . . لەو کاتەی کە دوێنێ ، شۆڕشی ١٧ – ٣٠ ی تەمووز بە خۆماڵی‌کردنی نەوت ئامانجێکی پیرۆزو بنەرەتی وەدەست‌هێناو توانی ئەم سامانە گرینگە بۆ خزمەتی گەشەپێدانی ئابووری‌و کۆمەڵایەتی‌و کارەکانی بنیات‌نانی سۆشیالستی لە وولات‌دا بخاتە کار ، وا ئەمرۆ ئامانجێکی تری گەورەو پیرۆزتر وەدی دێنێ کە ئەویش سەرکەوتنە لە شەڕی قادسیەی دووەم ، قادسیەی پاڵەوانی رزگاریخوازی نەتەوەیی ، سەرۆکی تێکۆشەر صدام حسین دژی فارسە نەفام‌و گەوجەکان کە بەدرێژایی مێژوو چاویان بڕیووەتە ئاو و خاك‌و نیشتمانی عیراق شۆڕش‌و هیچ کاتێکیش لە دەست‌خستنە ناو کاروباری ناوخۆیی عیراق وازیان نەهێناوە .

هەروەك چۆن گەلی عیراق ، بە کوردو عەرەب‌و کەماتبەکانیەوە ، لە شەڕی خۆماڵی‌کردنی نەوت‌دا ، دەست لەناو دەست‌و بە گیانێکی فیداکارانە لەگەڵ سەرکردایەتی پارت‌و شۆڕش‌دا وەستان . . . ئاواش لە شەڕی ئێستامان‌دا دژی فارسە رەگەزپەرستەکان . . وە بە خەبات‌و تێکۆشان بۆ پاراستنی ئاوو خاکی نیشتمان ، خوێنی خۆیان کردووەو دەکەنە قوچی قوربانی‌و گومانیش لەو راستیە ناکرێ کە ئەنجامی هەر کارو کردەوەو شەڕو هەڵس‌وکەوتێك ، بۆ هەقخوازان سەرکەوتنەو ، تەنیا پەشیمانی‌و رووڕەشیش بۆ شەڕخوازان‌و دەست‌درێژکەران دەمێنێتەوە .

– هەزاران سلاو بۆ سەرکردایەتی پارت‌و شۆڕش ، بە سەرۆکایەتی پاڵەوانی رزگاریخوازی نەتەوەیی ، سەرۆکی تێکۆشەر صدام حسین ، بەبۆنەی یادی یەکی حوزەیران .

– هەزاران سلاو بۆ جەنگاوەرە خۆین‌گەرم‌و نەبەردەکانی قادسیەی دووەم .

– هەزاران سلاو لە گیانی پاکی شەهیدانی نیشتمان .

سەرکەوتنیش هەر بۆ عیراقەو مردن‌و رووڕەشیش بۆ دوژمنانی عیراق‌و مرۆڤایەتی .

پێداچوونەوەیەك

# بازاری ڕەش و بێ ئابڕوویی لە ئێران دا لە پەرەسەندن دایە

لە پێداچوونەوەیێکی تایبەت بە بارودۆخی ئێستای ئابووری ئێران . لە ژێر تیشکی حوکمی ڕژێمی خومەینی‌یەوە ، گۆڤارێکی فەرەنسایی ئەم بارودۆخە ناڵەبارەی وا پیشان داوە کەوا شپرزەو تێکچوون‌و شکستەیێکی تەواو و بەردەوامە لە گشت بوارەکانی دا جگە لە بواری بازاری ڕەش‌و بێ ئابڕوویی‌و خراپەکاری‌یەوە نەبێت کە لە پەرەسەندن‌و بەرزبوونەوەیێکی ئەوتۆدان کە ئێران لەمەوپێش شتی وای نەبینیوە .

بەپشت بەستن بە ژمارەو بۆچوونی ئابووری‌یەوە کە لەم بارەیەوە ڕاگەیاندراوە ، ئەوە بەر بیردەکەوێ کە بارودۆخی ئابووریی لە ئێران‌دا ئێستا کە ڕێگایێکی تەنگەبەرو بەستراوی لە هەردوو لایەکانی‌دا گرتووەتە بەرو پێیدا دەڕوات . . . ئەمەش وا دەگەیەنێ کەوا هیچ گومان تێدا نیە کە لە حاڵەتێکی تووانەوەو خنکاندن دایە ، وە هەر هەوڵێك بۆ باشکردنی دۆخی ئابووریی یان بەلای کەمەوە

گەڕاندنەوەی بۆ قۆناغەکانی پێشوویەوە مەحالەو رزگاربوونی بۆ نیە . . وە ئەم بارە شکستەیی یەش بەرووبوومی نارێکی ی بەڕێوەبردنی رامیاری و ئابووری یە لە ئێران دا لەتەك سووڕبوونی کوێرەیی رژێم لەسەر بەردەوام بوونی شەڕ دژی عیراق .

تەنیا بۆ وێنە . . سەبارەت بە کارتێکردنی هۆی دووەم لە پاڵدانی ئابووری ئێران بەرەو تێکچوون و نەمانەوە ، دەبنیرێ کەوا ٥٥٪ی تێکڕا بوودجەی گشتیی ئێران بۆ خەرجی شەڕو بەردەوام بوونیەوە دانراوە . . جا بۆ ئەوەی وێنەیێکی تەواو بۆ ئەم کارتێکردنە بخەینە بەر چاوەوە ، ئەبێ تەواوی ئەو زیانە بزانین کە بە ئابووری ئێران کەوتووە لە ئاکامی وەرگرتنی رژێمی خومەینی و داروودەستەکەی جڵەوی حوکم لە ئێران داو لە ئاکامی شەڕەوە ، کە هەندێك راپۆرت بە زیاتر لە ١٠٠ سەد ملیار دۆلار دایدەنێن . . وە بە کۆکردنەوەی هــەردوو ژمــارەی سەرەوەو بەراوردکردنی لەگەڵ باری دارایی ئێرانەوە لەژێر تیشکی ئەو زیانەی لە ئاکامی شەڕەوە بە بەرهەم و ناردنە دەرەوەی نەوتی ئێران گەیەندراوە کە تا کە رێگای پەیدا کردنی «دراوی گران — ٥» ، وێنەکە روونتر دەبێتەوە .

سەبارەت بەهۆی یەکەمیشەوە ، راپۆرتی دبلۆماسی کە لە بالیوزخانە باوەڕپێکراوەکان لە تاران دا دەرچووینە دەست نیشانی ئەوە دەکەن کەوا هەڵئاووسانی ئابووریی بەلای کەمەوە بە رادەی ٢٥٪ لەهەر ساڵێکەوە بەرز دەبێتەوە .

# پێداچوونەوەیێک

# هەڵوێستی ئەم دوواییەی اُسد

# تاوانبارو ... مەبەستە بۆگەنەکانی



هەڵوێستی ئەم دوواییەی – حافظ أسد – ی سەرۆکی رژێمی سوریاو داردەستە بەکرێگیراوو نەفامەکەی سەبارەت بە داخستنی سنووری نێوان سوریاو عیراق‌و قەدەغەکردنی تێپەربوونی نەوت بە خاکی سوریای برادا ، بەرامبەر بە سەرکردایەتی پارت‌و شۆرش‌و جەماوەری خەباتگێری عیراق ، هەڵوێستێکی نوێ‌و سەیر نیە .

ئەم هەڵوێستەی دەستەی خوێنمژ، تەنیا بۆ بەجێگەیاندن راپەڕاندنی بەندەکانی هاوکاریی‌و هاوپەیمانێتی نێوان اسدو خومەینی نیە . . .

بەڵکو لە بنەڕەتدا، جێبەجێکردنی راپەڕاندنی نەخشەو پیلانێکی کۆنی زایۆنیزمی دوژمنە، بە دامەزراندن‌و مانەوەی قەوارەی زایۆنیەوە دەبەسترێتەوە .

مەبەستی پێشووو ئێستای ئەم پیلانەی زایۆنیش - هەروەك کە دامەزرێنەرانی ئەمەیان مەبەست بووەو «دیڤید گۆریۆن» لە یادداشتەکانی خۆیدا باسی‌کردووە - ئەوەیە کە چەند دەوڵەتۆکەیێکی تیرەگەریی‌و بەهێز لە دەوری ئەم قەوارەیەدا کۆ بکاتەوە . . . جا لەبەر ئەمە، دامەزراندنی رێکخراوو کۆمەڵەو پارتی تیرەگەریی توخم‌پەرست لەم ناوچەیەدا، بەهیچ جۆرێك خۆی لە پیلانە چەپەڵەکانی زایۆنی رەگەزپەرست جیا ناکاتەوە .

بێگومان ئەمەش شتێکی کتوپڕ نیە کە - حافظ اسد - لە ئاکامی پیلان‌و پاڵپشت‌گرتنی تاوانبارانەوە، بتوانێ دەسەڵآن لە سوریادا بدزێت‌و رژێمێك کە پشت بە تیرەگەریی ببەستێت. تێیدا دابمەزرێنێت . . بەڵام یەکگرتنی گەلی عەرەبی سوری‌و وەستان‌و خۆڕاگرتنی دلێرانەیان دژی تیرەگەریی - أسد - و باوەڕبوونی پتەویان بە یەکێتی نیشتمانی‌و چارەنووسی عەرەبی، رۆژ دوای رۆژ وای لەم رژێمە کرد کە زیاتر بێهێزو دوور لە جەماوەر لە قوژبنێکی کۆشکی کۆماری‌دا هەڵتووتکێ .

کە مەبەستی هەرە گەورەی زایۆنی دوژمن، فراوانبوون‌و داگیرکردنی خاك‌وهێنانەکایەوەی زۆرترین رێکخراوو کۆمەڵەو پارت‌و رژێمی تیرەگەریی لەم ناوچەداو سەرشۆڕکردنیان بۆ « ئامۆژگاری‌و رێنماییەکان »ی زایونیزمی رەگەزپەرست بێت . . بۆچی بە پیلانەکانی‌و پاڵدانی - اسد - ی تاوانبارو سەرشۆڕ، بۆ راپەڕاندنی ئەم مەبەستە بۆگەنانەی، خزمەتی ئەم رژێمە خوێن‌مژو گومان‌لێکراوە نەکات ؟

وە بۆچی - پاش ئەوەی کە گەوجە مەلا کانی قوم‌و تاران بە سەرکردایەتی مەلا خومەینی - ، ئێرانیان کردە گۆڕەپانی سەگ‌کەوزێکی رەگەزپەرستانی زایۆنی‌و رشت هانیان دان کە دژی عیراقی شۆڕش، بۆ راپەڕاندنی پیلانەکانی خۆیان‌و ئیمپریالیزمی ئەمریکی، پەنجەی پەشیمانی بگەزنەوەو لاشەی هەزاران گەنج‌و پیرانی گشت رۆڵەکانی ئێران بخەنەوە - بۆچی پردێکی ئاسمانیی بەرەو تاران قیت نەکاتەوەو گشت جۆرە چەك‌و جوبەخانەیان بۆ رەوان نەکات ؟

بێگومان، چێشتەکەش بۆ یەك مەبەست لێنراوەو بەلای ئێمەوە نوێ‌و سەیر نیە گەر هەر سێ رژێمی چەپەڵ سمێڵی خۆیان بە رۆنە نیوشکی ئەم چێشتە چەور بکەن .

هەرچۆنێك بێت، رق‌وکینەی - حافظ اسد - دژی گەلی عەرەبی سوریاو عیراقی تێکۆشەر، بۆ ئەمرۆو دوێنێ ناگەرێتەوە . . . پیلان‌دانان‌و ئاژاوەنانەوەو راپەڕاندنی تێکڕا خواستە بۆگەنەکانی زایۆنی‌و ئیمپریالیزمی جیهانی . . . زۆر لەمێژەیەو ئاشکراو روون‌و بەردەوامە .

رژێمی چەپەڵ لە سوریا، وا دەزانێ کە گوایە گەر سنووری لەگەڵ عیراق داخست‌و تێپەڕبوونی نەوتی عیراق بە خاکی سوریادا بڕی، ئەوە باری ئابووری عیراق شلەژاوو تێکشکاو دەبێت‌و سەرەنجام کار لەو سەرکەوتنە مەزنانە دەکات کە جەنگاوەرە خوێن‌گەرمە ئازایەکانی قادسیەی صدام بەسەر رژێمی خومەینی‌و کولکە مەلایانی قوم‌و تاران وەدەستیان هێناوە . . . ئەوسا کە کتوپڕ بەرەو خاکی عیراق دەکشێن‌و دەیدەنە پاڵ وولاتی فارس ! !

بەڵام حافظ أسدو خومەینی هاوپەیمانی، ئەوەیان لەبیر خۆیان بردەوە کە عیراقیەکان توانایێکی لە رادەبەدەریان هەیە کە لە هەموو بارو دۆخیکدا دەتووانن رووبەرووی گشت جۆرە هەڵوێست‌و پیلانی چەپەڵانە ببن‌و تەوق هەموو ئەو پیلانانە - هی کام لایەن بێت - بشکێنن .

گەلی تێکۆشەری عیراق کە زیاتر لە ۲۰ مانگ بە توواناو دلێرانە دژی فارسە رەگەزپەرستەکان دەجەنگێت‌و رۆژ دوای رۆژ سەرکەوتنی مەزن‌و کاریگەرتر وەدی دەهێنێت‌و بەو پەڕی باوەڕو ئیمانەوە خۆی کردووەتە مەیدانی شەڕو خوێنی پاك‌و گەشی خۆی لە پێناو پاراستنی ئاوو خاك‌و شەرەفی عیراقیەکانەوە کردووەو دەکاتە قۆچی قوربانی. تووانای ئەوەی هەیە کە زیاتر تێبکۆشێ‌و بەردەوام بووەستێ‌و بە هێزتر رووبەرووی هەموو جۆرە پیلانێك ببێت . . . وە بە ئارامگرتن‌و پتر باوەڕبەخۆبوون، گشت نەخۆشێك بخاتە ئەو لاوە .

رۆڵەی عیراق، نانێکی ووشك‌و سووتاو بە نرخی هەموو زێڕو ئاڵتوونی جیهان ناگۆڕێتەوە . . چونکە ئازادو سەربەست دەژیت . . چونکە سەربەرزیی‌و کەرامەتی، سەربەرزیی‌و کەرامەتی وولات‌و نیشتمانە .

# چەند دەرسێک لە قادسیەی صدام

* ئەو ناوانەی هەمیشە وەك ئەستێرەی گەشاوە لە ئاسمانی پانو بەرینی نەتەوایەتیو نیشتمانپەروەری ئەدرۆشێنەوە .

* قادسیەی صدامو یەکێتی وولات .

* ئەو ناوانەی فڕێئەدرێنە سەر زبڵدانی مێژوو .

نووسینی :

عبدالستار طاهر شریف

لەم چەند دێڕانەی خوارەوە ، کە بەراوردی هەندێ لە لایەنەکانی قادسیەی صدام ئەخەینە روو ، وەك شریتێکی سینەمایی ئەو گەندو پیسایيانەی لە ئەنجامی شەپۆلەکانی دەریاکانی جەنگەکە کەوتوونەتە کنارو ، دەریاکان بەو پانو پۆڕییانەیانەوە جێگایانیان نەکردۆتەوە ، هەوڵ ئەدەین لەم نووسینەماندا بیخەینە روو .

هەموو ئەزانین لە سەرەتای چواری ئەیلولی ١٩٨٠ وە رژێمی کۆنەپەرستو رەگەزپەرستو سیوقراطی خوومەینی دەستی کرد بە بومباران کردنی شارەکانی سەر سنووری عێراق ، لەو شارانە (مندلیو خانقینو زرباطیة) بەو نیازەی پەلاماری سوپای عێراق بداو شۆڕشی عێراق ناچار بکا بۆ ملکەچ کردنو سەلماندنی وولایەتی خوومەینی بەسەر عێراقدا ، بۆ بەرەو دوا گەڕاندنەوەی ڕەورەوەی ڕێڕەوی شۆڕشگێڕانەی عێراق ، کە ئیمپریالیزمو نوکەرەکانی لە ناوچەکە دوای سەرکەوتنی شۆڕشی حەودەی تەمموزی ساڵی ١٩٦٨ بەهەموو توانایێکیانەوە نەیانتوانی بگەن بەم ئامانجە . . . خوومەینی و ئەوانەی خوومەینییان دروستکردبوو دووبارە نەگەیشتنە ئامانجەکانیانو مەسەلەکەش بەپێچەوانە بەسەر خوومەینیو ئاغاکانیانا شکایەوەو هێزە چەکدارەکانی عێراق بۆ پاراستنی گەلی عێراقو خاکی عێراق لە پەلاماردانی رژێمی خوومەینی ئاو دیوی ئەو دیوی سنوور کرانو بە هەزارەها کیلومتری چوارگۆشەیی لە خاکی ئێران لە لایەن سوپای عێراقەوە داگیرکرا ، گەلی عێراقو خاکی عێراقیش بە سەلامەتی لە نیازو

ئامانجی گەلاّوو چەپەلّی خوومەینیو دارو دەستە عەمامە بەسەرەکانی پاریزرا .

شەڕی دوورودرێژی نێوان عێراقو ئێران گەلیّ شتی خستە روو . . . لە لایەکەوە پالّەوانێتی گەلی عێراق بە هەموو جیهان ناساندو ئاشکرای کرد کەوا گەلی عێراق بە کوردو عەرەبو کەمینە نەتەوەکانیەوە بە سەرۆکایەتی سەرۆك صدام حسین ئەو تیکە هاسانە نیە پیّیان قووتبدریّ ، بەلّکو مەسەلەکە بە تەواوی بەپێچەوانەی هەموو ئەو بینینو چاوەڕوانانەی دوژمنانی گەلی عێراق بوو ، ئێستا عێراق دوای تێپەربوونی سالّو نیوێك زیاتر بەسەر شەڕەکەدا گەلیّ لە پێش شەڕەکە بەهێزترەو لە هەموو کاتێکی پێشوتریش زیاتر یەکێتی تێکوشانی هەردوو گەلی کوردو عەرەب لە عێراقدا خویّ چەسپاندووە . . .دەربارەی یەکێتی تێکوشانی هەردوو گەلی کوردو عەرەب لە عێراقدا ( ئەوەندە سورینو دلّنیاین لەوانەیە هەندیّ – نالّیم زۆر – لە خوێنەرانی بەرێز بلّێن ئەی گوایا ئەو کوردانەی دژوەستاوون شوێنیان لە «اعراب» چیە ؟ ئەگەر پەلەیان نەبیّ باسی ئەوانیش ئەکەین)

ئەو شەهیدانەی گیانی پاکی خۆیان بەختکرد لە پێناوی خاكو ئاوی وولاتو لەپێناوی پاراستنی شەرەفو کەرامەتی گەلەکەیان ، بیّگومان هەمیشە لە دلّ میللەتا ئەژینو هەمیشە لە ئاسمانی نەتەوایەتیو نیشتمان پەروەریدا ئەدرۆشێنەوەو رێبازی خەباتو کۆشەشو گیان بەختکردنیان بۆ هەموو رۆلّەێکی دلّسۆزو بەشەرەفی گەلی عێراق تەختکردووە . ئەوان ئەو خەباتکەرانەن کە خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا باسیانی کردووە : ( من المؤمنين رجال صدقوا ما عاهدوا الله عليه فنهم من قضى نحبه ومنهم من ينتظر وما بدلو تبديلا . )

شەڕی نێوان عێراقو ئێران لە ماوەی ئەم سالّو نیوەدا رۆژ بەرۆژ زیاتر لە سەرەتای دەشتپیّکردنی شەڕەکە ئاشکرائەبیّ کەوا رژێمی خوومەینی رەگەزپەرست دارەستەی ئیمپریالیزمو زایونیزمە ، بەتایبەتی کاربەدەستانی رژێمی خوومەینی خۆیان چەند جار دانیان بەوەدا ناوە کەوا ئەو چەکەی شەڕی گەلی عێراقی پیّدەکەن بەشێکی لە رژێمی زایونیزم ئەکرنو ئەم مەسەلەیە ئێستا ئەوەندە روونبۆتەوە ، ئێمە لەم نووسینەماندا پێویستمان بە بەلّگەو ئیسپات نیە بۆ پالّپشتکردنی بۆچوونەکانمان . . . ئەگەر بەمە کۆتایی بە هاریکاری نێوان رژێمی خوومەینی رەگەزپەرست بێنین لەگەلّ رژێمی زایونیزمدا ، کە لە بنەڕەتدا رژێمەکەیان لەسەر کەلاكو خوێنی رۆلّەکانی گەلی فەلەستینی دامەزراندووەو خاکی نەتەوەی عەرەبیان لە فەلەستین داگیرکردووەو بەردەوامن لە داگیرکردنی خاکی عەرەب ، کە دوا بڕیاری زایونیزمەکان ، بڕیاردانی داگیرکردنی یەکجاری « جولان» بوو ، کردنی جۆلان بە پارچەێك لە دەولّەتی زایونیزم . . . کەواتە هاریکاری‌کردنی رژێمی خوومەینی لەگەلّ زایونیزمدا بۆ روخاندنی شۆرشی حەڤدەی تەمووزی ١٩٦٨ لە عێراقداو پاشان هەولّدانی داگیرکردنی وولاتی «البحرين»و پێش ئەوەش داگیرکردنی سیّ دوورگەی عەرەبی ، ئەمانە هەموو مانای شەڕی عەرەب کردن ئەگەیێنیّ ، نەك شەڕی عێراق ، وە عێراقیش لە سەرەتای دەستپێکردنی شەڕەکە ئەم لایەنەی روونکردۆتەوە کەوا سوپای عێراقو گەلی عێراق لە جیاتی هەموو نەتەوەی عەرەب شەڕی خۆپاراستن دژی رژێمی خوومەینیو دارودەستە عەمامە بەسەرەکانی ئێران ئەکا .

ئنجا ئەگەر ئەمە راستیەو راستیش وەك تیشکی هەتاو وایە بەبێژنگ گلنادرێتەوەو گوم ناکریّ . . . . ئەبیّ بەلگەکانی خائنی نەتەوەی عەرەب (حافظ أسد) چیبیّ بۆ پالّیشت کردنی خوومەینی بۆ ناردنی چەكو جووبەخانە بۆ هێزە چەکدارە بەزیوەکانی ئێران دژی گەلی عێراق ؟ ! !

ئایا مەسەلەکە هەر لەوەوە هاتووە کەوا (دوژمنی دوژمنم دۆستمە .) کەواتە خوومەێنی دوژمنی عێراقەو حافظ ئەسەدیش دوژمنی عێراقە . کەواتە خوومەینی دۆستی ئەسەدە ، یان مەسەلەکە گەلیّ لەم بۆچوونەمان قوولترەو نابیّ بەم سادەییە بویّ بچین .

رژێمی ئەسەد لە سوریا ئاشکرایە ئەویش رژێمێکی تایفەگەریو سەر بە ئیمپریالیزمە ، خۆ ئەگەر وا نیە بۆ شەڕی بەشی زۆری دانشتوانی سوریا ئەکا ، ئایا ئەبیّ وەلاّمی ئەسەدو دۆستانی ئەسەد چیی بیّ بۆ کوشتنی زیاتر لە « ٥ » پێنج هەزار لە دانشتوانی شاری (حماة)ی سوریا . . . کەی بووە بە تۆپو تانگو فرۆکە رژێمێك شارەکانی وولاتەکەی حوکم حوکمڕانی بیّ ، بومبا بارانی بکا . . . لوولەی توپە قورسەکانو تانگەکانی بۆ ئاراستەی «جولان» ناکە کە رژێمی زایۆنیزم داگیریکردووە دانشتوانی ناوچەکە ئەوچەوسێنێتەوە ؟ ئەمانەو کۆمەلّیّ پرسیاری تر لەگەلّ چەوساندنەوەی گەلی کورد لە جزیرە لە سوریا . هەمووی ئەوەمان بۆ ئاشکرا ئەکا کەوا حافظ اسد « ئەبو روغالی» سەدەی بیستەمە بەنیسبەت نەتەوەی عەرەب .

ئێمە جارانو چەند سالّ لەمەوپێش هەمیشە نارەزایی ئەوەمان دەرئەبری کەوا گەلی کورد لە سوریا ئەچەوسێنێتەوە بەلاّم ئیمڕو بۆمان زیاتر ئاشکرا بووە کەوا حافظ اسدی خائنی نەتەوەی عەرەبو بەشدار لە شەڕی خوومەینی دژی عێراق دوا رۆژ ناوی خۆیو کەسو کارەکانی لەسەر زبلّدانی مێژوو بە بۆگەنی هەمیشە ئەمێننەوە .

ئەمە بو کورتی پەنجەراکێشانیّ بوو بۆ ئەو خائنانەی عەرەبنو خیانەتی نەتەوەکەیان کردووە . . . کەواتە با لێرە بوەستینو بگوزاینەوە سەر ئەو نۆکەرانەی کە بەداخەوە جنسیەی کوردییان هەیەو خائنی کوردو عەرەبو هەموو بیرو باوەڕێکی مرۆڤایەتیشن .

له نووسینه‌ماندا ئه‌و قوّناغانه‌ی بنه‌ماڵه‌ی بارزانی خه‌ریکی موو‌ت‌ون کردنی بزوتنه‌وه‌ی رزگاری‌خوازی گه‌لی کورد بوون له ..ستانی عێراق‌و ئه‌نجام‌و ئامانجی بزوتنه‌وه‌که‌یان به ئامانجه‌کانی ..یزم‌و زایونیزم‌و رژێمی حه‌مه ره‌زا شاوه گرێ‌دابوو تا گه‌یاندیانه .. ئه‌نجامه‌ی لای هه‌موو کوردێکی دڵسۆزو نیشتمان‌په‌روه‌ر روونه . . .
.. قوّناغه‌و ئه‌و لایه‌نه جارێ به سه‌ریا بازئه‌ده‌ین‌و به مه‌سه‌له‌یێکی .. دووی کونی له قه‌ڵه‌م ئه‌ده‌ین‌و ئه‌گوازینه‌وه سه‌ر ..ه‌تکاریه‌کانی هه‌ردوو کوره‌کانی مه‌لا مسته‌فا « ئیدریس‌و مسعود .. و به‌شدار بوونیان له شه‌ری خیانه‌تکاری دژی گه‌لی کورد له .. دستانی ئێران‌و چوونه باوه‌شی رژێمی خوومه‌ینی‌و به‌شداربوونیان ..ه‌ت له شه‌ری دژی عێراق ، شان به شانی پاسه‌وانه‌کانی خوومه‌ینی .

بۆ زیاتر روون‌کردنه‌وه‌ی ئه‌م لایه‌نه له نووسینه‌که‌ماندا پاڵ‌ئه‌ده‌ینه .. ئه‌و به‌ڵگه‌نامه‌یه‌ی پارتی دیموکراتی کوردستانی ئێران ده‌ری‌کردووه .. دووایه له‌ژێر ناونیشانی :

**«خیانه‌ته‌کانی قیاده‌ی مووه‌قه‌ت به نه‌ته‌وه‌ی کورد»**

به‌ڵگه‌نامه‌که پێش‌ئه‌وه‌ی له‌سه‌ر خیانه‌تکاریه‌کانی ئیدریس‌و مه‌سعود بدوێ وه‌ك خوێ چێژ هه‌ندێ له تاوانه‌کانی مه‌لا مسته‌فای خستۆته روو ، هه‌رچه‌نده ئه‌و تاوانه لای ئێمه ئاشکراو روونه‌و به‌ڵگه‌مانیش زوره بۆ رسواکردنیان به‌ڵام بێ‌سوود نیه راکانی پارتی دیموکراتی کوردستانی ئیرانیش بخه‌ینه سه‌ر لاپه‌ره‌کانی هه‌ندێ له گۆڤاره کوردی‌یه‌کان‌و خوێنه‌رانی به‌رێز ئه‌وانه‌ی نه‌یان‌بیستووه با ئێمرو یانخوێننه‌وه ، خۆ ئه‌وانه‌ی لۆکه‌یان ئاخنیبوه گوێچکه‌یانه‌وه ئیتر با به‌س بێ له‌مه زیاتر فریو نه‌خۆن .

«سه‌ره به‌هاری سالی «١٢٤٤» ئه‌فسه‌ری به‌ناو بانگی روکنی دوی ئه‌رته‌شی مدرسی له ناوچه‌ی سه‌نگه‌سه‌ر که ئه‌و کاته ناوه‌ندی سه‌رکردایه‌تی بزوتنه‌وه بوو جیگیربوو . به گه‌یشتنی سه‌رهه‌نگ مدرسی بۆ ئه‌وێ ته‌کلیفی براکانی ئێمه روون‌بوو ، **سه‌رۆکایه‌تی بارزانی که نه‌ده‌کرا له فه‌رمانی ساواك‌و روکنی دووی ئه‌رته‌شی ئێران سه‌رپێچی بکات به ره‌سمی نوێنه‌رانی حزبی ئێمه‌ی بانگ کردو پێ‌ی راگه‌یاندن که ده‌بێ بنکه‌کانیان له‌نزیك سنووری ئێران تێك ده‌ن‌و به‌هیچ جۆرێکیش هاتوچۆی کوردستانی ئێران نه‌که‌ن . له‌وه‌ش زیاتر رۆیشت‌و داوای‌کرد که هه‌موو چه‌شنه تێکۆشانێکی** حزبی دیموکراتی کوردستانی له ..ێو خۆی وولاتیش‌دا رابگیری . به‌دوای ئه‌و فه‌رمانه مێژووییه‌دا ! ! ئه‌فرادی بارزانی بۆ خویان په‌لاماری بنکه‌کانی کوردی ئێران له‌نیزیك سنوریان‌داو تێکیان پێچان‌و بۆ ئه‌وه‌ی که براکانی ئێمه نه‌توانن به‌یاننامه‌و نوسراوی حزبی بلاّو بکه‌نه‌وه هه‌موو که‌ره‌سته‌ی چاپه‌مه‌نی‌و کتێبخانه‌که‌شیان به‌تالان بردن .

لێره‌دا بوو که **سه‌رۆکایه‌تی بارزانی یارمه‌تی ده‌وڵه‌تی کۆنه‌په‌رست‌و نۆکه‌ری ئیمپریالیزمی حه‌مه ره‌زا شای** له‌جێگای **یارمه‌تی خه‌ڵکی کوردستان داناو** ، روی‌کرده دوژمنانی گه‌لی کوردو پشتی له کۆمه‌لانی خه‌ڵکی کوردستان کرد .) ل ٧ – ٨ .

ئه‌مه‌ی سه‌ره‌وه ئه‌و راستی‌یانه‌یه وه‌ك تیشکی هه‌تاو به بێژنگی درۆو ده‌له‌سه گل نادرێته‌وه ، ئه‌گه‌ر چی‌ی له رابوردوودا به زه‌بری لووله‌ی تفه‌نگ‌و کوشتن‌و برین ، مه‌لا مسته‌فا خۆی‌و کوره‌کانی ئه‌م تاوانباریانه‌یان حه‌شار ئه‌دا ، وا ئێمرۆ هه‌موو سه‌ر هه‌ڵ‌ئه‌ده‌نه‌وه وه‌ك دوومه‌ڵانی به‌هاری ساڵێکی ته‌رو تووش . . . ئاشکراشه ئێمرو کوره‌کانی مه‌لا مسته‌فا دوای گه‌رانه‌وه‌یان له ئه‌مریکا بۆ ئێران‌و چوونه باوه‌شی خوومه‌ینی چه‌کیان هه‌ڵگرتووه دژی گه‌لی کورد له کوردستانی ئێران‌و یارمه‌تی رژێمی کۆنه‌په‌رستی خوومه‌ینی ئه‌ده‌ن بۆ له‌ناوبردنی رۆڵه به‌شه‌ره‌فه‌کانی گه‌لی کوردستان . . ئایا ئه‌بێ مه‌سه‌له‌ی نۆکه‌رایه‌تی‌و خزمه‌ت‌کردنی بێگانه لای ئه‌م خێزانه « خێزانی مه‌لا مسته‌فا » مه‌سه‌له‌یێکی غه‌ریزی بێ ، وه‌ك ئه‌و ته‌یرو توالانه‌ی له هێلکه‌کانیاوه سه‌ر دێننه ده‌ره‌وه‌و دایك‌و باوکی خۆیانیشیان نه‌بینیوه ، به‌ڵام له‌سه‌ر هه‌مان ره‌وشتی ئه‌وان ئه‌رۆن به‌رێوه . . . ئه‌گه‌ر مه‌سه‌له‌که لای منداڵه‌کانی مه‌لا مسته‌فا غه‌ریزیش نه‌بێ ئه‌وا دیاره ئه‌نجامی جۆره فێربوونێکه .

دۆینێ وه‌ك له سه‌ره‌وه به‌ڵگه‌نامه‌که‌ی پارتی دیموکراتی کوردستانی ئێران روونی کردۆته‌وه ، مه‌لا مسته‌فا بزوتنه‌وه‌ی رزگاری‌خوازی گه‌لی کوردی ئێرانی سه‌رکووت ئه‌کرد ، ئیمرۆش کوره‌کانی . . . ده‌با بزانین به‌ڵگه نامه‌که‌ی پارتی دیمراکراتی کوردستانی ئێران له‌م باره‌یه‌وه چی‌ترمان بۆ روون‌ئه‌کاته‌وه :

« هه‌ر له سه‌ره‌تاوه دیاربوو دواییش به به‌ڵگه ده‌رکه‌وت که شه‌رتی هه‌ره بنه‌ره‌تی یارمه‌تی رژێمی حه‌مه ره‌زا شا به سه‌رکردایه‌تی بزوتنه‌وه‌ی کوردستانی عێراق ئه‌وه بووه که ئه‌و سه‌رکردایه‌تی‌یه رێگا نه‌دات هیچ چه‌شنه بزووتنه‌وه‌یه‌کی دژی رژێمی کۆنه‌په‌رست‌و نۆکه‌ری ئیمپریالیزم له کوردستانی ئیپران سه‌رهه‌ڵ‌بداو گوڵ بکات ، پیاو هه‌ق بلێ که ده‌رباره‌ی بارزانی زور به سه‌رراستی ئه‌و به‌ڵێنه‌ی به‌جێ گه‌یاندو هیچ کاتێك نه‌یهێشت ده‌رباره‌ی په‌هله‌وی له‌و باره‌وه گله‌یی بکات . ل ٩

پاشان به‌ڵگه‌نامه‌که به‌شێك له نامه‌که‌ی مه‌لا مسته‌فای بلاّوکردۆته‌وه که بۆ جیمی کارته‌ری نووسیوه به‌م جۆره‌ش کۆتایی به نامه‌که‌ی دێنێ :

(په‌نجا ساڵه گه‌لی کورد برواو ئیمانی ته‌واوی خۆی داوه به من منیش ئه‌و بروایه پێشکیش ئێوه ده‌که‌م) ل ٣١٥ له کاتی خۆی نامه‌که‌ی مه‌لا

مستەفا بۆ جیمی کارتەر گۆڤارو ڕۆژنامەکانی جیهانی بلاّویان کردۆتەوەو نوسخەیێك لەو نامەیەش لای ئێمە – نووسەری ئەم ووتارە – دەست ئەکەوێ .

پاشان بەڵگەنامەکەی پارتی دیموکراتی کوردستانی ئێران ئەلێ : ( . . جگە لەو دوژمنایەتیە ڕاستەوخۆیەو سەرباری ئەوەی بۆ خۆیان هەمیشە شوێنە ستراتیژیەکانیان بۆ دوژمن دەگرت – کەواتە بۆ ڕژێمی خومەینی – لە ناوچەی (ورمی) دەستیانکرد بە دەلاڵی و گەران بە نێو سەرۆك عەشیرەتەکانی ئەو ناوچەیەدا . لە ئەنجامدا بەشێکی زور لەو سەرۆك عەشیرەتانەیان هەڵفریواندو چەکی خەیانەتیان دانە دەستو کردیانن بە جاش .

**بەرامبەر بەو خۆش خزمەتیە کۆنەپەرستی ئێران رووی مەرحەمەتی تیکردنو مانگی دە «١٠» ملیون تمەنی جاشانە بۆ برینەوە کە پوول شەش مانگ واتە شەسەد (٦٠٠) ملیون تمەنی بە ئاگاداری و لەپێش چاوی ئەفسەرێکی ئەندامی حیزبی ئێمە لە ژاندارمری کلی کیشوەر بە نەقدی تەسلیمی دەستی جەنابی ئیدریس بارزانی کورد پەروەر ! ! کرد .) ل ٤١ – ٤٢**

خۆ فرۆشتنو مامڵەتکردن بە مەسەلەی کوردو بزوتنەوەی کوردایەتی لای ئەم خێزانە ، هەر وەك باسمان کرد نازانین مەسەلەیەێکی غەریزیە یان چاوچنۆکیو فێربوونە ، دوای فێربوونێکی دوورو درێژیش مەسەلەکە وا هاسان نیە تەرك بدرێ .

هەروەها لە بروانامەکەدا هاتووە :

« . . ئەم دواییانە ئیدریس بارزانی لە کۆبوونەوەیکی جاشەکانی شمالدا گوتویەتی : تەنیا بنەماڵەی بارزانی حەقیان هەیە داوای خودموختاری بۆ گەلی کورد بکەن . هەر حزبێك لە هەر بەشێکی کوردستاندا داوای خودموختاری بکا ئێمە لیّ ی قبولّ ناکەین .»ل ٤٤

« دیارە کەس حەقی ئەو کوێخایەتیەی بە نۆکەرانی گوێ لە مستی سیای ئەمریکاو موسادی ئیسرائیل نەداوە) ل ٤٤ .

پاشان بەڵگەنامەکە مەسەلەکە زیاتر روون دەکاتەوە :

«بەرێوبەرانی بەناو پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراق ئێستا بە نرخێکی هەرزان خۆیان بە ڕژێمێك فرۆشتووە کە نەك هەر خودموختاری کوردستان بە رەسمی ناناسێ بەڵکو لە بنەرەتدا هەستی نەتەوایەتیو نیشتمانپەروەری بە کفرو پێچەوانەی ئاینی پیرۆزی ئیسلام دەزانێ .) ل ٤٤

بروانامەکەی پارتی دیموکراتی کوردستانی ئێران تیشکی خستۆتە سەر گەلێ تاوانی تری ئەم بەرەبابە .

بەڵگەنامەکە ناوی کۆمەڵێ لە ئەندامانی سەرکردایەتیو پێشمەرگەکانی کوردستانی ئێران دەستنیشان دەکا کەوا چۆن مەلا مستەفاو دەستەو دایەرەکەی لەناویان داوون شەهیدکراون بۆ رازیکردنی ڕژێمی حەمە ڕەزا شار هەندێکیانیش تەسلیمی جەللادەکانی حەمە رەزا شا کردۆتەوەو لە ئەنجامدا تیرەباران کراوون لەم ناوانە :

«شەهید سولەیمان موعینیو شەهید مەلا رەحیمی ویردی کە بەناوی میرزا ئەحمەد دەناسرا . ئەم دووانە هەردووکیان ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی پارتی دیموکراتی کوردستانی ئێران بوون .

لەگەڵ شەهید هاشم حەق تەلەبی کە مشهور بوو بە (قادر شەریفی) لەگەڵ شەهید خەلیلی مستەفا زادە کە بەناوی «خلیل شەوباش» ناسرابو لەگەڵ مەلا ئاوارەو سمایلی شریف زادەو عەولاّ موعینی و مینە شەمو دەها ناوی تر .»

لاپەرەکانی بەڵگەنامەکەی پارتی دیموکراتی کوردستانی ئێران بریتیە لە «٥٦» لاپەرەی فولسکاب ، بەلاّم ئێمە لەم نووسینەماندا دەرفەتمان نیە لەوەندە زیاتری لێ روونبکەینەوە ، بۆ ئەوەی هەموو لاپەرەکانی گۆڤارەکە داگیر نەکەین .

دوێنێ مەلا مستەفا دوای تەمەنێکی دوورو درێژی خیانەتکاریو نۆکەرایەتی ملی لە شارێ لە شارەکانی ئەمریکا لارەوە بوو ، پاشان تەرمەکەیان هێنایەوە بۆ کوردستانی ئێرانو لە شاری «شنۆ» ناشترا . ناشتنی تەرمەکەشی لە شاری شنۆ وەك بەم دووایە دەرکەوت پیلانێكو شانو/گەرییك بوو بۆ پەلاماردانی گەلی کورد لە لایەن کورەکانیەوە وەك بەڵگەنامەکەی پارتی روونیکردۆتەوە .

هەرچەندە بە رای ئێمەو جارێکی تریش لە ووتارێکدا بلاّومان کردۆتەوە ، دەرکردنی تەرمەکەی مەلا مستەفا لە قەبر – هەرچەندە پارتی دیموکراتی کوردستانی ئیران لە کاتی خۆی نارەزای خۆی دەربری دەربارەی کردەوەکە – ئەگەر راستبێ بە رای ئێمە کردەوەێکی عادیلانەیە وەك موحاکەمە کردنێکی گەلی بۆ ئەو تاوانانەی مەلا دەرحەق بە گەلی کورد کردبووی ، خۆکوشتنی بەندیەکانی « رایەت» دوای هەڵقەندنی قەبرەکانیان بەدەستی خۆیانو پاشان رەمیکردنیان بە دەستی یەکێ لە هاورێ بەندیەکانی هیچ جیاوازێکی نەبوو لەگەڵ تاوانەکانی «هتلر» لە گرتووخانەی «بوخنڤالد» لە ڤایمەری ئەلمانیا . بۆ ئەبێ دەرکردنی تەرمی خوێنرێژێکی وەك مەلا ئەو تاوانە گەورەیە بێ گەلێکی لەسەر لەناوبدرێ ، بەلاّم کوشتن سەوەها بێتاوانو رۆڵەی دلسۆزی گەلێك کەس پرسیاری لەسەر نەکات ! !

لە پێشەکی نووسینەکەمان ووتمان حافظ اسدو بنەماڵەکەی دوارۆژ ناویان لەسەر زبڵدانی مێژو هەمیشە بە بۆگەنی ئەمێنێتەوە . کەواتە پێش حافظ اسد ، مەلا مستەفا ئەو شوێنەی هەڵبژاردووە بۆ خۆیو بنەماڵەکەی ، مەلا مستەفا هەتا هاتایە ناوی لەسەر زبڵدانی مێژو نەبێ لە هیچ شوێنێکی تر نادۆزرێتەوە . . . ئێمروش وا دەرکەوتووە هەدروو

کوڕەکانی مەسعودو ئیدریس گەلێ زیاتر لە باوکیان چوونەتە قوولایی خیانەتکاری نەتەوەکەیان‌و نیشتمانەکەیانەوە .

لە لایێکی ترەوە لە هەندێ قوژبنی زۆر تەسك لە گۆڕەپانی نیشتمان‌پەروەری‌و نەتەوایەتی پێشکەوتنخوازانە **لە ملاو لەولا چەند کەسانێکی زوڕ کەم – لەوانەشە هەستیان بەو کەمیە نەکردبێ – لە سەرەتای** دەست **پێکردنی شەڕی نێوان عێراق‌و ئێران کە ساڵ نیوێك زیاترە بەسەریا تێپەڕدەبێ نە بە نووسین‌و نە بە هیچ کردەوەیێکی تر ناڕەزایی خۆیان دەرنەبڕیوە دژی رژێمی خوومەینی رەگەزپەرست ، هیچ بەڵگەیێکی ئەوتۆیانیش بەدەستەوە نیە بۆ ئەم هەلوێستە نانیشتمانی‌و نا نەتەوایەتیەیان ، خۆ دەربارەی ووسکت‌بوون‌و قڕوقەپیان بەرامبەر** پەلاماردانی رژێمی خوومەینی بۆ سەر گەلی کورد لە کوردستانی ئێران‌و هەوڵدانی قەلاچۆکردنی گەلی کوردو وێران‌کردنی شارو دێهاتەکانی کوردستان ئەوا لەسەر لاپەرەکانی مێژوودا ووسکت‌بوونی هەموو ئەو کەسانەی کەوا کوردن‌و – لە هەر سەرچاوەیێك ئاو ئەخۆنەوە – دژی تاوانەکانی رژێمی خوومەینی ووسکتن‌و چاویان نووقاندوە ناویان ئەچێتە ریزی روو رەشەکانی مێژو ، لەبەر ئەوەی مەسەلەی پارێزگاری لە مانی نەتەوە لە هیچ کاتێکدا هیچ بەڵگەیێك نیە بە ناهەق لە قەلەم بدا ، وە مەسەلەی شەڕی رژێمی خوومەینی دژی گەلی کورد لە کوردستانی ئێران وە مەسەلەی خۆ بەستنەوە بەهەر لایێك ، یان هەر بیروباوەڕێك ، گەلێ لەوە کەمترو نزمترە شان‌بەشانی مەسەلەی هەڕەشەدانی قەلاچۆکردنی نەتەوەکە بوەستێ .

هەر لەم بوارەداو دەربارەی مامڵەت‌کردن بە مەسەلەی کوردایەتی‌و نیشتمان‌پەروەری بەڵام جیاواز لەگەل شێوەو جۆرەکانی ئەو کەسانەی پەنجەمان بۆیان راکێشا کەوا تەریك‌و ووسکتن ، سەرەك صدام حسین زوڕ بە ئاشکرا پەردەی لەرووی ئەو کەسانە داماڵی کەوا خۆیان فرێ‌داوەتە باوەش بێگانەو خەریکی مامڵەت‌کردنن بە کوردایەتی بەبێ شەرمانە . ئەو تاقمانەی ئێمرو لەکاتی جەنگی قادسیەی صدام چەکیان هەڵگرتووە بۆ روخاندنی رژێمی شۆڕشگێڕی عێراق‌و خۆیان فڕداوەتە باوەشی ئیمپریالیزم‌و زایونیزم‌و رژێمی رەگەزپەرستی خوومەینی‌و دوای کلاوی بابردوو کەوتوون گەلی کورد لە کوردستانی عێراق بە یەکیتی‌و پێکەوە ژیان لەگەڵ نەتەوەی عەرەب‌و ، رۆڵە نەبەزەکانی کوردستانی ئێرانیش لە شۆڕشی رەواین دژی شەڕی قەلاچۆکردنیان لەلایەن رژێمی خوومەینی رەگەزپەرست ، گومان لەسەر کەوتنیان نیەو سەرکەوتن هەمیشە بۆ گەلانە .

یەکێ لەو راستی‌یانەی تری قادسیەی صدام خستویەتیە روو لە پرسیارەکەی سەرەك کۆمار تێکۆشەر صدام حسین دەرئەکەوێ کە ئەلێ :

« پرسیارێك لەوانە ئەکەین کەوا کەوتوونەتە سەر هێڵی لادان‌و نوکەری بێگانەن بە شێوەیێکی راستەوخۆ لەو کەسانەی ناویان لەخۆیان ناوە (معارضە)و لەسەر سفرەی بێگانە ئەژین لە دەرەوە . . . پرسیاریان لێ ئەکەین ئەگەر لە پێناوی کورد کارئەکەن بۆچی یەك‌ناگرن بۆ ئازاردانی رژێمی بەغدا وەك ناویان لێ‌ناوە . . . بۆچی بە پارچە پارچەیی ماونەتەوە ئەگەر لە بنەڕەتدا هاندەرەکانیان بێگانە نین ، سەرەڕای خۆپەرستی‌و تاكرەوی . . تووشی نەخۆشیە خەون‌بینین بوونە . . بۆ یەك ناگرن بۆ روخاندنی حوکمەتی بەغدا وەك ئەڵێن‌و وەك خەوی پێوە ئەبینن . خۆ لە هێزو توانا لە یەکیتی‌یە . . . بوچی ناکۆك‌و پارچەپارچەن . . وەڵام ئەوەیە . ئەوانەی پاڵیان پێوە ئەنێن‌و ئایانجووڵێنن یەك لا نیە ، یەك دەوڵەتی بێگانە نیە ، بەڵکو چەند دەوڵەتانێکی بێگانەن . . . وە هەر دەوڵەتێك لەو دەوڵەتە بێگانانە لقێکی تایبەتی خوێ هەیە لەم لقانەو بەناوی ئەو کارئەکەن‌و پارەو چەك‌و پێویستیان لێ وەرئەگرن‌و ئەو وولاتە بێگانانەش بەرژەوەندیان یەك نیە تاکو هەموویان یەك‌بگرن . . هتد»

بەم جۆرە سەرەك کۆمار هەڤاڵی تێکوشەر صدام حسین نوکەرایەتی هەموو ئەو گروپانەی روون‌کردەوە کەوا بەناوی کوردایەتی لەسەر سنوورو لەو دیوو سنوور مامڵەت بە کوردایەتی‌یەوە ئەکەن ، هەر ئەو وولاتە بێگانانەی ماوەیێ لەمەوپێش هەندێکیانی لە دمشق کۆکردەوەو گوایا بەرەی نیشتمانیان پێ دروست‌بکەن‌و لە ئیستگەکان‌و تەلەفزیون بە خەلقیانیان نیشان‌ئەدا کە چۆن دژی عێراق هەموو یەکیان گرتووە ، پاشان لە ، دۆڵە رەق «و» «مالوومە»و «ماوەت»و قەراغ‌و شوێنەکانی تری سەر سنوور بەیەکتریان بەکوشت ئەدان . ئەگەر ئەوان دژی رژێمی بەغدان وەك سەرەك کۆمار ئەلێ بۆچ یەك‌ناگرن‌و لەجیاتی یەکگرتن یەکتری سەر ئەبڕن ؟ وەڵامی ئەم پرسیارە لە ووتەکەی سەرەك کۆمار زوڕ ئاشکرایە . هەرووەها گشتی ناوەرۆکی ئەم نووسینەمان خوی وەڵامی پرسیارەکەیە .

بەهەر حاڵ گوڕەپانی نیشتمان پەروەری‌و نەتەوایەتی پیشکەوتنخواز ئەوەندە پان‌و بەرینە جێگای هەموو خەبات کەرێك‌و نیشتمان پەروەرێکی لەسەر ئەبێتەوەو گۆڕەپانێکی دڵ‌فراوان‌و لێ‌بوردووە ، هێشتان ماوە زوڕ ماوە بۆ هەموو ئەو کەسانەی فریویان خواردووە ، یان بەهوی هەر وەزع‌و زروفێکی نالەبارو هەڵماوی تەپو تۆزەوە بەهەڵە چوون ، یان تووشی دوو دڵی‌و راڕای بوون ، بیرێ لە خۆیان‌و گەل‌و نیشتمانەکەیان بکەنەوەو ، لەمە زیاتر ماوە بە ئیمپریالیزم‌و نوکەرانی نەدرێ بیانکەن بە دار دەستیان‌و هەموو شەڕی لاوەکی‌یەوە خەریك بکەن‌و دوژمنی سەرەکی‌مان لەبیربچێتەوە کە ئەویش ئیمپریالیزم‌و زایونیزمە .

# بۆ برای جەنگاوەرم - دلێر

**برای شیرینم :**

دوێنێ – یەك شەمە ١٩٨٢/٢/١٤ – نامە رەنگینەکەت پشکۆی ئاوات‌و هیوای دڵمی زیاتر گەشاندەوە . . پتر بۆنی خۆشی بەو ناوەوە پرژاند . . بەراستی نامەی ئەم جارەت تام‌و چێژێکی تایبەتی هەڵگرتبوو . . چمکی وەك ئەم چێژە لە جیهان‌دا زۆر کەم بەر بۆن دەکەوێ . .

بەڵێ . . لە لایەکەوە سینەی ئاسنینت لە شوێنە هەرەپێشەوەکانی بسێتین‌دا بکەیتە قەڵایێکی پۆڵایی ، گوللەو تۆپ‌و چەکی سەردەم نەیلەقێنێ . . لە لایەکی دیکەشەوە ، بریندار بوویت‌و سوور بوویت لەسەر وەرنەگرتنی ئیجازەکەت‌و مانەوەت لەوێ‌دا بۆ ئەوەی لەگەڵ برا قارەمانەکانتەوە لە گۆرەپانی بسێتین‌دا دەست بە هەڵپەرکێی سەرکەوتن بکەیت .

برا گیان :

بریندار‌بوونت خەڵاتێك بوو سەری وولات‌و ئێمەت پێ بەرزکردەوە . . ئەو هەست‌و نەستە ناسك‌و بە جۆشە منی بردە جیهانێکی پڕ لە ئەندێشەوە . . کە هۆشم بوو/وە ، سووپاسی یەزدان‌و سوپاسی دایك‌و باوکم کرد کەوا برایێکی وەهایان پێ بەخشیووم .

بەڵێ . . نازانم شەیتانی سەردەم‌و ریش‌بزن چۆن زیاتر ریس دەپەشتێتەوەو گوایە نیازی کشتتری هەیە . . ! ! خۆ زۆر لەمن باشتر دەزانێ ئەو خەیاڵەی لە مەیخانەکانی دەرەوەو تاران‌دا پێ‌ی گەوج بووە خاو بووەوە . . ئیتر ئەبێ وازبهێنێ لە فیکرەی داگیرکردنی بستە خاکێکی شێران . . . بەڵام دۆستی زووحاك :

قابیل ئارەقەی نێوچاوانی بۆ پەروەردەکردنی رۆڵەکانی رشتووە ؟ ؟ . . چ باکی هەیە ! !

بەڵام وا دیار دەکەوێ رای لە مەزەی مەی مەیخانەکانی دەرەوە نەبووە . . (گۆشتی بەرازە) . . حەزی چووەتە خوێن‌و مێشکی ئەو کوڕپەو دایك‌و باوك‌و گەنج‌و پیرانەی کە بە دەیەها بەڵکو بە سەدەها لەهەر رۆژێکدا لەسەریان دەدات . . بۆ ئەوەی تێر عەرەق (خوێن) بە مەزەی (مێشك) . فڕ بکات ! ! . . بەتایبەتی چونکە زۆر باش دەزانێ گەردەلوولی لەناوبردنی زۆر زۆر نزیك بووەتەوە . . دەزانێ دەست‌و پێوەندیشی فریای ئەوە ناکەون ئێسقانی بشارنەوە .

گیانەکەم :

لە کۆتایی نامەکەم‌دا دەمەوێ پیرۆزبایت لێ بکەم کەوا منیش چوومە ریزی جەنگاوەران‌و (تطوع)م کرد . .

ئیتر سەرکەوتنتان

خوشکت

مێرفەت

٨٢/٢/١٥

# هەڵسەنگاندن و ڕەخنە لە کتێبی کێشەیەک لە ڕێزمانی کوردی

نووسینی: عبدالستار کاظم
گۆڕینی: بیمار

لەم دیوایەدا لە دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردیەوە کتێبێکی کاک ڕەئووف ئەحمەد تاڵانی بەناوی (کێشەیەک لە ڕێزمانی کوردی) دەرچوو . کتێبەکە جگە لە پێشەکییەک بە سێ بەش بەش کراوە . بەشی یەکەمی بۆ هەڵسەنگاندنی ئەو نووسینانە تەرخان کردووە کە باسی مۆرفیمی (ەوە)یان کردووە و بەراوردێکی لەنێوانیاندا کردووە . بەشی دووەمیشی بۆ ڕای تایبەتی خۆی دەربارەی ئەم باسەو باسی سێیەمیشی بۆ خەسی فەرمانی ئەم مۆرفیمە تەرخان کردووە . ... لێرە پێشەکی و بەشی یەکەم :

أ - پێشەکی یەکە :

دانەر پشکنین و ڕێبۆچوونی خۆی دەربارەی مۆرفیمی (ەوە / وە / ڤە) دەخاتە ڕوو و دەگاتە ئەنجامێك کە دەبێ بەپێی پرۆگرام و بابەتیانەو ئەکادیمیانە لەم باسە بکۆڵرێتەوە بۆ ئەوەی کێشەکە بنەبڕ بکرێت و ئەنجامێکی روون و رەوان دەستگیر بکرێت ، کەوا پوختەی قسەکانی لەمەدا دەردەکەوێ کە دەڵێ :

« ئەو سنوورە ناشکێنم و بڵێم ئەوەی لەبارەی ئەو مۆرفیمانەوە گوتراوە سەرجەم ناهەموارە ، یان زوربەیان زانستانەن یان ئەوەی من بۆی دەچم بنەبڕە ، ئەم حوکمە دەدرێتە دەست دادگای زمانەوانی . »

پاشان دەڵێ :

« بەش بە حاڵی خۆم پتر لە سەد لاپەڕەیەکی سەر بە ئەو مۆرفیمەم – لەم گوتارو لەو گوتاردا – کەوتە بەرچاو ، ئەمەش بێجگە لە چەند نووسینێکی لەوەوبەر ، کە بە کورت بڕییەکەوە یان لە میانی ئەم باس و ئەو لاباسدا هەمای بۆکراوە . . . هەموویان بەیەکداچوون .

هۆی ئەو ئاڵۆزکانەش دەگەڕێتەوە بۆ ڕەچاونەکردنی ڕێگای پشکنین و بەراوردکاری» .

منیش لەگەڵ ئەودام کە ئەم بابەتە پڕیەتی لە ڕای تێك چڕژاوی وەها کە خوێندەوار بەتایبەتی تازە دەستپێکردوو لەوانەیە بکەوێتە گێژاوێکی بێ سەروشوێنەوە .

ب – دوای پێشەکی یەکە دەست دەکا بە خستنەڕووی هەموو ئەو نووسینانەی لەم بابەتەوە نووسراون و بەمە کۆتایی دێنێ کە دەڵێ :

« تێکڕا هەموو کارێك لایەنی هەموارو ناهەمواری بەباڵای خۆی بڕیوە ، گومانم نیە کە بڕێ لەو زمانەوانە بەڕێزانە بێتو بهاتایە ماوەیەك خۆیان بۆ ئەو مەسەلەیە تەرخان بکردایەو بۆی بڕەنجانایە ، بەرهەمێکی پوختتریان بەدی دەهێنا . لایەنی دەستوور شێوان و چەندان موزاعەفات لەسایەی نووسینەکانی سەر بە ئەو مۆرفیمانەوە ، جەدەلێکی نەپساوەی سازدا . ئەمەش تاوی دام کە ڕێگەی پشکنین و بەراورد بگرمە بەر» .

ج پاش ئەو نمایشە خێرایە دێتە سەر هەڵسەنگاندنی ئەوەی لەبابەت مۆرفیمی (دووبارە)و (بەردەوامی) نووسراوە بۆیە کە دێتە سەر نووسینەکانی د . نەسرین فەخری بەرپەرچی ڕایەکانی دەداتەوە ، منیش هاو ڕای دانەرم بەتایبەتی کە باسی پیتە بزوێنەکان دەکات و لە بوارێکدا کە دوو پیتی بزوێن بەیەك دەگەن : یان یەکێکیان فڕێ دەدرێت ئەگەر هاتوو مانا نەگۆڕرێت ، یان دابڕێك دەبێ بخرێتە نێوانیانەوە تا لێکیان جیا بکاتەوە ، زمانیش خۆی ئەو جۆرە دابڕە هەڵدەبژێرێت .

بەلام لە بڕگە (٢)ی ل ١٩ دا لەگەڵ دانەر نیم کە دەڵێ :

( شاری + ان . بە هەڵچەرخانەوەی بزوێنی «ی» بە زەبری «١» بۆ

دەنگدار و ڕای کردنی دەنگی «ر» بە نیمچە ژێر (i))

چونکە ئەوەی لەیاد چووە کە (ی) لە ووشەی (شاری)دا بۆ نیسبەتەو کۆنسەنەنتە . وە نەبێ بزوێن بێ تا بێ بە بێدەنگ ، خۆ ئەگەر بزوێن بوایە دەبوو یەك لەو دوو بزوێنەمان لابردبایە بە پێی ئەو بنەوانەی خۆی دایناوەو منیش پێشتر پەسندم کرد ، ئیدی بۆچی لێرە لە ڕایەکەی خۆی هەڵدەگەڕێتەوە ؟

کەسرە (ژێر) لە بنەڕەتەوە هەیەو بووە بە دابڕێك لە نێوان دەنگی (ر) دەنگی (ی) بۆیە کە ئەلفی (ان) بە (ی) گەیشتووە بڕگەیەکی سەربەخۆی پێك‌هێناوەو (ر) لەگەڵ ژێرەکەدا ئەویش بڕگەیەکی تری دروست کردووەو چ زۆر لەخۆکردنێك لە ئارادا نییەو کار بە ڕەوانی ی سروشتکرد بەڕێوە دەچێت ، ئەم مەسەلەیەش بۆ جارێکی دی لێ‌دەگەڕێم دێمەوە سەری .

پاشان ڕای مامۆستا شێخ محەممەدی خاڵ دەخاتە ڕوو و زانستانە بەرپەرچی دەداتەوەو تا ڕادەیەکی زۆر ڕاستی تێدایە . ئنجا بەتەواوی ڕای عەمید ئەحمەد حەسەن هەڵدەوەشێنێتەوەو بە هەڵەی دەردێنێ کە منیش لاریم لێ نی‌یە . هەروەها دێتە سەر پووچەڵ‌کردنی ڕایەکانی دکتۆرە پاکیزە ڕەفیق حیلمی‌و کۆمەڵێ پرسیار دەخاتە بەر دەم کە لە پرسیارەکانیدا خاوەن مافە . پاشان لە ڕایەکانی مامۆستا مەسعوود محەممەد دەکۆڵێتەوە و هەندێکیان بۆ ئەو باسە لێ‌دەگەڕێ کە بەتایبەتی بۆ ئەم بابەتەی نووسیوە .

ئنجا دێتە سەر ڕای مامۆستا نوری عەلی ئەمین‌و هەرچەندە پەسندی ناکات بەڵام بەپێی پرۆگرامی نوێ لێی ناتۆژێتەوەو بەرابەری ئەم مەیدانەی دەزانێ چونکە بەر لە خەڵکی دی لەم مەیدانەدا کاری کردووە . کە دێتە سەر لێکۆڵینەوەی ڕای مامۆستا محمدامین هەورامانی بەرپەرچی دەداتەوە بەڵام نرخ بەوەش دەدا کە ئەو یەکەم کەسێکە باسی (ەوانی)ی کردووە ، پاشان بەخێرایی بە ڕایەکانی دکتور عەبدوڕڕەحمانی حاجی مارف‌دا تێپەڕ دەبێت‌و دەگاتە سەر ڕایەکانی دکتور جەمال نەبەزو ئەوەپیشان دەدات کە دکتور نەبەز خۆی بە لێکۆڵینەوە ماندوو نەکردووەو شتێکی نوێی نەهێناوەو بەتوندی ئەو ڕایەی دەداتە دواوە کە دەیەوێ پیتی (ڤ) لە شوێنی پیتی (و) بەکاربهێندرێ .

پاش ئەم وتووێژانە باسێکی نوێ دەست پێ دەکات بەناوی (هەڵسەنگاندنی چەند نووسینێك لەبارەی نیشانەی کاری ڕابوردووی نزیکەوە) لەم ڕووەوە لە ڕاکانی لیژنەی زمانی کوردی‌و زانستەکانی کۆڕی زانیاری کوردی دەکۆڵێتەوەو لەڕاستیدا ئەم ڕایانە دژ بە یەکن‌و ناتوانن بەرامبەر بە پرسیارەکانی ئالانی بەپێوە بووەستن .

پاشان چەند ڕەخنەیەك لە کتێبی (زمان و ئەدەبی کوردی) پۆلی شەشەمی ئامادەیی ساڵی ١٩٧٦ دەگرێت بەڵام ڕای تایبەتی خوێشی بەیان ناکات بەڵکو ئەمەش بۆ لێکۆڵینەوە تایبەتی‌یەکەی خۆی هەڵدەگرێ ، ئەمجارە دێتە سەر لێدوانی کتێبی زمان‌و ئەدەبی کوردی‌ی پۆلی یەکەمی ناوەندی لێرەدا ڕای خۆی دەدرکێنێ لاموایێ بەهەڵەدا چووە کە دەڵێ :

«ڕێ‌دەکەوێ لە کرکە دیفتۆنگ بێتە کایەوە ئەویش ئاراستە بزوێنێکە بۆ ڕاکێشانی یەك دەنگ بە کارتێ‌کرانێکی تایبەتی ، ئەو بزوێنە لە نێوان دوو بزوێندا پەیدا دەبێ‌و حیسابی کۆمەڵە بزوێنی بۆ ناکرێ ، بە لێدانەوەیەکی زانستی نەك ڕواڵەتی . .»

بەڵام من وای دەبینم :

أ – دیفتونگ مانای تێکەڵ‌کردنی دوو دەنگی بزوێنە لە زمانانی ڕۆژاوادا . . بەجۆرێك کە هەردووکیان لە شێوەی یەك دەنگدا دیاربن هەروەکو لە ووشەی (Vois) دا ، بەڵام لە زمانی ئێمەدا ئەوەی ڕوویداوە تێکەڵبوونی دوو دەنگە یەکێکیان بزوێن‌و ئەوی تریان کۆنسەنەنت هەردووکیشیان دەنگێکی بزوێنی تازە پەیدا دەکەن ، لەوانەشە لە دوو دەنگ زیاتر تێکەڵ بەیەك دەبن ، بە نموونە دووی کونسەنەنت‌و یەکێکی بزوێن یان بەپێچەوانەوە دووی کونسەنەنت‌و یەکێکی بزوێنیان دەکەوێتە نێوان چاکترین نموونەش دەنگی (ۆ) ، (ێ) یە کە یەکەمیان بریتی‌یە لە تێکەڵبوونی دوو دەنگی (ە + و) و دووەمیان (ە + ی) پێکهاتووە ، نموونەش بۆ تێکەڵبوونی سێ دەنگ (بۆر + و + ی) لە ووشەی دویر دا Duwir سەرباری کەمێ سووك‌کردنی دەنگی کۆنسەنەنتیش هیچ نیشانەیەکیشمان بۆ ئەم جۆرە دەنگانە نی‌یە .

٢ – بوونی دوو دەنگی بزوێن لە نێوان دوو دەنگی کۆنسەنەنتدا لە تواناداا نی‌یە ، چونکە هەرگیز دوو دەنگی بزوێن بەیەکەوە کۆنابنەوە چ جای سێ دەنگی بزوێن بە یەکجار ؟

ئیتر پاش ئەوەی ڕایەکانی جگەر خوێن دەداتە دواوە باسەکە بەم قسەیە دواپێ‌دەهێنێ کەوا : ئەوەی لەم بابەتەوە نووسراوە بەردار نەبووەو ئالۆزی‌یەکانی زمانی ڕوون نەکردوەتەوە . شایانی باسە ئەم بەشەی نزیکەی ٧٤ لاپەرەی گرتوەتەوە .

**دووەم :**

بەرلەوەی بەشی دووەم بخەمە ڕوو و هەڵیسەنگێنم کە باسی مۆرفیمی (ەوە/وە) یە دەمەوێ ئەو بناغانە دەست‌نیشان بکەم کە هەڵسەنگاندنەکەمی لەسەر دروست دەکەم بۆ ئەوەی لە لایەنگیری‌و هەواخوازی بەدوور بم .

١ – فۆنیم :

أ – فۆنیم – کە بچووکترین یەکەیەکی دەنگی وەهایە کە لە هیچ بارێکدا کەرت‌بوون هەڵناگرێ ، بەڵام ئەگەر فۆنیمێك بە فۆنیمێکی تر

گۆردرا یان شوێنی لە ووشەدا گۆڕی ماناکەشی دەگۆڕێت .

ب – زۆرجار فۆنیم لەگەڵ یەکتریدا شوێن ئاڵوگۆڕ دەکەن بەلام لە یەك دایلێکت نا بەڵکو لە نێوان چەند دایلێکتێکی زمانێکدا بەنموونە دەنگی (و) دەچێتە شوێن دەنگی (ب) یان (م) یان (ف)و . . هی تر بەبێ ئەوەی ماناش بگۆڕێت :

باران – زمانی ئەدەبی – (واران ، وورو – لە شێوە زمانی فەیلی ، لوری) .

تەمام – زمانی عەرەبی – (تەواو) لە زمانی ئەدەبیو فەیلی ، لوری

کەفت – شێوەزمانی فەیلی (کەوت – لە زمانی ئەدەبیو زوربەی شێوە زمانەکانی دی) .

جـ – فۆنیم دوو جۆرە :

أ – فۆنیمی دەنگدار (حرکە) ئەمەش دکتور عبد الرحمن حاجی مارف گوتەنی . بە بێ گرێ لە دەزگای قسەکردنەوە دێتە دەرێ ، من زیاتریش دەڵێم لە پێشەوەی برگە یان ووشەدا نایەت .

٢ – فۆنیمی بێدەنگ : (کۆنسەنەنت ، ئەسڵی) ئەمیش وەکو ناوبراو دەڵێ : بە ئەرك لە دەزگای قسەکردنەوە دێتە دەرێ ، منیش دووبارە دەڵێم لەپێشەوەی برگە یان ووشەوە دێت .

٣ – فۆنیمی بزوێن دوای بێدەنگ دەکەوێتو بەتەنیا نایەت ، بەڵکو بە دەنگە کۆنسەنەنتەکانەوە دەلکێو سەر بە هینەکەی پێش خۆیەتی نەك دواوەی . . بۆ ئەم جۆرەش کاکی برا «ئالانی»یش دەستی کێشاوە .

٢ – یاسای گونجانو نەگونجانی مۆرفیمان (قانون التنافر والتوافق بين المورفيمات) .

لە ئەنجامی ووردبوونەوە لە دەنگەکانی زمانی کوردیماندا ئەمەی خوارەوەم بۆ دەرکەوتووە :

أ – هەموو بزوێنەکان لەگەڵ یەکتردا ناگونجێن ، چونکە ناتوانرێ دوو دەنگی بزوێن بەیەکەوە کۆ بکرێتەوە ، جا ئەگەر ئەمە روویدا ئەوا دەبێ بێ هێزترەکەیان کە زیان بە مانا ناگەیەنێت لابرێت ، ئەگەر نا دەبێ دابڕێکە نێوان کەریان لەدا دابمرێت ، ئەم دابڕەش دەنگە کۆنسەنەنتێکە زمان خۆی بە پێی لێوەشانەوەی ئەندازەو بیناسازیی ووشە ئەم دابڕە هەڵدەبژێرێت .

ب – هەموو بزوێنەکان لەگەڵ کۆنسەنەنتەکاندا اەونجێن ، بە پێچەوانەشەوە هەر راستە .

جـ – کۆنسەنەنتەکان هەندێکیان لەگەڵ یەکتریدا دەگونجێنو هەندێکیشیان هەڵناکەن ، بە مانایەکی تر ئەگەر دوو دەنگ رێك‌کەوتن پێویستیان بە بزوێنێك نییە یارمەتی دەنگی یەکەم بدات تا بپەڕێتەوە بۆ لای دووەم ، بەلام ئەگەر رێك نەکەوتن ئەمە مانای وایە دەبێ بزوێنێك هەبێت یارمەتی یەکەم بدات بۆ ئەوەی بپەڕێتەوە بۆ دووەم .

د – هەڵگەڕاوەی دوو دەنگی گونجاز نەگونجاو دەبێت ، بەنموونە لە ووشەی دەشتدا دەبینین (ش ـ ت) گونجاون بەلام ئەگەر شوێنەکانیان هەڵگێڕانەوەو گوتمان (دەتش) ئەوسا پێویستمان بە نێوامێك دەبێ . نێوانەکەش لێرەدا دەنگێکی بزوێنە ، کەوەتانێ دەنەی (تێ) یاذمەتی گوێزانەوە دەدات بۆ لای شیم ، ئنجا ئەم نیوانە (ە ، ژێر ، یان بۆر یام ئەلیف بێتو هی تر بێت ، زمانیش خوی بزوێنێکی شیاوی جێگاکە هەڵدەبژێرێت .

هـ – دەنگە بێدەنگەکان ئەگەر لەیەك رەگەزبن یان ئەگەر لە مەخرەجدا لەیەکتر نزیك بن ئەوا ناکۆك دەبن ، وەکو ت ، ت ، ت ، د . .

وَ – ئەو دوو دەنگە (و = W ، ی = y) لەگەڵ هەموو دەنگەکاندا دەگونجێن بە مەرجێك ئەگەر لەپێشەوە بێن ، بەلام ئەگەر لە دوای کۆنسەنەنتانەوە هاتن ئەوا ناکۆك دەبن .

ز – دەنگی و : W لەگەڵ دەنگی ی : y دا ناکۆکن ئەگەر واو پێش یێ‌یەکە کەوت بەلام ئەگەر بەپێچەوانەوە یێ‌یەکە پاش واوەکە کەوت ئەوا رێك دەکەون .

**تێبینی** : یاسای گونجانو نەگونجان یان کۆکیو ناکۆکی نەکەوتووەتە بەر بایەخی هیچ کەسێك لە نووسەران ، بەداخەوە ، ئەگەر سەرنجیان بدابایە کاری ئەم یاسایە بەسەر ئەندازەی ووشەو بیناسازییەکەیدا

هەروەها ئەندازەیی رستەو سەرجەم دارشتە زمانییەکان زۆر بیروڕای خۆیان دەگۆڕیو نەدەکەوتنە ناو ئەو ناکۆکییە کەڵەکەبووانە لە رێگای دەرهێنانی دەستووری زمانی کوردیدا . . هیوادارم توانیبێتم کەمێك ئەوەی مەبەستمە روونی بکەمەوە .

٣ – کاری هەبوون (الوجود) و بوون (الكينونة) verb to be و دەخلیان بەسەر کاتی جۆراوجۆری زمانەکەمانەوەو دەخلیان بەسەر زۆربەی شێوە زمانەکانەوە ، شیکردنەوەی ئەم بابەتەش بۆ وەختی خۆی هەڵدەگرم کاتێك کە باسی هەردوو شێوە زمانی لوری/لەکی – فەیلی دەکەم .

بەلام سەرنجێکی سەرپێیانەم ئەوەیە کە نووسەران ئەم باسەیان پشت‌گوێ خستووە یاخۆ ئەوەندە بەگرنگیان وەرنەگرتووە بۆیە بووەتە هۆی سەرلێ‌شێوانو بە هەڵەچوونی هەندێکیان .

٤ – فۆنیمە بزوێنەکان و ژمارەیان لە زمانی ئێمەدا :

هەندێ نووسەر زۆر جار دەڵێن – وەنەبێ نووسەرێکی تایبەتیم مەبەس بێ – ژمارەی بزوێنەکان لای ئێمە هەشتە ، هەندێکیان زیادو هەندێکیشیان کەمی دەکەن بەبێ ئەوەی پاڵ بە لێکۆڵینەوەیەکی

زانستانەوە بدەن بەبێ ئاگاش لە یاساکەی سروشتی – گونجانو نەگونجان – بۆیە وایان لێدێ تەنانەت لەو دەستوورانەش دەردەچن کە خۆیان چەسپاندوویانەو کە زانستەکانی زمان پەسندیان دەکەن . لە دواییشدا باری ڕێنووسی کوردی ئاڵۆزتر دەکەن .

ئنجا دوای بەراووردی زمانو بەکارهێنانی یاسای گونجانو نەگونجانو بەراووردپێکردنی چەند شێوە زمانێکی کوردی بۆم دەرکەوت کەوا زمانەکەمان : –

أ – شەش بزوێن (ڤاول)ی ڕەسەنی هەیە کە سێ کۆمەڵن :

(سەر ، ژێر ، بۆر) سەریش دوو دەنگداری هەیە یەکەمیان دەنگی (e=0) کە سەری کورتەو دووەمیان دەنگی (a=I) کە سەری درێژە .
ژێری کورتیش کە دەنگی (i)یەو ، ناوەندی کە (ی = اٌ)یەو ، ئنجا دەنگی بۆری کورت )و = (u و دەنگی بۆری ناوەندی (وَ = (u .

ب – شەش دەنگی تێکەڵ (مزجی) کە ئەمانەن :

١ – بۆری درێژ : ئەگەر هاتوو لەپێشەوەی ووشەیان برگەوە هات ئەوە تێکەڵە لە (و=کۆنسەنەنت = (W) + و = بۆری کورت : u وەکو ووشە wuşe ، وولات Wulat خۆ ئەگەر لە دواوەی ووشە یان برگەوە هات ئەوە تێکەڵە لە : بۆرێکی کورت (u) + و (W کۆنسەنەنت) وەکو :

پاروو = Paruw

پارووکە = Paru – Weke

بۆیە سەیر دەکەین کە کۆنسەنەنتێکی نوێی پێدەگات دەبێ بە دوو کەرتەکەی کە ئەمەش بەڵگەی ئەوەیە فۆنیم نیەو مۆرفیمە .

٢ – ژێری درێژ : سەروکاری ئەمەش وەکو بۆری درێژوایە ، جا ئەگەر لەپێشەوەی ووشە یان کەرتێك بوو ئەوسا ئاوێتەیە لە (ی) ی کۆنسەنەنت لەگەڵ ژێرێکی کورت (i) وەکو :

پاییز Payiz

بەڵام ئەگەر لە دواوەی ووشەکە یان برگەکەوە هاتبوو ئەوا ئاوێتەیە لە ژێرو (ی)ی کۆنسەنەنت (i+y) وەکو :

شاری + ان = شاریان = şariyan

٣ – ئەو واوەی کراوە بە (ۆ) ئەمەش یان :

أ – لە سەرێکی کورت + واوی کۆنسەنەنت (e+w)

پێك دێ ، واش باوە کە لە دواوەی ووشە یان برگەوە بێت ، کە بەدیمەن دووانە دیارەو لەراستیشدا سێیانەیە ، یان کەوتوەتە نێوان برگەیەکی سێیانەی ئەوتۆ کە لەراستیدا چوارینەیە . بۆیە لە حاڵەتی یەکەمدا دەبینین بە دوو دەنگ لەت بووە کە دووەمیان کۆنسەنەنتە .

هەروەکو لە (جۆ) دا :

جۆ = جۆ +ەکە = جۆ وە کە

ئەم ووشەیەش لە بنەڕەتدا لە (لوڕی) جەوە هەروەکو (بەو = وەرە) کە لە هەورامی بووەتە (بۆ) .

ب – یان لە بزوێنێکەوە وەرگەڕاوە وەکو (و = u) ئەمەش تەنیا لە ناوەڕاستدا دەبێت وەکو :

ڕوژ (لوڕ) = ڕۆژ (سۆرانی) .

٤ – ئەو (ی)یەی کراوە بە (ێ) :

ئەمەش یان لە سەرێکی کورت + (ی)ی کۆنسەنەنت (e+y) پێکهاتووە ، ئەویش لە دواوە یان لە ناوەڕاستی برگەوە دێت وەکو واوی پەل لەگەڵ ئەو شتانەی پێیەوە دەلکێت هەڵسوکەوت دەکات . یان لە بنەڕەتی مێژوویی‌یەوە لە بزوێنێك لەگەڵ بزوێنێکی تری قرتێنراوەوە وەرگەڕاوە وەکو :

ڕاهـ = ڕێهـ = ڕێ

ئەمەش بۆ کەرتەکانی خۆی خورد دەبێتەوە ئەگەر تووشی دەنگێکی تر بوو . دەبێ ئەوەش بزانرێ کە ئەو هێیە کۆنسەنەنتە لە شێوەی یەکی کۆنسەنەنت سەر هەڵدەداتەوە وەکو :

(ڕێیەکە . . . دێیەکە)

یان دەبێتە دیمەنی بزوێنێکی دی هەروەکو لە :

شیر (لوڕی) = شێر (سۆرانی)

٥ – واوی فیکەداری ژێر لەبن : (الواو الصفيرية المخفوضة)

ئەمەش ئاوێتەیە لە :

بۆرێکی کورت + واوێکی کونسەنەنت + (ی) یەکی بزوێن (u+w+e) وەکو :

دوێر ، سوێر ، ژوێ

٦ – واوی فیکەداری فەتحە لەسەر :

ئەمەش ئاوێتەیە لە :

بۆرێکی کورت + واوێکی کونسەنەنت + سەرێکی کورت + (ی)یەکی کۆنسەنەنت وەکو لە : دوێت Duweyt ، ئەم جۆرە دەنگەش لە دیالێکتی لوڕیو کرمانجیی ژووریدا زۆرە .

بە بیری من ئەم چوار دەنگە ئاوێتانەی لە ژمارە (٣ ، ٤ ، ٥ ، ٦) دا پیشان دراون نیمچە فونیمنو دەشتوانین بە فونیمی دەنگداریان دابنێین مادام کەوتوونەتە ناوەڕاستی برگە یان ووشەوەو ئاوێتەن بەڵام کە لە دواوەی ووشە یان برگەوە بێن کەرت بوونیان لە تواناندا هەیە . ئاڵۆزیو ڕوون‌نەکردنەوەی کێشەی ئەم مورفونیمانە کارێکی گەورەی لە ڕێنووسی کوردی کردووە ، کەوا هەندێ جار دەوری فونیمی بزوێن دەبینێو هەندێ جاریش دەوری مورفونیمی ئاوێتە . ئەمەش پێویستی بە چارەیەکی تەواو هەیە .

سێیەم

## بەشی دووەم/قۆناغی دووەم

ئەم بەشەش زۆربەی ڕاکانی دانەر دەربارەی بابەتەکە دەگرێتەوەو کردوویە بە ٧ بەندو چەند برگەیەکەوە ، لە بەندی یەکەمدا باسی لایەنی مۆرفیم دەکا لە شێوەزمانی شارباژێر – بابان‌دا ئەمەشی بەسەر چەند بەشدا دابەش کردووە :

بەشی یەکەم : باسی دابەش‌بوونی شێوەزمانە کوردی‌یەکان‌و ناوچەکانیان‌و چمکێك لە مێژوویان دەکات .

بەشی دووەمیشی ناوناوە « مۆرفیمی دووبارە لە ئاخاوتنی سلێمانی‌دا .

١ – دەربارەی مۆرفیم کە بەو تاکە ووشانەوە لکاوە کە بە کۆنسونەنت دواییان هاتووە ، چەند نموونەیەکی بە لکانی مورفیم بە کارو بە ووشەی لێکدراوو بە ناوو بە ئاوەڵناوو ئاوەڵکار هێناوەتەوە .

دوورو درێژ لەم بابەتەی کۆڵیوەتەوەو هەوڵی داوە بەڵگە ڕێژی ئەم بۆچوونە بکات کە گوایا شێوەی تەواوی مورفیم (ەوە) سەرباری لکانیشی بەکارو بە ئاوەڵناو ، بە ناویش‌و بە ئاوەڵکاریشەوە دەلکێ ، هەروەها پاشگرەو نیشانەیەك یان ئامرازێك نی‌یە ، دیارترین ئەرکەکانیشی خستنەڕووی ڕووداوی کارەکەیە .

لەم ماوەیەدا گەلێ ڕاو بۆچوون پێویستیان بە لێکۆڵینەوەو وتووێژ هەیە ، لەمانە دانانی (ت) لە ووشەی (بیتەوە) بە ئامرازی نێوبڕ هەروەها (ەوانێ) کەوا بە کارو بە بەرنافی دەست‌نیشان‌کردن‌و ئاوەڵکارو ئامرازەوە دەنووسێت‌و ناچێتە سەر «چاووگ» جگە لەمە زیادەیەو بۆ دووبارەکردنەوە نی‌یە وەکو (ەوە) . .

بەڵام من دەربارەی هەندێ لەو بۆچوونانەی لەگەڵیدا نیم بەتایبەتی :

أ – پاشگر (ەوە) نی‌یە بەڵکو (و) ی کونسەنەنتە بەتەنیا . ئەم (ە)ی کە لە پێشەوەی مۆرفیمەکە دێ کە بەو ووشانەوە دەلکێ کە بە کونسەنەنت دواییان هاتووە بریتی‌یە لە ئامرازی نێوبڕ بۆ ئەوەی نەگونجان لە نێوان واو و ئەو پیتە کۆنسەنەنتانەی کەوتوونەتە پێشییەوە روو نەدات ئەمەش بەپێی یاسای (گونجان‌و نەگونجان) . .

ب – ئەو بزوێنەش کە مۆرفیمەکە دوایی پێ‌هاتووە فەرمانێکی تایبەتی‌ی هەیە کە پاشان شی دەکەمەوە .

ج – بەیەك‌گەیشتنی ئەم مۆرفیمە بە ناوان وەکو بڵێی گوێزانەوەیە ، واتا ئاوەڵناوێکی گوێزراوەیە بۆ ناو . ئەم کردەوەیەش نەك هەر لە زمانەکەماندا بەڵکو لە زمانانی تریشدا هەیە کەوا دارشتەی کار دەبێ بە دارشتەی ناو بەنموونە ووشەی (ئەژی) کارە بۆ دارشتەی ناو گوێزراوەتەوە . هەر بەم جۆرە ماوەی گوێزانەوەی رستە یان نیمچە رستە یان ئاوەڵکار یان ئاوەڵناو هەیە بۆ دارشتەی ناو ، بەڵام شتێکی گرنگ لەگۆڕێ دایە کە دەبێ بزانرێ بنچینەکەی لە لکانی پاشگر بە ئاوەڵناوەوە ، پاشان گۆیزانەوەی بۆ دارشتەی ناوی پەیدا بووە .

ئەمەش ڕێ لەوە ناگرێ رەنجی دۆزینەوەی هەندێ پەناو حەشارگەی زمانەکەمان لە لایەن کاکی ئالانی‌یەوە بنرخێنین‌و بەشوێنی شانازی دابنێین .

د – دەربارەی ئاوەڵکارو ئەو نموونەیەی بۆی هێناوەتەوە لاریم لە دارشتەکەو لەوەدا نی‌یە کە ئەو پاشگرەی مانای دووبارە کردنەوە دەدات لەوانەیە بە ئاوەڵکارو بە حەرفە جەرەکان و شتی لەم بابەتانەوە بنووسێت بەڵام جیاوازیم لەگەڵ ئەودا ئەوەیە کە دەڵێ ووشەی (دیسان)و ئەو زنجیرەیەی لێ‌یەوە هەڵ‌دەبێت لە بنەرەتدا لە ووشەی (دێس)ی فارسی پەهلەوی‌یەوە هاتووە .

مامۆستا ئالانی خوی لە زۆر شوێندا ووشەی (دی) و (دیکەی)ی بەکارهێناوە ، ئەم بەکارهێنانەش هەر بۆ خاتری دووبارە بوونەوە بووەو هیچی ترنا (دەبڕوانە دیڕگەلی ٦ ، ٨، ٢٠ ی لاپەرە ٩٧) بەڵام (دی) لە فارسیدا بەمانای (دوێنێ ، نێوی مانگێك)هاتووە هەروەها (دیس)یش مانای – شێوە رەنگ ، هاوچەشن ، رەش . . . هتد دەگەیەنێ . : لەمەوە دەروانین مانای دی‌و دیس لە فارسی‌و لە کوردیدا زۆر لەیەك جیاوازە .

لەوانەیە یەکێك بپرسێ ئەی (سان)ەکە مانای چی‌یە ؟ . . منیش دەڵێم وابزانم (سان)ەکە لە مانای (جار ، بار) جودا نی‌یەو لەوانەشە رەگی بۆ مێژوویەکی دوور بگەرێتەوە کاتێك کە ئادەمیزاد کەلوپەلەکانی لەشتی بەرچاوی وەکو بەرد بوون ، شایانی باسیشە «سان» مانای بەردە .

هەرچی (کە) و (ەکە) یە کە بەم ئاوەڵکارەوە دەلکێ‌و دانەر بە پێناسینی دادەنێ ، نازانم چی دەناسێنێ ؟ چونکە جگە لەوە کە بە زۆرکاری لەم شوێنە پەستێنراوە هیچ کارێکی پێناسینی نی‌یە بەڵکو مانای دووبارەکردنەوە زیاتردەدا لە مانای ناسین ، هەروەکو (کە) لە ووشەی دیکە ، جارێکی کە دا ، کەوا (کە) لە دیکەو لەهی تریش‌دا (ە)ی پێوە نی‌یە چونکە (ی) لە جێگەی ئەودا بۆ پارێزگاری هاتووە ، هەر بەم جۆرە دەگوترێ (دیسانەکە) یان (دیسانی‌کە) کە لێرەدا بۆ دووپات‌کردنەوەی دووبارەیی‌یە .

ه – که دەڵێ (ت)ی بیتەوە نێوبڕە پەلەکردنەو لەسەر بناغەیەکی زانستانە لەکاری هەبوونو بوون (وجود) و (کینونە)ی نەکۆڵیوەتەوە کە بەپێی زارو شێوە زمانەکان شێوەی جیاواز وردەگرن ، لەمەولا ئێمە باسی دەکەین .

و – کە لە پەراوێزی (٥٤)دا دەڵێ (ت)ی دەچێت ، دەکات . . . هتد بەشێك نی‌یە لە بەرناڤی کەسی سێ‌یەمی تاك رام لە قسەکەی نی‌یە ، چونکە ئەم جۆرە دارشتنە بە شێوەزمانێکی کوردی‌یەوە تایبەتەو لە شوێنی خۆیدا باسی دەکەم .

ز – هەرچی (ەوانی)یە ئەوا لەگەڵ ئەوەشدا کە کاك ئالانی کارێکی گەورەی کردووە بەڵام هێشتا پێویستی بە لێکۆڵینەوەیەکی زۆرترە .

٢ – دەربارەی لکانی مورفیم بەو تاکانەی کە بە دەنگی بزوێن کۆتاییان دێت ، چەند نموونەیەکیان لە بابەتی لکانی بە (١ ، ە ، ی ، و ، ۆ ، ێ)ەوە بۆ دێنێتەوەو بەر لەوەی دوورودرێژ نموونەکان شی‌بکاتەوە لە ژێر سەرناوی (پێشەتایەك‌و شی‌کردنەوە)دا دەڵێ :

أ – بزوێنی «١٠٠، ە ، یێ ، ۆ» تواناییان نیە کە لەگەڵ بزوێنی دیکەدا ، بینەوە بە دەنگدار .

ب – بزوێنی «وو – ٹ»ی ، درێژو «ی ، ي = ا» ی فرە ي =ژ»یفرە داکشاو ، لە باری تیژیدا بە بزوێنی دیکە ناجوولێن‌و نابنەوە بە دەنگدار ، لە کاتێکدا جوولێنران ، لە دۆخی «و ، ی»ی کورتدا دەبنەوە بە دەنگدارو بە هەمان بنکەی پێشوو .

ئەمە باوەڕی خۆمەو لە ئەنجامی بەراوردەوە لێی دڵنیابووم .

بەر لە هەموو شتێك ئەگەر ئەم گۆتنە هەڵەی چاپی تی‌نەکەوتبێ ئەوا ناکۆکی‌یەکی تێدا هەست پێ دەکەم وەکو ئەوە کە لە برگەی (أ) بڕیاری دا کە بزوێنە کورتەکان – واش‌دیارە (و ، ی)ی لێ دابڕیون) ناتوانن لەگەڵ بزوێنێکی تر ببن بە کونسەنەنت پاشان لە برگەی (ب)دا بڕیار دەدا کە دوو بزوێن لەبەر تیژی‌و درێژیان بزوێن ناتوانێ بیان‌جوولێنێ یان وەکو خوی دەڵێ بە بزوێن نابزوون ، جارێکی دی دێتەوە سەر ئەوە ئەگەر بجوولێنرێنەوە – تۆ بڵێی بە بزوێن نەبێ بەچی دەجوولێنرێن ؟ – لە حاڵەتی (و ، ی)ی کورتدا دەگۆڕێن بە دوو کونسەنەنت‌و ئنجا جاردەدا کە بڕوای بەمە هەیە ! ! نازانم چۆن بڕوای بەم ناکۆکی‌یە هێناوە ؟ کەی بووەو کەی دەبێ بە داری جادوو بزوێن ببن بە کونسەنەنت یان بە پێچەوانەوە ؟ ئەگەر لە زمانێکدا ئەمە رووی‌دا ئەوا فاتیحای بۆ بخوێنە .

پاش ئەمە دێتە سەر لێکۆڵینەوەی ڕایەکی مامۆستا توفیق وەهبی کە دەڵێ :

« واوی درێژ بەهۆی بزوێنە (ە)وە دەبێ بە دوو کەرتەوە ، بزوێنێکی کورت‌و کونسەنەنتی کورت وەکو پاروو = پارو وەکە . ئەگەر (ی) دوای (ی)ی بزوێن هات دەبێ بە بزوێنی ئەو وەکو : کۆیی ، پاییز . . . »

وەڵامی دەدادەتەوە :

واو ئەگەر بەیەك یان بەدوو واو یان بە هەر شێوەیەك بنووسرێت هەروەکو (٥ ، ١) یەك بزوێنە ، لەبەر ئەوەی کە ئەم دووانە پارچە ناکرێن ئەویش هەروەها پارچە ناکرێت – ئەمە راستەقینەیەکی چەسپاوە بێ‌گومان مامۆستا خۆی دەیزانێ ، بەڵام چۆن رێ بەخۆی دەدا کە گۆڕینەکە پەسند بکات مادام پارچە بوونەکە پەسند ناکات ؟

پاشان دەڵێ : ئەگەر گریمان بە لاتینیان نووسی ئەوا پارچە بوونەکە روونادات :

Parû = Paruweke – Pariweke

تۆ نابینی ئەم واوە درێژە چۆن لە لاتیندا کەرت بووە ؟ ئەمە مانای ئەوە نی‌یە کە بزوێن نی‌یە بەڵکو مۆرفیمێکە لە بۆر + و یان لە ژێر + واوی کونسەنەنت پێك هاتووە ؟ پاشان دەربارەی (ی)ی درێژ دەیەوێ بەرپەرچی ڕای مامۆستا توفیق وەهبی بداتەوە دەڵێ :

« ئەمەش شی‌کردنەوەیەکی بەرفراوانی دەوێ ، لە رووی دەربڕینەوە بگرین : (کۆیی) ، راستە . . کە (ی) دووەم ، بزوێنە بۆ یەکەمیان . بەڵام لەو نموونەدا «ی» کۆیی – لەپێشدا دەنگدار نەبووەو ئنجا بزوێنی بە دوادا هاتبێ ، بڕوام وایە کە لەبارەی ناوەکە (کۆ) یەو دوا پێوەلکانی (ی) نیسبەت ، دووو بزوێن لێکیان داوەو بە ي کۆنسونانت نێوبڕ کراون . »

منیش دەڵێم : بێ‌گومان مامۆستا توفیق وەهبی یەکێکە لە پێشڕەوانی دانانی رێزمانی کوردی‌و لەگەڵ ئەو ماوەیەشدا کە کەوتوەتە نێوان دانراوی ماموستا وەهبی‌و دانانی ئەم کتێبە هێشتا ڕایەکەی مامۆستا وەهبی راستییەکی زوری تێدایە .

کە مامۆستا ئالانی دەڵێ ووشەکە لە بنەڕەتدا (کۆ) یە نەوەکز (کۆی) بەڵگەی بەدەستەوەنیە کێ چووزانی لە (کۆە)ەوە نەهاتووەو بەهۆی گۆڕینە فولولوژی‌یەکانەوە هایەکەی بووە بە یا ، گۆڕینی (ها) بە (یا) یان راستتر بڵێین بوونی (ی) بە شێوەیەکی (ە) لە زمانی ئێمەدا زور باوە ، ئەوەتا ووشەی (دەهەم) دەبێتە (دەیەم) ، هەروەها بەپێچەوانەشەوە دەتوانی بڵێی‌ە (ە) شێوەکە (ی)یە .

کە دەڵێ (ی) کۆیی لە سەرەتا کونسەنەنت نەبووە ئەمە پێچەوانەی دەستوری فۆنیمە ، چونکە ئەەر کونسەنەنت نەبووایە بزوێن دەبوو ، ئەمەش مانای وایە کە بە بزوێنێکی دە دەگات ئەوسا پێویست بەذە دەکات یەکێکیان لاببرێت یان دابڕێك بکەوێتە نێوانیان ئەمەش رووی‌نەداوە بۆیە ساغی دەکاتەوە ئەگەر کونسەنەنت نەبوایە. نەدەما . . بەڵام کە لای وایە (ی)ی نیسبەت ئەویش بزوێنە بەهەڵەدا چووە

چونکە (ی)ی نیسبەت کونسەنەنتەو بە کونسەنەنتێك گەیشتووە ، بەلاّم لەبەر ئەوەی نەگونجاون لەگەلّ یەکدا بۆیە پێویستی بە نێوانێك کردووە ئەوەبوو (ژێ)ێك کەوتە نێوانیان کەوا کاك ئالانی هەستی پیّ نەکردووە . . کەوابیّ ووشەی کۆیی بە لاتینی وەها دەنووسرێت Koyiy چونکە دوابڕگە (یی)یە نەك (یی = iy . .

ئەوەی دەربارەی (ی)ی درێژی دوا ووشە یان دوا بڕگەکان گوترا ، هەمان شتیش دەربارەی (و)ی درێژە فۆنیم نی‌یە بەلّکو مۆرفیمێکە یان لە (و) یکی کونسەنەنت + بۆرێکی کورت) یان لە (بۆرێکی کورت + واوێکی کونسەنەنت) پێکهاتوو ، حالّەتی یەکەم لە سەرەتای ووشەو بڕگەکاندا دەلبنرێت وەکو (ووشك) دووەمیش وەکو (پاروو) ، بۆیە دەبینین لەت دەبێت بۆ : بۆرێکی کورت‌و کونسەنەنتێك . مادام ئێم (بۆر) بە شێوەی واو دەنووسین‌و واوی کونسەکەنتیش هەر بە شێوەی واو دەنووسین بۆیە چارنی‌یە دەبیّ ئەو واوەش کە درێژی پیّ دەلّێن یان (ی) درێژ بە دوو واو و بە دوو (ی) بنووسین هەتا گیروگرفتی رەمزەکانی رێنووسی کوردی دوا پیّ دەهێنریّ .

دوای ئەم پێشەکی و شیکردنەوەیە دانەر دێتە سەر شیکردنەوەی ئەو نموونانەی باسی کردوون دەربارەی لکانی مورفیم بەو تاکانەی کە بە بزوێن دواییان هاتووە ، لێرەشدا رایەکەی خوی دووپات دەکاتەوە :

لە سەرجەمی ئەو نموونانەدا ، مۆرفیمەکە پاشگرەو لە قالّبی (ەوە)دایەو دەست‌بەرداری بزوێنە بەرایی نەبووە . ئەوەش دەلّێمەوە کە لە ئەنجامی کێشەیەکی درێژخایەندا هەندیّ لە زمانەوانەکان‌و بە چەند قۆناغێك ، هێنایەکیان بۆ نێوبڕ کرد ، بەلاّم هۆی پەیدابوونی‌و جۆرەکەی‌و گونجان‌و باری دەنگسازی تێدا شی نەکرایەوە» .

کە دەلّیّ مۆرفیم (ەوە)یەو پاشگر نی‌یەو وازی دەست‌بەرداریّ بزوێنەر بەرایی نەبووە با وتووێژەکەو شیکردنەوەکانیشی پان‌وپۆڕ بێت بەلاّم هیچی تازەی بەدەستەوە نەداوە ، نە ئەویش‌و نە ئەوانی پێش ئەویش ووریای یاسای (گونجان‌و نەگونجان)ی دەنگەکان نەبوون بۆیە ئەوەی گوتوویانە هەر ئەوەیەو هیچی تر .

بەلاّم کە پاشگرێك هەبێت دەوری دووبارەکردنەوە ببینیّ لاریم لەم قسەیە نی‌یە ، بەلاّم داخوا کام لەم سیّ دەنگە بوون بە پاشگرەکە . .

بێ‌گومان بزوێنی یەکەم نی‌یە چونکە بووەتە لەمپەری نێوان دوو دەنگی کۆنسەنەنتی نەگونجاوو لەگەلّ دەنگە بزوێنەکانیشدا بوونی نی‌یە ، کەوابێت ئایا کونسەنەنتی دوایی‌یە کە ئەمەشیان پاشگر نی‌یە چونکە ئەرکێکی زمانەوانی تر دەبینیّ کە دووبارە کردنەوەیە ، بەهەر حالّێك تەنیا (و) ی کونسەنەنت دەمێنیّ کە کەوتوەتە نێوان دوو بزوێن‌و بەتەنیا ئەویشە مانای دووبارە کردنەوە دەبینیّ . . باشە گوایا لە تواناداني‌یە دوا بزوێنی ووشەی (کار)ی دووبارەکردنەوە لاببرێت بێ ئەوەی مانای دووبارەکردنەوەش بشێوێت وەکو کاری (هاتەو) لە جیاتی (هاتەوە) .

لە بارەی چەند دەنگێکەوە وەکو (ت ،ی ،ن ،ر) لە لاپەرە (۱۰۱)دا دەلّیّ :

هەموو کارێکی داخوازی کە بۆ دوەم کەسی تاك بێ‌و لە دۆخی دووبارە ، گەڕانەوە . . .هتد – دابیّ ، نێوبڕی «ر» نەرم وەردەگریّ» .

دەلّێم ئەم (ت ،ی ،ن)ەو دەنگەکانی تر بۆ نێوبڕی نین بەلّکو ئەرکی زمانەوانی‌ی تریان لەسەر شانە کە پەیوەندی بە **نێوبڕی‌یە** وە نی‌یە ، بەلّکو پەیوەندیەکی تەواویان بە کاری (بوون‌و هەبوون)ەوە هەیە ، ئەمەش بۆ دەرفەرتێکی دی لیّ دەگەڕێین .

دانەری بەرێز کە دەلّیّ هەموو کارێکی فەرمان . . . «ر» وەردەگریّ مەرج نی‌یە بۆ گشت کارەکان یەکسان بێت ، چونکە زۆر کار هەیە پێویستی بەم (ر)یە نی‌یەو هەندیّ کاریش لەخۆیانەوە (ر) یەکەیان هەیەو کەمێکی کەمی ئەم کارانە پێویستیان بە (ر) هەیە ئەمەش لە چوارچێوەی چاولێکەری یان هاوشانی‌ی ئەو کارانەی کە ئەم دەنگەیان لە بنەرەتدا هەیە .

بۆ دلّنیاکردن وا کۆمەلّە کارێك پیشان دەدەم کە لە بنەرەتدا دەنگی (ر) یان تێدا هەیەو لە هەندیّ شێوە زمانیش‌دا کاری فەرمان بە جۆرێك دەبێژن کە بە (ری) دواییان بێت . . کۆمەلّێکیش دەنگی (ری) وەرناگرن ، کۆمەلّێکیش لەبەر هۆیەك ئەم دەنگە وەردەگرن کە بریتی‌یە لەوە (کار) لەیەك بڕگەی دوو دەنگی پێك‌هاتووە ، یەکەمیان کونسەنەنتەو دووەمیان بزوێنە .

- ئەو کارانەی لەخۆیانەوە دەنگی (ر) یان تێدا هەیەو کاری فەرمان (ر)ی تێدایە هەروەکو لە شێوە زمانی لوری فەیلی‌دا :

«گرتن – بگر ، برین = ورین – بوور ، بردن = وردن – بوەر ، کردن – بکەو بکەر ، ناردن – بنیر ، هاوردن – بیار ، خواردن – بخوەر» دەبیّ ئەوەش بزانین کە لەم لەهەجەیەدا بزوێنی (ە) ناچێتە دوای کاری فەرمان .

- ئەو کارانەی دەنگی (ر) وەرناگرن :

«خواستن – بخواس‌و بخواز ، هاتن – بیا ، کیشین – بکیش ، خەفتن – بخەف ، فروشتن – بفروش ، بەخشین – ببەخش‌و بوەخش» . .

- ئەو کارانەی کە پێویستیان بە دەنگی (ر) هەیەو لە بنەرەتیاندا نی‌یە ، تەنیا هەر ئەمانە بە (نێوبڕ) دادەنرێن :

«خستن – بخەو بخەر ، داین – بدەو بدەر ، نووسین – بنووس‌و بنووسەوە یان بنووسەرەوە ، خوێندن – بخوێن‌و بخوێنەوە یان بخوێنەرەوە . .» تاد . .

لەمانەرا دەردەکەوێ کە مەسەلەکە گشتی نی‌یەو یە دانانی بە گشتی تەواو نی‌یە .

لە لاپەڕەگەلی ١٠٣ – ١٠٦و لە برگەی (١/٤) بەولاوە کە دێتە سەر شیکردنەوەی ئەو شێوانەی کە ووشەی (دۆزیەوە ، دۆزییەوە ، دۆزی‌یەوە ، دۆزیێوە)ی لەسەرە ، پاش گفتوگۆیەکی زۆر دەگاتە ئەنجامێك کەوا چوار (ی) زنجیرەیان بەستووەو زمان توانیویەتی لەم کۆمەڵە یایانە خۆی رزگار بکاتو دوو بۆتەی بۆ ئەمە جێگیر کردووە : دۆزی‌یەوە ، دوزیەوە) .

بەلاَم لام وایێ بێ هوودە خۆی‌ماندوو کردووەو ئەگەر بهاتبا دەستووری (گونجانو نەگونجانی دەنگەکان)ی پەیرەو بکردبا زوو دەگەیشتە ئەو ئەنجامە مەنتیقی‌یەی کەوا : ئەگەر (ی)ی دۆزی بەرناقێ غایب بێت مانای وایە ئەم (ی)یە دەنگێکی کونسەنەنتەو کۆنسەنەنتیش لێرەدا لەگەلٚ ئەو کونسەنەنتەی پێشی‌کەوتووە نەگونجاوە بۆیە دەبێ دابڕێکیان بێتە نێوان ، زمانیش خۆی (ژێری) داسەپاندووە چونکە لە رەگەزی دەنگە کونسەنەنتەکەیە جا بە لاتینی ووشەکە وەها دەنووسرێت Doziy کاتێکیش کە واوی دووبارەکردنەوەی پێدەگا ئەویش کونسەنەنتەو لەگەلٚ دەنگی (ی)ی کونسەنەنتی پێش خۆی نەگونجاوە بۆیە دەبوو دابڕێك یان نێوبڕێك بێتە نێوانیان کە (ە)یە . . بەلاَم هەرچی (ە)یەکەی دوایی‌یە ئەوا بۆ دووپاتکردنەوە تەئکیدەو لادبرنیشی مانا ناگۆڕێت ، تەنیا ئەوە نەبێت لەوانەیە گوێگر بروا بەوقسەکە نەکات ، بۆیە بە لاتینی بەم شێوەیە دەنووسرێت Doziyewe . لەگەلٚ ئەوەشدا هەر شێوە زمانەی رێگەیەکی تایبەتی خۆی هەیە لە دەربرینی دەنگەکان یەکێك (ژێر) درێژ دەکات تا رادەی (ی)یەکی ناوەندی (ا) هەیشە درێژی ناکاتو وەکو خۆی دەی‌هێلێتەوە . ئیتر لێرەدا ناکۆکی روودەدات .

خۆ ئەگەر زنجیرە بەستنی (ی)و (و) لە نووسینی تازەماندا بەرچاو بکەوێت ، خەوشەکە لەمەر زمان نی‌یە بەڵکو خەتای خۆمانە چونکە تا ئێستا نەمانتوانیوە بە وردی دەنگە بزوێنەکان بناسین ، هەروەکو نەمانتوانیوە رەمز بۆ دەنگەکانی کونسەنەنتو بزوێنی سەر بە بۆرو ژێر پەیدا بکەین ئەوەتا جارێك لە جیاتی ژێر (ا) دەنووسین (ی) و جارێکیش هیچ نانووسین .

جارێك لەجیاتی ژێری ناوەندی (اٖ) یەك ی دەنووسین جاری واش هەیە دوو (ی) وە لە جاتی مۆرفیمی ، (iy) . . دەنووسین (ی‌ی) و . . . وە لەجیاتی (ی)ی کونسەنەنت (y) جارێك یەك (ی)و جارێکی تر دوو (ی) دەنووسین .

هەر بەم جۆرە بۆری کورت (U) بەشێوەی (و) دەنووسینو بۆری ناوەندیش (U) جارێك بە یەك (و) و جارێکیش بە (وو) و جارێکی تریش بە (ۆ) دەنووسین .

لە کاتێکدا کە مۆرفیمی ، uw ، ، wu بە شێوەی (وو) دەنووسین سەرباری نووسینی واوی کونسەنەنت ، (w) بە شێوەی (و) بۆیە شتێکی سەیر نی‌یە کە (ی) و (و) بە شێوەیەکی واکەڵەکە بکەن کە کامی بەخۆی دەڵێ زۆر زانا نەتوانێ ئەنجامێکی روونو رەوانی رێنووسی لێ بەدەربهێنێ . . لێرەشدا نامەوێ شتێکی تازە پێشنیار بکەم ، ئەمەو جگە لە (ۆ) و (ێ) کە ئەوانیش ئاسۆی شێوەی نووسینەکەمان تاریکتر دەکەن .

ئەوەی سەیر بێ ئەوەتا کە لە لاپەڕە (١٠٥) دا هاتووەو دەڵێ :

– ی – کورت ئاساییانە لەگەلٚ بزوێنی دیکەدا ، دەبێتەوە بە دەنگدارو بەلای منەوە جێی کێشە نیە ، لە دۆخی فرە داکشاویشدا دیسان توانای هەیە بێتەوە بە بزوێنی کورتو ئنجا بە زەبری بزوێنی دیکە بێتەوە بە دەنگدار ، لەم حەلەدا بۆمان هەیە کە «ی» نێوبڕ لەلاوە نەهێنین ، ئەوسا یا بریتی دەبێ لە راناوەکە یان هەر (ی) بزوێنەو جوولاَوە» .

ئەم برگەیە رایەکەی لاپەڕە (٩٧)ی دانەر دووپات دەکاتەوە کە لەکنم وابوو هەڵەی چاپەو گوتبووم تووشی ناکۆکی هاتووە ، سەرباری ئەمەش دەمەوێ راستەقینەیەکی زمانەوانی هەیە بیخەمەوە یاد کەوا :

کۆنسەنەنتەکان شێوەی کونسەنەنتو بزوێنەکانیش شێوەی بزوێن دەنوێنن لەچاو لەهجەکاندا چ سەرەکی‌و چ لقە زمان . . بە نموونە (ب)ی لەهجەی سۆرانی دەبێتە (و) لە لەهجەی لوری – فەیلی‌دا وەکو : باران = واران .

(ف) ی لوریش دەبێتە (و) لە سۆرانیدا وەکو : کەفت = کەوت . .

(ا) ی بزوێنی لوری دەبێتە (سەر) لە سۆرانیدا وەکو : خاو = خەو . بەپێچەوانەشەوە (چاو)ی سۆرانی دەبێتە (چەو) .

ئەمەش لە زانستی‌ی فۆنەتیکدا مانای ئەوەیە (ب)ی کونسەنەنت شێوەیەکی واوی کۆنسەنەنتەو پێچەوانەش هەروەهایەو ئەلفی کۆنسەنەنتیش شێوەیەکی (سەر)ی بزوێنەو پێچەوانەش هەر وەهایە لەچاو هەردوو شێوە زماندا .

بەلاَم گۆڕانی دەنگی کۆنسەنەلت بە دەنگی بزرێن یال بە پێچەوانە ، ئەمە ناکرێ ، خۆ ئەگەر بکرێت ئەوا شیرازەی زکان تێك‌دەچێت . زمانی ئێمەش بریتی‌یە لە چەند ل هجەیەك ، هۆی کی سەر کی‌ی ئەم زۆری لەهجەی ش شێو ی جۆارجۆری یەنگەکالی کۆنحەنتو بزوێنە لەم لەهجان دا . . ئەی چۆن ئەگەر کۆنس نەنت بە بزوێن بگۆردرێن یان بە پێچەوانە روویبات دەبێ چ بەو زمانە بلێین ؟ . .

له دووانگەی زمانه وانیەوه

# فیرستەکتیبێک

ڕەئووف ئەحمەد ئالانی

**رێگەم بدەن ... لە بیرەوەرییەکەمەوە ... !**

که مندالّ بووم‌و کەمێك دەم‌فاماند ، کردبانمه شوانی کارەگەل . . . نزارانی کۆنه گوندەکەمان ، له گەلەی ئەو دەوروبەرەیه جمەی دەهات ؛ هەر ئەوەندەم خۆشی‌بوو ، که کاریلەکانم گوێیان له بەرەی بزنان نەبوایه ! . .

دەنا پێوەردەبوون‌و بۆم بەسەرنەدەکرانەوە . . ! !

زۆر جار دایکم پێی دەگوتم :

رۆڵه ! کارەساواکان ، له ئێوەی بزێو هارو هاجترن ؛ جا بۆ ئەوەی له ئاوگەلەو پێوەربووندا ، به ئاسانی هی خۆت هەڵبهاوێژی وە [سەرو بەنی سەوزو سووریان] له کلکیّ بخه . . .

لەوانەیه خوێنەرەوە بەرێزەکان ئەو سەر بەندەیەم به گێلەگوته حەلێب‌بکەن . . ؟ !

لێم‌مەگرن !

ئەوه ساڵێك‌و سیّ‌مانگی رەبەقه ، بەحسێکم بەناوی [دواوانێك بۆ رێنووسی کوردی] ئاوەکی بووه ؛ دەترسم وەك کاره هەتێوه له گەله بەرهەمەکانم لانەوازبێ .

جا بۆ ئەوەی نیشانەی‌بکەم ، برێ هاوکێشەو زادەبیری لەمەر خۆمی لێ‌رادەگەیەنم :

١ – بنیادی وشەی سامی‌نەژاد به دەنگه مەندەکانەو بزوێن ناکەنە بەشه ساختمانی وشه ؛ له بنکەی پیته ئەسڵیەوەو به ئەوزانی تایبەتی گەردان – دەسازێنن . لەکوردیدا چ دەنگدارو چ بزوێن له بنیادی وشەدا یەك‌سانن .

٢ – ئەگەر پیتەعەرەبیەکان به لوێچێك خاڵ‌و چوکڵه ، دەستەمۆبکەین . بێجگەی ئەوانەش – وەك لاتینی – دەبیّ لالوێچێکیان پێوەربکرێن ، چونکه هیچیان به سەرومری بۆ ئێمه دانەبەزیون .

٣ – زۆرینەی بەره مه رێنووسەکانمان ، له چەند بەندەراگەیاندن‌و ئامۆژگاریەك دەچن ؛ چونکه ئەو کارەیان له شی‌کردنەوەو بەراوردی رێزمان تەرەکردوه .

٤ – فیزیا گەریانه تێبروانین ، جووته بزوێن کۆنابنەوه . . هەندیّ پیت وەك (و ، ی) که دوو دەوردەبینن ، باری ناچاریەو رواڵەتانه زەین دەترازێنن ! !

٥ – وەك داهێنانێکی نویّ ، ئەنجومەنی کۆڕی زانیاری‌ی کورد کەشیدەی ( . . . . . ) خسته سەر (و ، ی)درێژ «١»

له باتی دووباره بوونەوەی ئەو پیتانه . . لەوه زیاتر چاری هیچ گیروگرفتێکیان نەکرد . . ئەویشی بەگشتی پێشوازی‌ی لێنەکرا . . لەبەر ئەوەی‌که ئەو کەشیدەیه دەکەوێته دەرەوەی ساختمانی وشه ، جاربەجاریّ فەرامۆش‌دەکریّ . . لەلایەکی دیکەشەوە ئامرازی ئیزافەو وەسف رامالّ‌دەکاو دەبێته تەگەرەیەك له دەستوورسازیدا .

٦ – هەمان سەرچاوه پیتی (ص)ی برداوه ؛ بەو بیانوەی که له گۆکردنی (سەگ ، سەد) دا دەبیستریّ . کاتێك پێویستمان به وه دەبوو که جووته وشەی [سەگ ، سەد] بەسێن داتایەك بیەخشنی ، زۆر جیاوازبیّ له (صەد ، صەگ])ی به مانا کسۆك و ژماره – ١٠٠

- . جا سەری زبانیان بۆ لوول بکرێ یان پان بکرێتەوە – بە پێی ناوچە – هیچ لە باری مەسەلەکە ناگۆڕیو لەو ژمارەیەو لەو گیانەوەرە بەولاوە چی دیکە ناگەیەنن . . بەنموونە لە عەرەبیدا ، (سار ، صار ، ثار) هەریەکەیان واتای جیاوازی‌هەیەو بردانی ئەو دەنگ‌و پیتانە بەجێیە .

٧ – دیسان وایان داوەتەدەست کە پیتی (ھ)و پیتەبزوێنی «٥» یەکێکن . بەوپێیە دەبێ دروست بێ کە بنووسینی : «ههجانهد» = «هەمانە» یان بنووسین «٥مزە» = «هەمزە» .

٩ – ئەم قسە رەبەقانەش بەدەم ئەم وئەوەوەن :

أ – بێژەی کوردی چۆن لە دەم دەردەچێ بە هەموو ئێلات‌و خێڵاتیەوە ، ئاواش بنووسرێ .

گوتومە :

«وێنەگرتنی گشت دەنگ‌و کۆمەڵەدەنگ‌و راستەدەنگ‌و لارەدەنگ ، پسکەو منگەو فنگەو دوولۆو ، گیرەکرکەو رەهاکرکەو قورسەدەنگ‌و . . . هەریەکەیان بە شکڵ‌و ئەندازەی خۆی ، ئاواتی هەموانە . . . بەڵام ئاوات شتێکەو واقیع شتێکی‌دیکەیە ؛ ئەو هەمکە شتە ، بە «٣٥» وێنەپیت‌و تاکەچوکڵەی «٧» دابین‌نا کرێن .

ب – هەندێ رێنووسەوان دەڵێن :

ئەگەر وشەیەکی بێگانە کەوتە نێو نووسینمانەوە ، دەبێ گۆکردنە تایبەتیەکەی‌بە رەمزێکی خۆمان بپارێزین» .

کورتەوەڵام :– پاسی ئەم جیهانە بە رێنووسی ئێمە ناکرێ . تا ئەندازەیەك دەسپێردرێ بە فەرهەنگستان .

بەر لەوەی رێنووسی کوردی بکەینە – ئسپرانتۆ – سادەترین گرفتی خۆمان دەوردەکەمەوە :

ئەوە نیوە سەدەیەکە لە بارەی «ر» ی گڕیکورد یەوە لە دەمەقاڵێ‌داین ، تەنانەت هەندێ لە زاناکانمان ئەو «ڕ» یە لە «رر» ی گیراو جیاناکەنەوەو لە بەر هەمەکانی خۆیاندا بە دووبارە دەنووسن «زەررە» ، بە «ررە» بە حیسابی ئەوان دەبێ بشنووسین «مسقاڵە زەرررە» بۆ ئەوەی لە «زەررە» ی ناوەدەنگ جیا بێتەوە ! ! ئەمەش بەهەرحاڵ ، لەسەر ئەوە هەر لە دەمەقاڵێداین کە چوکڵەی «٧» لەسەر «ر» ی گڕبێ یان لە ژێریەوەبێ ؟ ! لەهەموو سەرێکەوە ، لەژێرەوەبێ پەسندترە

جـ – هانابردنە بەرکۆرو کۆنگرە :

بۆ رێ‌کەوتن لەسەر هێڵەگشتیەکانو پلان‌دانان کارێکی باشە ، دەنا بۆ شی‌کردنەوەیەکی میکانیکیانەو زانستانە ، دەنگدانەوەی هۆڵ‌و سەرپێیانە چ دادێك‌نادا .

د– دەڵێن : تادەتوانرێ وشەی ناسادە ، بە یەکەوە بنووسرێ . . ئەویش لە پێناوی سفتیدا . ئەمە ناچێتە قاڵبی دەستووردانانەوە ، بەو پێیە کارەکەمان دەبێتە گۆترەکاری‌و لەنێوان (دەتوانرێ‌و ناتوانرێ) دا ، گێژدەخواتەوە .

تا ئێستا چ رێنووسەوانێکمان جۆری دارێژراوو لێك‌دراوی دەست‌نیشان‌کردووەو دەستووری لێ‌تاودابن ؟ ! بەش‌بەخۆم ئەم لایەنەم‌کردووتە «٩» بەش‌و لە پێنج‌بەشیاندا ، دەتوانرێ بە دەستوور سفت‌نووسی بکرێن . . «٢» ئەوانی‌دیکەش بە لێك‌ترازاوی .

ئەگەر بەدەست‌من‌بێ دەنووسم (رێ‌نووس) ؛ چونکە دەستوورەکە بە ئەوەندە سازنابێ ، کە بڵێین :

هەرچی وشەی دیارناو «علم» ٥ ، بەسەریەکەوە بنووسرێ .

هـ – ئەگەر نووسینمان بە لاتینی بێ ، هەموو کۆسپێك تەخت‌دەبێ ؟ !

جارێ دەبێ لە سنووری دەسەڵاتەوە بۆی بروانین . . بە هەرحاڵ ئەو پیتانە جیهانین‌و سفتترن ، بەڵام زۆرینەی تەگەرەکان لەوێشدا دووبارەدەبنەوە ، ئەوەندە هەیە زێری فرەکرت «أ» و جیاوازە شکڵی ،[ ز /الله لە وێدا چارەکراوە ، بەڵام گیرە شێوێنی‌ی (ء) هەمزەو ،الله ،–للەبرگە ، گەڵی ئاڵۆزترە .

و– بردانی پیتی «ئا ، أ ، لا . . . هتد .

کارێکی نالەبارە ؛ چونکە ئەوانە برگەن . . بەوپێیە دەبێ بشێ کە برگەی «گا» ش ، بە تاکەپیت ناودێربکەین ! ! «٣»

١٠ – پیتی – واو –

لە کەموکوورییەوە هەمان‌پیت «و» نیشانەی دەنگ‌و بزوێنە . کورتەیەك :

أ – لەسەرەتای وشەوە بەیەك «و» وەك :

[وشە ، وتە]

ب – هەموو [وو] یەك کە بەرەنگاری بزوێن دەبێ ، دەبێتەوە بەدەنگدارو پێشی‌خۆی بە نیمچەبرگە بەحیێ‌دەهێڵێ وەك دەنووسم :

بوو + ٥وە = بووەوە . نانووسم بووەوە .

بەروو + ان = بەروان . نەك بەرووان .

جـ – لە نێوەندی وشەدا ، بە درێژی‌و جووتە واو دەپارێزرێ ، وەك (کور ، کوور) .

د – لە کۆتایی وشەدا بە تاك‌بێ یان بەجووت بەدرێژی گۆدەکرێ ، وەك (بوو ، شوو . . .)

هـ – بزوێن + و = دەنگ : داو .

و + بزوێن = دەنگ : بوار .
. .وو ی بزوێن + بزوین = دەنگ چوو + ە و ە =چ ٠٠
وەوە .
دەنگ + و = بزوێن : کورد .
و – کە پێك‌هێنی لێك‌دراوێ بلکێت :
گفتوگۆ ، کوتومت . . . .
١١ – پیتی (ی ، یٚ) :
ئەمیش لە سازگەیەکی نەرم‌و شلەوەیەو لەخۆیدا هەناسەدارەو لەگەڵ دەنگداردا بزوێنەو لەگەڵ بزوێندا دەنگدارە ، وەك :
– داری بەروو ، نەوای بلوێر . . . .

– ئەنجامی لێکۆڵینەوەم :
أ – ی نیسبەت هەمیشە فرەداکشاوەو بەیەك [ی] نبووسرێ لە دوای دەنگدارەوە ، وەك : (ئازادی) بە دوای بزوێنیشەوە نیۆبڕ = ئینفۆنیك (ێ) وەردەگرێ ، وەك :
– نانەوا + ێ + ی = نانەوایی –
ب – کە دەبێتە راناو بە دوای کاری کۆتایی‌هاتو بە (ی) ، دەنووسرێ ، وەك ئەو زانی‌ی ، تو دەزانی‌ی . لەمەرجێکدا (ی) بەرکار – مفعول – ی وەرگرت ، بە پێی رشتەی زمان سێ (ی) تەسور «ئەو دەرسی زانی‌ی کەبڵێین : زانی‌ی‌ی .
یەکەمیانی لە قەدی کارەکەیە ، دوەم کارایەو سێیەم بەرکارەو بۆ دەرسەکە دەگەڕێتەوە . نووسینی ئەو پۆلە (ی) یە گەمە بە چاودەکاو دوانیان دەنووسرێ .
جـ – ی ئیزافەو وەسف لە خۆیاندا کورتن . لەو حەلەدا کە وشەکە دوایەنەی بە (ی) بێ ، هەر دەی‌نووسم ، وەك :
[ماسی‌ی دەریا ، بی‌ی تەڕ ، رۆشنبیری‌ی نوێ = الثقافة الجديدة بۆ جیاکردنەوەی لە (رۆشنبیری نوێ = المثقف الجديد) .
د– بۆ جیاکردنەوەی باوك و کوڕو نازناو واز لە [ی] ئیزافە ناهێنم ، وەك : (رەئووف ئەحمەد ئالانی)
ه– ی بزوێن + بزوێن = دەنگدارو سەرەتای بڕگەی کراوە لە دوای بڕگەی گیر ، وەك :
قوتابی + ان = قوتابیان ، کانیان= =شةخهشة . هەمان نووسین بە حیسابی نووسینی [چیا ، دیار] کە هەریەکەیان دوو بڕگەیە .
و– بزوێنی [یٚ] توانای بوونەوە بە دانگی نیە و لەگەڵ بزوێندا ، نیۆبڕ وەردەگرێ ، وەك هەرمێ + ێ + ان = هەرمێیان ، نەك هەرمێ‌یان . هەروەها دەنووسم :
هەرمێ + یەك = هەرمێیەك ، نانووسم :
هەرمێ + ێ + ێك = هەرمێێك .
بەراوردی وشەیەك :
لادێ + ێ نیۆبڕ + ی‌ی نیسبەت کەبە دوبارە بێ + نیۆبڕ + ێك = لا دێییێك ، بەڵام بەپێی لێکۆڵینەوەکەی من چوار [ی ، یٚ] دوردەکەوێ‌و ئەو هەزاییە ناکەویتە بەرچاو ، کە دەنووسم : لادێییەك .
١٢– راناوی لکاو :
بەداخەوە هیچ زمانەوان‌و نووسەرێکم نەدی کە بە یەك‌سانی ئەو راناوانە بنووسێ . . ! !
بەهەرەمە نووسیویانەو د نووسن :
(مەی کوژە ، مەیکوژە بم کوژە بمکوژە بی‌یان‌کوژە . . .
دەمکرد ، بیکردایە ، هەڵمکرد هتد . ؟ !
بۆ ئەم دەستووره : «تێکرا دەنووسێن بەپێشی‌خۆیانەوەو دووسەرە نالکێن ؛ کەواتە بۆ ئەم خاڵانە :
١ – بەدوای کارەوە : خواستم ، خواستمان . . .
٢ – لەگەڵ تەواوکەردا : هەنگی لە داردا دۆزیەوە .
٣ – لەگەڵ کاری دارێژراودا : هەڵم‌گرت ، هەڵی‌گرت
٤ – لەگەڵ نیشانەی جۆرەکاردا : دەتکرد ، دەم‌کوژێ .
٥ – لەگەڵ داخوازی‌و ئیلزامیدا : بیان‌گر ، بی‌چێنم .
٦ – کە راناو بێ بە دوای کۆتایی‌هاتو بە (ی) وەك :
دە + کڕی + ی = تۆ پیاڵە دەکڕی‌ی ، کڕییان . . . .
٧ – کە تەواوکەرەکە کۆتایی بە (ی) بێ زەوی‌ی‌کڕی .
٨ – کە دەکەوێتە نێوان ئامرازو نیشانەو : وەك : نەی‌کڕی ، نەی‌دەکڕی ، نەمان‌دەکڕی .
١٣ – دەرفەتم نیە ئەم‌بەبەتانە راگوێزبلك م :
١ – دابەخ‌کردنی وشەی لاسهدە ؛ [بۆ پەرهوێزی ژمارە –٢ .]
٢ – گێرانەوەی هەندێ وشەو مۆرفێمی سواوەو تێکشکاو ، بۆ قەوارەی خۆیان .
٣ – بڕێك لە : [کار + نیشانە . کار + پاشگر . کار + نیشانە + نیۆبڕ + پاشگر]

نیگا :

هەندێ لایەنی . نێو بەنێو . لە ژمارەکانی هاوکاریدا بلاوکراوەتەوە :
پەراوێز :

١ – کۆڤاری کۆڕی زانیاری‌ی کورد – ژ ١ – ٩٧٣ و ژ ٤ – ٩٧٦ .
٢ – گۆڤاری رۆشنبیری نوێ – ژ ٨١ – ٩٨١ وشەی لێك‌دراو .
٣– هاوکاری – ٩٧٧/١٠/٥ لامەڵفەلای کوردی .
٤– گۆڤاری ژمارە – ٩ – ی برایەتی تۆمارکردنی ناوی باوك‌و کوڕ . «ئالانی»

## شیعری شاعیرانی کورد

هونەرمەندە راستەقینەکانی کورد ، بە-پێی ئەوانەی خۆیان بە خەندەوو ئازارەکانی گەلەکەیان بەستۆتەوە ، وەکو هەموو هونەرمەندە بەناوبانگەکانی دنیا هەمیشە تابلۆی رەنگینی پێشکەوتنی گەلیان وەك لایەنێکی راستیو خەباتێکی بێوچان پیشانداوە .

بەشێك لەو هونەرمەندە رەسەنانەمان ، ئەوکەلە شاعیرە بەهرەدارانە بوون ، کە بەوپەری ئەمانەتەوە خەمو پەژارەی گەلیان هەلگرتووەو کردوویانە بە هەوێنی شیعرەکانیان ، بۆئەوەی نەوەی دووا رۆژ لەکەینو بەینی کۆنو کیشە هەمیشیەکان ئاگاداربکەن . .

**عزیز محمد عبداللە**
**(مجمع)ی عەربەتو تالجەرۆ**
**سلیمانی**

## میکرۆب چۆن دۆزرایەوە . . ؟

پتر لە دوو سەدو پەنجا سالّ لەمەوبەر ، «لیونهوك»ی جۆلای هۆلەندەیی ، لە هارینی ووردە شووشەو دارشتنەوەی بە قەوارەی ئەستوورتر ، دوای بیست سالّ هەولّو تەقەللادان توانی زەرەبینێك دروستبکات ، کە گیانلەبەری بچووك بچووك کە بە چاو نابینرێن بدۆزێتەوە . . پاش مردنی ناوبراو «سیالانزا»ی قەشەی ئیتالی ئەرکی گەشە پیکردنی ئەو داهێنراوەی خستە ئەستۆ ، ناوبراویش گەیشتە ئەو رایە کە ئەو گیانلەبەرانە ، کەئیستا پێیان ئەڵێن – میکرۆب – لە ئەنجامی زاووزیّی نێو خۆیان زیادئەبنو بە خۆراکی ئەو مادەیەی تیاکۆئەبنەوە ئەژین . .

**طاهر عثمان محمد**
**قوتابی – لە هەولێر**

## « گژوگیاو پزیشکیی نێو کوردەواری »

لە ژمارە ٨٨ ی مانگی ئابو ئەیلولی سالّی ١٩٨١ ی گۆڤاری رۆشنبیری نویّدا ، بە ناوی پزیشکیی ناو کوردەواری ووتارێکی کاك عبدالرقیب یوسف بلاوکرایەوە . . پاش ئەوەی چەند جارێك بە خوێندنەوەی وتارەکەدا چوومەوە تیگەیشتم کە نووسەری بەرێز ئەرکێکی زۆری کیشاوە ، کە بەراستی جیّی سوپاس لیکردنە . . . بەلاّم بەلای منەوە ماموستا عبدالرقیب بەشێکی زۆر کەمی لە پزیشکیی کوردەواری نووسیوە ، بۆیە ئەبوایە سەردێڕی نووسینەکە « بەشێکی کەم لە زانینی پزیشکیی کوردەواری . . » بوایە سەبارەت بەوەی زۆر شارەزایانی‌تر هەن لە سەرانسەری ولاتی خۆماندا ، لە وێنەی کاك سامی عەودالّی هاورێم کە شارەزاییەکی زۆریان لە دەرمان گرتنەوەی هەیە لە گژوگیاداو ، ئامادەشە یارمەتی کاك عبدالرقیبو هەموو ئەو کەسانە بدات کە لەم بوارەدا هەولّو تەقەللا ئەدەنو ئەیانەویّ خزمەت بە هاوولاتیان بگەیەنن .

**رزگار سلیم کۆیی – پۆلی یەکەم**
**لە دانشگای ئیشکردنو تەندروستی**
**بالاّ . . . لە هەولێر**

# سەرهەڵدانی بیروباوەڕی شورات و ئەو هۆیانەی بوونە هۆی هاتنە کایەوەی

مصلح جەلالی

دەرکەوتنی «شراة»و ئەو هۆیانەی کە بوونە ئەنجامی پەیدابوونی . میژووناس و زمانزانە کۆنو تازەکان لەوەدا جیاوازن کە «شراة» یان بە خەوارج لەقەڵەمداوە ، چونکە وشەی خەوارج وا دانراوە کە بەو کەسانە بڵێن کە لەگەڵ علی کوڕی ئەبو طالب دا بوونو لایەنی معاویەیان لە ناکۆکی یەکەدا نەگرتو دوایی کە مەسەلەی (تحکیم) هاتە پێشێو کە علی بە (تحکیم) قایل بوو وازیان لەویش هێناو لەگەڵیا نەمانەوە . ئەمانە وەك خەوارجیان پێ ئەڵێن پێشیان ئەڵێن (حروریە) و ئەمەش ئەگەڕێتەوە بۆ (حرورائی) نزیك کوفە (١) . بەلام راستی یەکەی ئەوەی بۆی بچین ئەمانە هەردوای جیابوونەوەیان لە علی ناوی خۆیان ناوە (شراة) ئەمەش بە پێی ئەوەی کە باوەڕیان هەر ئەوە بووە بەم دنیایەی کە تیا ئەژین ئەوەو دنیایان کڕیوە ، یاخود خۆیان لە ڕێگەی خوادا فرۆشتووە . جا هەر وەکو دوزی (٢) بۆی چووەو پشتی بە قسەی یەکێ لەسەردارەکانی ئەم کۆمەڵە بەستووە کە ناوی (عبد اللەی کوڕی وهبی راسبی یە کە ئەڵێ : (ئێمەیان لەو شوێنانەوە کە زۆردارو ستەمکاری تیادا

نیشتوون بەم ناوەوە کە وایان بە باش زانیوەو بەم ئەحکامە نارەوایەوە ئێمەیان گواستەوە بۆ هەندێ لەم شارانە)[٣] . دوورنیە کە ئەمانە ناوی خەوارجیان لێ‌نرابێ . جا منیش لەبەر ئەوەی کە وشەی (شراة) گەلێ نزیکترە لەو وشانەی کە دراوەتە پاڵیان هەر بە (شراة) ناوم بردن‌و وەنەبێ ئەمەشیان دەسکردی خۆم بێ ، شارستانی ئەم لایەنە وا روون ئەکاتەوە : (ئەوانەی کە لایەنی ئەو ئیمامە رەوایەیان نەگرتایە کە کو/مەڵەکە لەسەری رێکەوتبوون‌و هەڵیان بژاردووە پێ‌یان ئەوتن خەوارج) . هەروەها بەو کەسانەشیان هەر ئەوت خەوارج یان (شراة) کە ملیان بۆ کارو دەسەڵاتی ئەو دەسەڵاتدارانەی ئەو دەمە کەچ نەئەکرد .

بێ‌گومان ئەم مل‌کەچ نەکردنە سەردەمی سەحابەکان‌و خەلیفەکانی راشیدنیشی گرتۆتەوە[٤] .

بە پێ‌ی ئەو فەرموودەیەی خوا کە ئەفەرموێ (ومن یجاهد في سبیل الله یجد مراغماً وسعه ، ومن یخرج من بیته مهاجراً الی الله ورسوله ثم یدرکه الموت فقد وقع اجره علی الله وکان الله غفوراً رحیما)[٥] . لەم رووەوە گوایە ئەمانە لەرێ خوا چوونەتە دەرێ ناویان نا (خارجی)و دڵ‌رەقانە لەگەڵیان ئەجوولانەوەو لەمانەش ئەو مێژوو نووسانە بوون کۆن‌و نوێ لەبەر دڵی کاربەدەستان سەردەمیان لەخەڵکی لادەرو لە ئاین لادەریان بێ بەزەیانە داوەتە پاڵیان‌و ئەم کارەش ئێمە هەر بۆ لایەنە راستی‌یەکە ئەچین کە ئەو ناونرانەی (شراة) بە خوارج نەژادی دەمارگیری و دورکەوتنەوەی لەراستی تەواو تێدایەو بەشە راستەکە دەرنەخراوە چوونکە ئەمانەی کە ناویان لێ‌نراوە لەرێگەی خوا لادەر بە پێچەوانەوە ئەمانە وا ناسراون کە شەویان بە نوێژ کردنی هەمیشەوە رۆژکردۆتەوەو ، تەختی ناوچەوانیان لەبەر نوێژکردن ساف‌و نوورانی بووە .

هەروەها ئەمانەی کە (شراة) ن بەرامبەر بە خەلافەت‌و کاربەدەستانی سەردەمەکانیان حزبێکی سیاسی شۆڕشگێڕی موسوڵمان بوو ، (را)ی دیموکراتیانەو کۆماری بووەو مەسەلەی خەلافەتیشی بەلاوە وابووە کە خەڵکی لە خوا پەرستی‌و کرداری موسوڵمانی رۆژانە دوور ئەخاتەوەو هەموو موسوڵمانێك مافی ئەوەی هەیە گە خەلافەت بپرسێتەوەو ئەم ئایەتەشیان (ان اکرمکم الله اتقاکم) دووپات ئەکردەوە .

(شراة)ەکان بەوکەسانە ناسران کە لەجەنگی (صفین)دا لەسەر ئەوەی کەرایان وابوو (تحکیم) هەر بۆ خوایەو علی‌یش بەم ناوبژی کردنە قایل‌بوو لە علی جیابوونەوەو وەك کەرتێکی خاوەن بیروباوەڕی چەسپاوی ئەوتۆی هەبوو هیچ دەربەست نەبوو لە رێگەیدا قوربانی بدات .

رمزیە عبد الوهاب الخیرو لە نووسینەکەیدا بەناوی (بەڕێوەبردنی عیراق لەسەردەمی زیاد) دا ئەڵێ : (شراة)ەکان بە خاوەنی بەرنامەی سیاسی دیموکراتی ناسراون . درووشمەکانیان گیانی جۆش (حماس)ی ئاینی دەستی بەسەردا گرتبوون‌و بەهیچ جۆرێ دەست‌بەرداری دادوەری نەبوون‌و لێ‌یان لانەداوەو هادی العلویش ئەمە دووپات ئەکاتەوەو دوکتور عزمی الصالحی بنەو بنەچەی ئەم بیروباوەڕەی (شراة) ئەگەڕێنێتەوە بۆ سەردەمێکی زۆر پێش جەنگی (صفین)و دەستنیشان‌کردنی ئەمەش لەو بەرەنگار وەستانەو کردارانەیاندا دەرئەکەوێ کە سەردەمی پێغەمبەر (د.خ)و سەردەمی خەلیفەکان بوویانە بە (تایبەتی پێش ئەوەی کوفە بگیرێ)و لە سەردەمی عثماندا بەتەواوەتی شێوەی شۆڕشی وەرگرت‌و ئەوەبوو بە کوشتنی عثمان دوایی هات[٦] .

لەناو ریزەکانی (شراة)دا ئەوانەی بەشداری کوشتنی عثمانی کردبوو هەبوون ، ئەوانەبوون کە مەسەلەی (تحکیم)یان بەجۆرە رێکەوتنێ لە قەڵەم ئەدا زیان بەسەربەستیان بگەیەنێ ، لەبەر ئەوە پەسەندیان نەکردوو بەتوندی دژی وەستان . لەلایەکی تریشەوە لایان وابوو پەسەندکردنی (تحکیم) لەگەڵ معاویەدا مەترسی هەیەو هەرەشەیە کە لەو بیروباوەڕیان کە قوربانیان لەرێدا ئەداو پاشانیش چۆنی بۆ چووبون (تحکیم)و ئەوشتانەی دوابەدوای ئەو کران هەموو وا هاتنە دی . بەڵام ئەو کارانەی کە ئەنجامی کۆمەڵێ پەشێوی هاتبوونە کایە دەریانخست کە بیروباوەڕی شراة یاخود ئەو بیروباوەڕەی لەبیروباوەڕی ئەوانەوە نزیکە زۆر کەس بوویانە ، بەتایبەتی ئەوانەی لە ناو مهاجرەکاندا قورئان خوێن‌و پاك‌و خوا پەرست بوون‌و لەبەر ئەوەش کە خواستی هەموو موسوڵمانێك یان بەشێکیان یەکسانی‌و دادوەری بووەو ئەمانیش کە بیروباوەڕیان وابووبێ‌و شتێکیان نەهێنابێ کە دوربێ لە ئامانجی موسوڵمانێتی و نەریتی عەرەب کە تێکەڵ دیموکرات‌و یەکسانی بکەن لەبەر ئەوە دەستەیەکی سەرلێ‌شێواو نەبوون .

دوکتۆر صالحی سەبارەت بەشوراتەکان پێمان ئەڵێ : کاتی بەرهەڵستکاری کردن کە لەلای کەسانەوە بەرامبەر بەعثمان و علی ئەکرا . . ئەم بەرهەڵستکاری‌یە لەو هۆیانە بوون کە بوونە هۆی ئەوەی ئەم حیزبە درووست بێ ، هەروەها ئەو بەرهەڵستانەی کە پێشی ئەو سەردەمە واتە سەردەمی پێغەمبەر (د.خ) روویان داوەو بوون ئێمە لێرەدا لێ‌ی ئەدوێین ئەگەرچی مێژوو نووسەکان پەنجەیان بۆ کێشابێ یان رانەکێشابێ کە ئەو بەرهەڵستکاریانە پەیوەندیان بە (شراة) ەکانەوە بووە یان نەء .

ئەوەشی لەم رووەوە یەکەم شت گێڕرابێتەوەو زۆریش

بایەخداربێ : ئەورووداوەیە کە مێژوو نووسەکان هەمە جۆرە کەم یان زیاد یاخود جیاوازن لەبارەیەوە ، ئەویش ناوی ئەو پیاوەیە کە ئەمرووداوە پەیوەندی پێوە هەیە :

جا وەك دکتور صالحی ئەیگێڕێتەوە رووداوەکە بەم جۆرەیە : پیاوێك ئەچێتە لای پێغەمبەر (د.خ) ئەو دەمە پێغەمبەر دەسکەوتی جەنگی (حنین)ی دابەش ئەکرد : پیاوەکە وتی : ئەی محمد من ئەمرۆ رەفتارەکانی تۆم بەچاوی خۆم دی . پێغەمبەر (د.خ) وتی : بەڵێ فەرموو چۆنت بینین؟ پیاوەکە وتی :

دادوەریانە بەشت نەکرد ، پێغەمبەر (د.خ) بە توورەیی‌یەوە وتی : هەی کابرا : ئەگەر دادوەری لای من دەست‌نەکەوێ ئەی ئەبێ لای کێ دەست‌بکەوێ؟ عمری کوری خطاب وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ئەبێ ئەم کابرایە هەر بکوژم ، پێغەمبەر وتی : نەخێر لێی گەرێ ئەمە ئەبێتە خاوەنی کۆمەڵ ، هەروەك تیرێك لە کەوانەوە دەرچێ ئەمانیش دەچنە قوڵایی ئاینەوە تاوەکو تیایدا دەرچن .

لە گێڕانەوەیەکی تردا وا گێڕراوەتەوە :

نەتەوەیەك لەپشتی ئەم پیاوەوە پەیدا ئەبێ فەرموودەکانی خوا ئەوەندە بەساردی ئەخوێننەوە ناگاتە گەرویان ، هەروەك تیرێك چۆن لە کەوان دەرئەپەرێ وا گورج لە ئاین ئەچنە دەرێ . لە گێرانەوەیەکی تردا وایە : ئەم کابرایە هاورێی هەیە نەپی‌ی خۆشە یەکێکتان نوێژ لەتەنیشتیەوە بکات و نە رۆژو لەگەڵ رۆژیاندا بگرێو قورئانیش وا ئەخوێننەوە لەگەروویان سەرناکەوێ . گێرانەوەیەکی تریش ئەڵێ : ئەوەی کە لەپشت ئەم بەرهەڵستکارەوە پەیدا ئەبێ ، پیاوێکە پەنجەتوتەی کۆڵە ، وەك مەمکی ئافرەت وایەو وەك سمێڵی پشیلەش مووی پێوەیە . (٧)

دوکتۆر صالحی ئەم گێرانەوانەی پوخت کردوونەتەوەو لەگەڵ واقیعی ئەو دۆخەی کە (شراة)ی تیدابووە بەراوردیان ئەکاتو ئەڵێ : هەرچۆنێك بێ ئەم‌کارەی کە ئەوپیاوە کردوویەتی بەرهەڵستکاری کردنی پێغەمبەر (د.خ) بووەو ئەمەش ئەوپەری توندگرتنی لایەنە ئاینی‌یەکەیو هیچ بەستێك رایناگرێ کە خۆی نمونەیەکی گیانی خۆیەتیو نمونەی ساکاری دەوارنشینێك دەرئەبرێ . ئەمە لەلایەك لەلایەکی ترەوە گیان‌پاکیو رەوشت بەرزیو باوەڕکردنە بە دەمەتەقێو بەرهەڵستکاری کردنی پێغەمبەر (د.خ) کە ئەیتوانی ئازاری ئەو کابرایە بدات کە بەرهەڵستی کردووە . ئەمەش ئەگەرێتەوە بۆ ئەو باوەرە قایمو ساکاری‌یەی ئەو پیاوە بوو یەتی کە وەك خۆی بۆی چووەو باوەری پی‌ی هەیە رێگەی بەرهەڵستکاری لێ‌نەگرن . ئیتردوای ئەوە دەربەستی ئەوە نەبێ بەرهەڵستی لی‌کراو کی‌بێ . دوابەدوای ئەمە دووکتۆر صالحی روونی کردۆتەوە ئەم پیاوە بیروباوەری (شراة) بەراسترین شێوە دەربریوەو (شراة)ەکان ناوبانگیان بەوە دەرکردووە کە قسە هەرگیز ناشارنەوەو بەرامبەر بە لێپرسینەوەی سەردارەکانیان جا ئەو سەردارە چەند پایەدار بووبێ دلێرانە درکاندوویانەو دوکتور دەربارەی ئەو پیاوەش وا ئەڵێ : ئەوەی سەبارەت بەم پیاوە گێرراوەتەوە جیاوازیان لەگەڵ یەك زۆرە چونکە (دەمێ بەناوی خنیصرە و جارێ بەناوی حنیصرەو لایەك بەناوی عمروی تەمیمی‌و کەرەتێ بەناوی حرقوصی کوری زهیرەوە ناسراوەو (ئەمەی ئەم دوایەشیان سەردارێکی شوراتەکان بووەو چوارەم مەمك‌دار بوو پێنجەم مەمك داریان نافع بوو) . واش گێرراوەتەوە کە خویصرە حرقوصی دەست‌خالاوی بووە ، هەندێك گێرانەوەش ئەم دوو پیاوە بەیەك کەس دا ئەنێن‌و ناوی (حرقوصی کوری زهیری خویصرەی تەمیمی) لی‌ئەنین . ئەمانەش خۆ ئەگەر کەمێکیشی راست‌بێ ، یاخود هەموویان راست‌بن . ئەوە دەرئەخەن کە حرقوصی کوری زهیری (شراة)ی یەکەم کەس بووە بەرهەڵستی پێغەمبەر (د.خ) کردووە . بەڵام هەندێ گێرانەوە لەمانە جیاوازن‌و حرقوصیان کردووە بەو پیاوە نیشانەدارەی کە لە پشتی پیاوە بەرهەڵستکارەکەوە پەیدابووە .

لە نووسینی (الملل) دا دەربارەی ئەم کابرایە وا ئەدوێ : یەکەمیان خونیصرە (پەنجە توتەی کۆڵ) بووەو دووەمیان مەمك‌دار بووە (٨) ئەم گێرانەوەیشیان داوەتە پاڵ علی‌و وایان گێراوەتەوە : پێش دەرکەوتنی (شراة) بەلایەنگیرانی خۆی وتووە (کۆمەڵێك پەیدا ئەبن مل‌کەچ نابن ، چۆن تیر لە کەوان دەرئەچێ ئەوانەش لە ئاین وا دەرئەپەرن‌و نیشانەشیان پەنجەتوتەی کۆڵە ، هەروەها گەلێ جاریش ئەوەی لی‌بیستراوە کە حرقوصی نمونەی یاخی بوونە ، لەشەری هرمزاندا عمر ناردی شەری لەگەڵ عزوان کردوو شکاندی ، ئینجا بەشداری گرتنی بازاری ئەهوازیشی کرد خۆی بەرێوەی ئەبرد ، یەکێکیش بوو لەوانەی کە سیاسەتی عثمانیان بە دڵ نەبوو شۆرشیان دژی بەرپا کرد .

یەکێك بوو لەوانەش کە نوێنەری بصرە بوون‌و چووە مەدینەو بە ئاشکرا نارەزایی خۆیو دەستەکەی بەرامبەر بە سیاسەتی عثمان دەربری .

وا دەرئەکەوێ لە ناو کۆمەڵەکەشیدا پایەیەکی باشی بووبێ ، چونکە کە عائشە هاتە بصرەو داوای خوێنی عثمانی ئەکرد ئەم پیاوە لەو شەش هەزار کەسەی لە گەڵیدا بوون رێی نەدایە کێکیان لایەنگیری عائشە بگرن‌و لەگەڵ ئەحنەفی کوری قیس‌دا جیابوونەوەو بەشداری شەری جمل‌یان نەکرد ، بەڵام لەشەری صفین‌دا لەناو

سوپ‌ کەی علی‌دا یەکێك بوو لەو پیاوە دەرکەوتوانەی لەسەر مەسەلەی ناوبژی کردن دوای ئەوەی کە لەسەری زۆر کۆڵانەوە جیا بووەوەو علی بە هەڵە داناو پێی وت کە تۆبە بکات ، بەڵام کە علی ناوبژی کردنی پەسند کرد ئەم بووە یەکێك لە پیاوە ناودارو سەردارەکانی (شوارە)و لەنەهرەوان شەڕی دژی علی کردوو کوژراو علی لەناو کوژراوەکاندا گەڕاوە تا دۆزیویەتەوە کاتێ کە بە کوژراوی دۆزیەوە ئەڵێن کە مژدەی کوژرانەکەی بەخەڵکەکە داوەو کەوتۆتە کرنۆش بردن بۆ خواوو وتویە ئەوەی وتم راست دەرچوو درۆ نەبوو . [٩]

وەك تێبینی ئەکرێ ئەو سەرچاوانەی کە (شوراە) خۆیان هەیانە پایەی حرقوس وزۆر بەرز ئەکەونەوەو ئەو قسانە ئەگێڕنەوە کە ستایشی ئەکەن . لە زمانی پێغەمبەرەوە (د.خ) گێڕراوەتەوە کە وتویەتی : پاش سێ رۆژ ئەو کەسەی پێش هەموو کەسێ واتە یەکەم کەس لەو دەرگایە بۆ لاتان هاتە ژورێ بەهەشتی یە . . هەموو رۆژێ یەکەم کەس حرقوصی لەودەرگایەوە چۆتە ژورێ بۆلایان . . لە گێڕانەوەکانی ( شراة ) خۆیاندا وتراوە کە حرقوصی بەدەستی خۆی دانیالی حەکیمی ناشتووەو ، دانیالیش هەمیشە داوای لە خوا کردووە کە بە دەستی پیاوێکی چاك بنێژرێ‌و پیاوەکە بەهەشتی بێ‌و ئەمەش چۆن بوو : وەکو ئەشی گێڕنەوە تەرمەکەی دانیال لای دانیشتووە گومراکان بووەو نەیانناشتووەو بۆ نوێژە بەبارانی ئەیانبرد : کاتێ کە ابوموسیی اشعری فەتحی شوشی کرد بینی تەرمەکەی دانیال لە تەختە گیراوەو نەنێژراوە ئەویش لەم بارەیەوە بۆ عمری نووسی کە شتێکی واهیە ، عمریش نامەیەکی بۆ نارد کە ئەبێ بە نهێنی بی‌نێژێ‌و کەس نەزانێ‌و بۆ ئەم کارەش حرقوصی لەگەڵ کاغەزەکەدا نارد بوو رایسپاردبوو کە ئەبێ حرقوصی بینێژێ ، حرقوصیش لەسەر راسپاردەکەی عمر . . بەپێی شەرعی موسوڵمانان چی‌پێویست بوو کردی‌و پارچە پەرۆیەکی دۆزیەوەو تێوەی پێچاو ناشتی .

ئەم گێڕاوانەی ( شراة ) بەرامبەر بە سەردارێکی گەورەی ( شراة) کە بەیەکی لە دامەزینەرانی سەرەتای ( شراة ) دائەنرێ شتێکی داتاشراوەو دیاردەیەکی درووست کراوە لەبەر ئەوە ئەبێ بە وریایەوە وەربگیرێ‌و ئەوەشی بەرەامبەر بە دانیالی حکیم وتراوە بەراست نەزانرێ‌و هەروەها ئەو سەرچاوە مێژوویانەی کەوا بێ‌لایەن بوون‌و بەلای هیچ دەستەیەکدا لایان نەداوە پەنجەیان بۆ ئەم مەسەلەیە رانەکێشاوە .

دوکتور عزمی الصالحی : گەلێ بەرهەڵستکاری باس ئەکات کە لە سەردەمی پێغەمبەر ( د. خ ) وویان داوەو هۆکانیشی ئەگەڕێنێتەوە بۆ دابەش‌کردنی زەوی و زارو دەسکەوت .

چوونکە ئەو بروای تەواوکردنەی بەراستی‌و دادوەری‌و یەکسانی‌یەی مووسوڵمانان توند دەستیان پێوەگرتبوو کە ئەبوو لێیان لانەدرێ هەر ئەمانەش بووە پاڵی بەهەندێکیانەوە ناوە کە ئەو هەڵویستەیان هەبێ ، کە ئەویش ئەوپەڕی توندوتیژی گرتنە بەرامبەر ئەوەی کە لە وبارەیە کەم‌وکورتی بکەن‌و ئەم‌کارەش بارستیەیەك ساکاری‌و خاکێتی‌بووە . ( پێغەمبەر جارێکیان ئەیەوێ کە هیچ لەکەیەك لە دڵی هەندێك لەپیاو ، ماقوڵانی قورەیشدا نەهێڵێ سەد حوشتر بە ابوسفیان‌و سەد حوشتر بە معاویەو پەنجا حوشتر بە (سهمی)و دە حوشتر بە عباسی کوری مرداسی سلمی‌د)ا) . عباس لەم دە حوشترەك کەمە رقی هەڵساو سەرزەنشتی پێغەمبەری (د.خ) کردو[١٠] شیعرێکی خوێندەوە ( شیعرەکەش لە شوێنێکی تردا باس ئەکەین) .

پێغەمبەر (د.خ)وتی : دەمی ئەم‌کابرایەم لێ‌مەکەنەوە بچن بزانن چی ئەوێ بیدەنێ . ئەوەندەیان دایە قایل بوو .

وەك دەرئەکەوێ پێغەمبەر (د.خ) بۆیە ئەم کارەی کرد دڵیان پاك بکاتەوەو انصارەکان بۆ پتەوکردنی ئاینی موسوڵمانان بەتایبەتی لەسەرەتادا زیاتر رابکێشی‌و مەبەستی لەمەدا هۆزگەرێتی‌و دەمارگیری نەبوو چونکە ئەو هۆزانەی کە بەخششەکەی پێغەمبەریان (د.خ) بەرکەوت زۆریان دەمارگیرو هۆزگەرێتی‌یان ئەکرد .

هەروەها ئەڵێ : پاش ئەوەی کە دەسکەوتی شەڕی حنین بەش‌کرا پیاوێك بە پێغەمبەری (د.خ)وت : ئەم دابەش‌کردنەت دابەش‌کردنێکی دادوەرانەو راست نەبوو . ئەمەیان بۆ پێغەمبەر گێڕایەو وتیان ئەم کابرایە وای وتووە ، پێغەمبەر (د.خ) دەمووچاوی تێك‌ئەچی‌و ئەڵێ : رەحمەتی خوا لە مووسی بێت لەمە زیاتر ئازاریاندا بەڵام دانی بەخۆیدا گرت .

لە ( الصحیحین )وا وتراوە : دوای ئەوەی کە دەسکەوتی شەڕی حنین دابەش کرا یەکێ لە انصارەکان وتوویەتی : شمشێرەکانمان ئیساش خوێنی ئەوانەی لێ‌ئەتکێ کە لەم شەڕەدا دوژمنمان بوون ، ئەبێ خوا چۆن قبوڵ بکات بەشی قورەیشی‌یەکان ئاوا بدات‌و بەشی ئێمە نەدات ، هەروەها وتووشیانە ، بۆ تەنگانە ئێمە بانگ ئەکرێین‌و کەچی دەسکەوتەکەش بەخەڵکی تر ئەدرێ .

دیسانەوە ئەشڵێ : کاتێ پێغەمبەر (د.خ) خەریکە دەسکەوتی خەیبەر دابەش ئەکات‌و ئەیدا بەوانە کە حربییەیان دیبوو پیاوێکی رەشی بەرگ سپی هاتە بەردەمی پێغەمبەرو (د.خ)وتی : ئەمڕۆ دادوەر نەبووی پێغەمبەر (د.خ) بەجۆرێ توورەبوو بە ئاشکرا لەدەم‌و چاویا دیاربوو و عمری کوری خطاب وتی : شەرت بێ ئەی پێغەمبەر ئەبێ بیکوژم پێغەمبەر (د.خ) وتی : ئەگەر بیکوژی خۆی‌و

کۆمەڵەکەی ناوبانگ پەیدا ئەکەن . هەروەها بە جۆرێکی تریش ئەیگێڕنەوە کە پێغەمبەر (د.خ) وتوویە : من دادوەرنەبم ئەی کێ دادوەرە ؟ فرمانیشی داوە بە ابوبکر کە بیکوژێ ، ابو بکر چوو بیکوژێ بەلام گەڕایەوەو بە (پێغەمبەر)ی وت : ئەی پێغەمبەری خوا خوا ئاگای لیّیە بویە نەمکوشت ئەبینم سوواره بوو . ئینجا بە عمری وت بچۆبیکوژە عمریش چوو گەڕایەوەو نەیکوشت‌و وتی : ئەی پێغەمبەری خوا خوا ئاگای لیّیە بینیم لە کڕنووشی نوێژکردندایە . ئینجا بە علی وت بچۆ بیکوژە ، ئەویش ڕۆشت وگەڕایەوەو وتی : خوا ئاگادارە نەمبینی ، پێغەمبەر (د.خ) وتی : ئەگەر ئەم پیاوە چارەنووسی کوشتن بوایە لەبەر دەمی خوادا دو کەسیان لەیەکتر جیاواز ئەبوون .

سەرچاوەیەکی تر[١١] ئەڵێت : ئەو پیاووی کە بەرهەڵستی پێغەمبەر (د.خ)ی کرد ، سروشتی شێوابوو ، چاوی بەقوولاً چووبوو ، ناوچەوانی قۆقز بووە بە پێغەمبەری (د.خ) وتووە : ئەودابەش‌کردنەی کە ئەمڕۆ بینیم لێت خوا پیی خۆش نیە . پێغەمبەر (د.خ) بەجۆرێ توورەبووە سووربۆتەوەو وتی : خوای گەورە لەناو هەموو دانیشتوانی سەرزەویدا لەمن دڵنیایەو کەچی ئێوە دڵنیانین لێم .

عمر وتی : لێم‌گەڕێ با بیکوژم . پێغەمبەر وتی : لە پشتی ئەمەوە کەسانێك پەیدا ئەبن چۆن تیرێك لە کەوان دەرئەپەڕێ ئەمانیش وا دەرئەچن : [١٢]

لەم گێڕراوانە هەمەجۆرەی سەبارەت بەم بەرهەڵستکارانەی بەرهەڵستی پێغەمبەریان (د.خ) کردووە دوکتور الصالحی وای بۆ دورکەوتووە کە ئەم جۆرە کەسانە بەردی بناغەی ئەو (شراة) تانەن کەبە ئاشکراو بێ ئەوەی گوێ بەهیچ سزایەك بدەن لەسەر کەمترین هەڵە کە سەرکردەکانیان بیکەن بێ‌سڵ بە سەرکردەکانیان بڵێن کە بۆ ئەم هەڵەیەی کردووە .

مەبەستیش لە هێنانەوەی ئەمانەش گشت ئەوەیە کە حزبی ( شراة ) ئەو حزبە نەبووە کە کەسانی هەمە جۆر بیرو باوەڕدار یاخود بۆ یەك مەبەست نەچوو لەیەك نەچووی تێدا بووبێ‌و دەست‌کردی شەڕی صفین‌و مەسەلەی ناوبژی کردن نەبوو و جا هەر وەك لەوەوپێش لەپیاوانی سەرەتای ئەم حیزبە دواین ئەم حزبە لە مەسەلەی ناوبژی‌کردنەکەدا ڕەگی نەپچڕاوەو بگرە بۆ زۆر لەوە کۆنتریش ڕەگی خۆی داکوتاوە .

پاشان هەر وەك دەرکەوتووە کۆمەڵێك هۆ بوونەتە پێکهێنانی ئەو حزبەو شێوازی پەیوەندی کردنی لێك‌نەپچڕانی‌یان بۆ درووست بکات‌و یەکێتی‌و خواست‌و مەبەستیان پێ پەیدا بکات‌و کە سیفاتی چاکەکاری‌و ئەوپەڕی خواپەرستیان بداتێ‌و لە کەسانی تر جیایان کاتەوە گیانی یاخی بوون‌و شۆڕش‌و ڕاست‌گۆیی‌و کە ئیمانێکی تەواو لە کاکڵی ساکاری دەوارنشینیدا درووستی ئەکات بکەن بە بەریاو ئەیگەڕێننەوە پێش جەنگی صفین . ئەم هۆیانە بوونە هۆی درووست‌بوونی ئەو حزبە ئەمەش پێش جەنگی صفین لە حرقوصی زهیرو عبدالله کوری کواءو سعری کوری فدکی‌و کەسانی تردا دەرئەکەوێ کە دەربەدەر کران‌و دوورخرانەوەو لەدوای جەنگی صفینیش لە جیابوونەوەی چەند جارەو ناکۆکی چەند بارە کراوباندا دەرکەوتوترین سیفاتی پیاوانی ئەم حزبە ئازایەتیانەو بەو چاوە ڕوانینە مردنە کەوا ڕزگاربوونەو سەرفرازی‌یە .

هەروەها ئەم شتانە ئەوەمان بۆ دەرئەخەن ڕەگ‌داکوتانی ئەم حزبە ئەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی غەزاکردن‌و دابەش کردنی ئەو شتانەی کە لەو غەزایانە دەست‌کەوتووە .

بەتایبە ئەو کارانەی کە لە کوفەدا ڕوویاندا دوکتۆر صالحی [١٣] لە مێژوو نووسە کۆنەکان باشتری بۆ چووەو ئەڵێ :

سەرهەڵدانی ئەو حزبە بێ ئەو پێشەکیانە نابێ کە ڕێگەی دروست بوونیان بۆ تەخت کرد ، شتی زۆریشیان ناوە بە خویصرەدارەوە کە ڕاست نیە ، بۆ ئەوەشی بەڵگەی بوونی ئەو حزبە بەدەستەوە بدەن ئەمەشیان وتووە : لەپشتی ئەو پیاوەوە کۆمەڵێك پەیدا ئەبێ فەرموودەی خوا بەساردی ئەخوێننەوە .

مامۆستا احمد امین[١٤] دووبارە ئەمیش ئەڵێت : شتێکی نهێنی لەو قسە زۆرانەدا ئەبینین کە وێژوو مێژوویان بە سەرزەنشت کردنی ( شراة ) پێ پڕکرانەتەوە ، وا دەرئەکەوێ شراة بوویێتە بنیشتە خۆشەی سەر زمانیان‌و نموونەیەك بۆ ئەم مەسەلەیە ئەهێنێتەوەو ئەڵێ : مهلب کوری ابی صفرە هەمیشە سەرزەنشتی کردوون‌و ناوو ناتۆرەی لێناون . ئەمەشی بۆ ئەوە ئەکرد چەند بتوانێ (شراة) لاواز بکات‌و بەم جۆرە شتانە بیاتشکێنێ‌و خەڵکی بەلای خۆیدا دابتاشێت .

مهلب ئەوەندە درۆو دەلەسی کردبوو ، لەیەزد ئەگەر بە گەرەکێکدا بڕۆشتایە ئەیانوت : ڕۆشت درۆ بکات .

خوشکە رمزیە عبدالوهاب خیرۆ (باوەڕی ئەو پیاوەی کە بەرهەڵستی پێغەمبەری (د.خ) کرد لە مەسەلەی دابەش‌کردنی دەس‌کەوتی جەنگا بە باوەڕی (شراة)ی لەقەڵەم ئەداو ئەو باوەڕەیە کە موسوڵمانان هەیانەو پەیوەندی بە کەسەوە نیە ، ئەو باوەڕەیە کە دادوەری ئەبێ بێ‌کەم‌و کوڕتی بکرێ‌و ئیمامیش یاخود با پێغەمبەریش بێ بە پیی دۆخ دەسکاری ئەو دادوەری‌یە نەکات بەگیانی ئەوراستیەی کە هەیەتی‌و هێز بتوانێ پیی لەق کات ڕای خۆی

دەرئەبرێ) بەڵام ئایا ئەم پیاوە دامەزرێنەری کۆمەڵی (شراة) بووە ؟ خوشکە رمزیە خیرو وەڵامی ئەمپرسیارە ئەداتەوەو ئەڵێ : ناتوانین بڵێین ئەم پیاوە دامەزرێنەری (شراة) بێ ، چونکە هیچ سەرچاوەیەکی وامان بەدەستەوە نیە بتوانین پشتی پێ‌ببەستین‌و تەنیا ئەوە ئەتوانین بڵێین ئەم پیاوە باوکێکی ڕۆحی کۆمەڵێك بوو کە لەپاشاندا بوونە (شراة) . (١٥)

هەروەها بەم جۆرە خوشکی ناوبراو لە مەسەلەکە کۆڵیوەتەوە . وەکو دیاردەیەك هەموو باوەڕێك یاخود بیرێکی نوێ کەدێتە کایەوە باوەڕ پێ‌هێنەرو بەرهەڵستکاریان ئەبێ . یاخود هەر ئەو باوەڕ هێنەرانە بەو باوەڕو بەو بیرە ئەبنە دوو دەستە ، دەستەیەکیان بە قەدەر تاڵە موویەك لەبیرو باوەڕەکە لانادەن‌و ڕەخنە نەگەورەترین کەس ئەگرن‌و دەستەکەی تریشیان باوەڕی خۆیان ئەبەستن بە گەورەیەکەوەو لەبەر ئەوکەسە باوەڕەکە ئەپەرستێ ، لەمانەش ، شیعەکان باوەڕیان بە گەورەکەوە بەست‌و باوەڕو گەورەکەیان پێکەوە ئەپەرست . هەروەها چۆن ئەوانەی کە باوەڕیان بە مەسەلەی علی هەبوو شیعە نەبوون ئەوانەشی کە باوەڕیان وابوو ئەبێ باوەڕ بە گەورەوە نەبەسترێت هەموویان (شراة) نەبوون .

جا کاتێ کە نرخی سەر بەستی بیرو ڕەخنە گری‌و ئازایەتی پێش موسوڵمانێتی‌و سەرەتای دەرکەوتنی موسوڵمانێتی لەناو عەرەبدا بووبێ مەرج نیە ئەو پیاوە (شراة) بووبێ .

بەڵام ئەبێ لەوەش وردبینەوە ئەو پێزەی کە خاکی عەرەب بوویەتی گومانی تێدا نیە کەشێکی گونجاوبووە بۆ گەشە سەندنی گیانی (شراة) و بیروباوەڕو سیاسەتیان ئەگەرچی لەم ڕووەشەو پاش ماوەیەك لایەنی ئەوپەڕیان گرت . .

هەروەها بەراستی بۆ ئەم مەسەلەیە ئەچێت‌و لای وایە : واتە مەسەلەی (شراة) لەو ساتەوە دەست‌پێ ئەکات ناکۆکی لەسەر خەلافەت پەیدابوو ، واتە سەرەتای موسوڵمانێتی‌و ئەوەشی کە بە چاکی ئەمە ڕوون بکاتەوە کۆبوونەوەی ئەو دوو سووپایەبوو بەرامبەر یەکتری کە دوای مردنی پێغەمبەر (د.خ) لێ‌بێ لەسەر خەلافەت کرا ، لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ هۆی تر هەبوون کە هەم کارەکەیان پێش ئەخست‌و هەم کۆسپیشیان ئەخستە ڕێ ، لەم هۆیانەش مەسەلەی کوشتنی عثمان بوو بەڵام هۆی سەرەکی کەمەسەلەی دارایی‌بوو نەهاتە دی . (١٦)

موسوڵمانەکان ئەوانە کە لە وڵاتە دوورەکاندا وەك عیراق غەزایان لەڕێی خوادا ئەکرد بۆیان دەرکەوتبوو زانیبویان (قورەیشی‌یەکان چ سامان‌و دارای‌یەکیان دەسگیر بووە لەبەر ئەوەشی کە مەسەلەی

تیرەگەرێتی لە نێواندا هەبووە [illegible] ناکۆکی نێوان معزو ربیعە) بەتەواوی بێزاربوون .

ئەمە لەلایەك لەلایەکی تر دابەش‌کردنی ناوچەش هەبوو خەلافەت کە لە ڕووی ئابووری‌و سیاسیەوە گەیشتبووە ئەوپەڕی پێگەیشتن‌و گەشە سەندن‌و لە مەدینەوە دەستی بۆ عیراق ئەهێناو لەوێشەوە بۆ شام . بەرهەمی ئابووری ئەم وڵاتانەش دانیشتوانی پایتەختی خەلافەت ئەیانرنیەوە .

هەروەها جەنگی صفین کە لە نێوان دوو لاداو هەر لە نەتەوەیەکدا بەرپابوو بێ‌گومان ئەبێ لایەنی سێهەمیش هەبێ کە دووربین بێ‌و بیر لەوە بکاتەوە ئەوەی کە لە هەردوو لا کوژراوە لەنەتەوەکەی خۆیەتی‌و شەڕەکەش وا لە قەڵەم ئەدەن کە ناتوانن ڕای‌وەستێنن‌و ئارام‌و ئاسایش بەرپابکەن . یەکێ لەو سێ لایەنەش علي کوری ابی طالب بوو کە لە (حسن‌و حسین)ی کوری ئەترسا لەناوبچن‌و بەرەی محمد (د.خ)نەمێنێ .

بێجگە لەمانە دەستەیەك قورئان خوێن کە لە مصرو وڵاتە دوورەکانەوە هاتبوون‌و خواپەرست بوون لەناو هەردوو سووپاکەدا هەبوون بەڵام بەزۆری لە سوپای علی‌داو ئەمانە ئایانویست کۆتایی ئەم ناکۆکی‌یەی نێوان موسوڵمانەکان بهێنرێ‌و داوای چارەسەری ئاشتیانەیان ئەکرد ئەمانەش هەر ئەوەندەیان پێ‌کرا کەمێ کوشتار ڕاگرن ئیتر شەر دەستی پێ‌کردەوە .

لەمانەش ئەوەی کە دەورێکی زور گرنگی گێڕا اشعث کوری قیسی کندی بوو شەوی هریر وتارێکی‌داو ( داوای وەستانی شەڕی‌کردوو بانگ کردنەکەشی لەرووبوو دوای دێینە سەر باسی اشعث .

بەڵام دوکتۆرە سهیر القلماوی[١٧] ئەڵێ : ئەو (شراة)تانەی بەیەك بیرواوە دورکەوتن ئەوانەبوون کە ئەیانوت (حوکم‌دان هەر بۆ خوایە) . کاتێ اشعث ڕێکەوتننامەکەی بۆ سوپاکە ئەخوێندەوە (عروەی کوری ادیەی تەمیمی) لێ‌ی ڕاپەڕی‌و بەدەنگی بەرزکەوتە ڕەخنە گرتن لەناوبژی‌یەکەو وتی : اشعث ئەم کارە نارەوایەت لەچی بۆ مەرج هەیە لە مەرجی خوای مەزن گەورەتربێ ؟ ئەمانە کەواتە بۆچی کوژران . خەڵکەکە وەك یەك کەرت لایەنی عروەی کوری ادیەیان گرت ، ئەم خەڵکەش دوور نیە بەلایانەوە وابووبێ کە علی ئەمە یاری‌بە پێیان ئەکات‌و هەرکاتێ نیازی شەڕبێ شەڕیان پێ ئەکات‌وکەی ویستیشی چەکەکانیان پێ دائەنێ‌و نابێ شەڕ بکەن ، یاخود وای تێگەیشتن کە علی شەڕەکە بۆ خواستێکی دنیای ئەکات‌و چاویشی لە خەلافەتەوەیە بەڵام بەو چاوەوە نا کە ئەم خەلافەتە مافی خۆیەتی‌و داواشی بکات ڕەوایە . خەڵکەکە بەیەك

جار هاواریان کرد (حوکم کردن هەر بۆ خوایە) . ئەلێن یەکەم شمشێر کە راوەشێنرا شمشێری (عروەی کوری ادیە) بوو بەرەو بیری اشعث ی کوری قەیس چوو پیٚ ی وت : اشعث ئەم بیٚ نامووسیە چیە ؟ ئەم ناوبژی کردنە چیە ؟ ئەبیٚ مەرجی کام‌لایەك لەمەرجی خوای گەورە بەهێزتربیٚ ؟ شمشێرەکەی راکێشاو أشعث لەبەردەمیا رای‌کردو دایهێنایەوە باشووی ولاخەکەی اشعثی کەرت کرد ، بۆ یارمەتی اشعث یەمەنی‌یەکان هێرشیان هێنا ، ئیتر احنف بەشداری مەسەلەکەی کردو داوای لە اشعث کرد کە (عروەی کوری ادیە) ببەخشیٚ‌و ئەویش بەگویٚ ی کردن .

خوشکە رمزیە عبدالوهاب دووبارە ئەوەش ئەڵێت : ناودارانی (شراة) لەگەلیٚ هۆزوو تیرە پەیدابوون‌و یەك مەبەست‌و یەك خواستیان هەبوو ، ئەم خواست‌و مەبەستەشیان گۆرانی قەوارەی دەوڵەت بوو تاوەکو لەلایەن کەسانی دڵسۆزەوە بەرێگەیەکی رەوای ئەوتۆدا بروات کە کەم‌وکورتی نەبیٚ‌و (بەلاٚم هیچ کۆمەڵەیە بیٚ‌بەشی ئەوە نیە کە هەرکەسە لەو کۆمەڵەدا مەبەستی تایبەتی خۆشی هەبیٚ) بەلاٚم هەموان ئەو باوەرەشیان هەبوو کە ئەبیٚ دەوڵەت کاری رەواو دادوەرانەبیٚ‌و ئەگەر لە گیانی پاکی موسوڵمانەتی لایدا ئەبیٚ شۆرشی دژبکریٚ‌و تەنانەت ئیمام خۆشی ئەبیٚ بەپیٚ ی ئەحکامەکانی قورئان بجوولێتەوە .

ئەم رایەشیان بەرامبەر خەلافەت زور جیٚ ی بایەخ بوو بەراستی لەگەلٚ خەلیفایەتی ابوبکرو عمردا بوون‌و سالاٚنی سەرەتای خەلافەتی عثمانیش‌دا بوون‌و تا ماوەیەکیش خەلافەتی علی‌یان بەراست زانی بەلاٚم دوایی لەسەر مەسەلەی تحکیمەکە بە هەڵەیان داناو پێیان وت کە لە هەڵەکەی پەشیمان بێتەوە .

بێزاربوون سەبارەت وبەوستەمکاری‌یەی رژێم لە دابەش کردنی داراییدا ئەیکردو کە رقی چینایەتی‌و نارەزای بەرامبەر باوەری موسوڵمانێتی درووست ئەکرد .

هەروەها ئەو عەرەبانەی کە موسوڵمانێتی بەتەواوی نەچووبووە مێشکیانەوەو بێزاربوون لەو رژێم‌و خەلافەتەی کە قورەیشی لەدەوری خۆی کۆکردبووە رانەهاتبوون ئەمانە ئەنجامێکی بەجیٚ‌یان بۆ شۆرشی هێنایە کایە .

پاشان خوشکە خیرو پەنجەش بۆ ئەوە رائەکێشیٚ کە هوی مادی‌و مەعنەویش هاتە کایەوەو ئەم هۆیەش سووربوو لەسەرئەوەی کە ئەبیٚ هەر درووست بی‌ٚو جیٚ ی خۆی گرت تاکو دەری‌بخات ئەو هێزانەی کە برەو یان بە مێژوو ئەدا رۆژێك لە رۆژان لە هێزێکی پێکهاتوو نالەباری پێویستی مادی‌و مثالی ، پێویستی مرۆڤ بەدراوو گەورەو بەستنەوەی بیریەبیرباوەر بەولاوە هیچی ترنین .

جا بۆ یەکەمجار لە مێژووی موسوڵمانانندا مل‌کەچ نەکردن کە هەبیٚ لەبەر ئەوەیە خەلیفە رێبازێکی گرتووە چ لەرووی ئاینی‌و چ لەرووی برواو چ لەرووی سیاسەتەوە لەگەلٚ بیرو باوەری ئەو نەتەوەیەدا ناگونجیٚ‌و ئەمانەش بیٚ‌گومان ئەو نەتەوەیە بوون کەوابیرو هەستی ئاینی‌و سیاسیان کاملٚ بووەو بەپیٚ ی باری ئاینی‌و سیاسی خۆیان مەسەلەی تحکیمیان لەجەنگی صفین‌دا هەڵسەنگان ئەمانە بەردی بناغەی (شراة)ن‌و ، هەر ئەمانیش بوون کەرتێکی سیاسیان نوێکارانە لە ناو موسوڵمانەکاندا پێکهێنا ، بروایان نە بە علی مابوو نە بە معاویە هەبوو ، مەبەستیان لابردنی رژێم‌و دانانی خەڵیفەیەکی دادوەربوو . ( وەك نووسەر بۆی چوە) [18] ئەم کەرتە لە ناوەراستی دەریایەك کافردا (ئەو موسوڵمانانەی کە شوارة نەبوون) خۆیان بە چاکترین مجاهدی بەرزکردنەوەی ئالاٚی ئاینی دائەنا .

بەرێز مهدی نجار دەرکەوتنی (شراة) بەسیاسەتەوە ئەبەستیٚ‌و ئەلیٚ : ئەگەر ئەو رووە ئاینی‌یە دوورخەینەوە لە (شراة) کە بە تەواوی دایپۆشیبو کە بانگەوازێکە بۆ گەرانەوە بۆسەر بیروباوەری سەرەتای موسوڵمانێتی واتە ( قورئانی پیرۆز ) دەرئەکەویٚ کە ئەو بانگەوازە تا چ رادەیەك مەسەلەی سیاسی وبزوێنەری تێکەلاٚوە ، ئەمەش نەك هەر بەلای شۆرشی (شوارة) ەوە خۆی بگرە بۆ هەموو ئەوبانگەوازی موسوڵمانێتی‌یەی کەیەك بەدوای یەکتردا وەك معتەزەلە کە هاتن . جا ئەگەر بانگەوازی موسوڵمانێتی بانگەوازێك بیٚ دژی چەوساندنەوەو دەمارگیری نەتەوەیی‌و پایە بەرزکردنەوەی هۆزێك بیٚ‌و هی هۆزێك نەبیٚ ، بانگەوازی (شراة) بانگردنێکە بۆ ئەو بانگەوازەواتە پرۆژەیەکی پێشکەوتووە — رێگەیەکە بۆ رزگاربوون لە هۆزو هۆزگەرێتی‌و چاككردنی باری ئابووری‌و نەمانی ئاغایایەتی قورەیشی‌یەکان .

شۆرشی (شراة) بێجگە لە لایەنگیروبیٚ دەرەتانەکان[19] زووربەی بریتی بوون لەو هۆزانەی کە پلەیان لەرووی ئابووری‌و کارەبەدەستی‌یەوە لە پلەی هۆزی قورەیش‌و ثقیف نزم‌تر بوون‌و لەو هۆزانە بوون کە قورەیش بە پێچەوانەی ئەو بانگەوازەی ئاینی موسوڵمانی‌یەوە کە یەکسانی‌یە لە نێوان هەموو باورەرهینەراندا بە ناوی موسوڵمانی‌یەوە ئاغایەتی ئەکردن .

دروشمی ( شراة ) لەگەلٚ راپەرینەکانیاندا دژی کاربەدەستان (واتە دەوڵەت (نەك کۆمەڵیٚ) لەسەر حسابی ئاین شتێکی هەڵکەوتوو سروشتی بوو ، کۆمەڵی چاکیشیان لا ئەو کۆمەڵە بوو کە لە هەموو کۆمەڵی پیاوچاکی زیاتر تێدابیٚ‌و نابیٚ پیاو خراپی تێدابیٚ ، شوێنی بەرزیشیان لا هی ئەو کەسە بوو : هەر وەك خوا خۆی ئەفەرمویٚ (ان اکرمکم عند الله اتقاکم)[20] کە خوای زورو بە

پ کی بپەرستایەو ئەم کەسەش دەوڵەمەندا بوایە یان هەژار عەرەب بوایە یاخود نەتەوەیەکی تر گرنگ نەبوو.

کەواتە (شراة) شتێکی نوێی نەهێنایە ناو ئاینی موسوڵمانەوە بگرە پشتی بە ڕەواو دادوەری بنەڕەتەکانی قورئان بەست.

بەڵام بەرامبەر بەو دەسەڵاتەی دەوڵەت کە ئەوسا هەبوو گەیشتنە پلەی یاخی بوونو شۆڕش بەرپاکردن، نە دەستەیەکی پەیداریان بەسەر کەسانی تردا درووست کردنە دەوڵەت تەقەللایان ودیهێنانی ئەو بیروباورە بوو کە خۆیان هەیانبوو. لەبەر ئەم شتانە لە ئەنجامدا لەبەردەمی دەوڵەتدا بوونە جێی مەترسی. حزبێکی سیاسی خاوەن بیروباوەریان پەیدا کرد، ڕێکخراوی نهێنیشیان نەبوو، سەرەتا گوییان نە ئەدایە پیلان کردنو بیروباوەڕیان سەربەستو ئاشکرابوو، کاریشیان چاکە کردنو لەخراپە دوورکەوتنەوە بوو.

بڕواشیان بەوە هەر نەبوو کە ئەبێ خەلافەت پشتاوپشت بێ.

بڕوایان بەو بیروباوەرە هەبوو کە هەیانبوو هەوڵی جێبەجێکردنیان ئەدا بێئەوەی گونجانێك لە نێوان ئەم جێبەجێکردنەو ئەو واقیعەدا هەبێ کە تێیدا جێبەجێ ئەکرێ، هەروەها نەهاتنە کایەوەی ملکەچ بوونی ئەم واقیعەش بوو بەرەو گۆران بۆ کەسانێك خوا خوایان بوو لە ریزی یەکێتی کۆمەڵو مەبەستەکانی دووڵەت بچنە دەرێ، چونکە واقیعی کۆمەڵایەتی مەوزوعیەتو تەنیا بیروباوەری روون هەمیشەو هەتاهەتایە لە پلەی دەوڵەتدا جێبەجێ ناکرێ.[21]

دوکتورە سهیر القلماوی ئەڵێ:[22] بەلای (شراة) ەوە وابوو ئەو دەستەیەی کە دەوڵەتی ئاینی بەڕێوە ئەبەن ئەبێت ئەندامەکانی موسڵمانەکان بە ئاینەوەبەستنو جیاوازیش تێیدا تەنیا بە خواپەرستیو پاکی نەبێو لە نێوان نەتەوەیەكو نەتەوەیەکی تردا جیاوازی نیەو بڕیاری ئەوە شیان داوە کە ئافرەت ئەبێ بەشداری کار بکات، لەبەر ئەوەی کە حەزیان ئەکرد لە غەزادا لە رێی خوادا شەهیدبن وا دەرئەکەوێ هەستیان بەوە کردبێ باوەڕەکەیان لەسەرزەوی بەدی نایەت

جا وەك مێژووی سیاسی (شراة) ی ناسیووە ئەوانەی سەرەتا بەردی بناغەی ئەم حزبەن. دووبارە وەك دمان ئەوکەسانەی سەبارەت بەمان نوسیویەو کولێوینییەوە هەموو گەیونەتە ئەو خاڵە کە ئەویش ئەوەیە (شراة) بیروباوەڕەکەیان بۆ کارێکی سەرەکی پاڵی پێوەناون ئەم کارەش بیرکردنەوە بووە لە نەهێشتنی سیاسەتی باڵای دەوڵەتو درووستکردنی دەوڵەتێ کە لەگەڵ ئەو ئاینەدا بگونجێ کە ئەمانە بوویانەو بە پێی سیاسەتێ کە سەرەکەکانیان مەبەستیانە بەڕێوە بڕوات.

(حوکم کردنی هەر بۆ خوایە) ئەوانەی وایان ئەوت مەبەستیان چێ بوو؟ نیازیان ئەوەبوو شەر نەوەستێ، واتە دەستیان لە لایەنگیری کردنی علی بەردا، وەك دوکتورە قەلەماوی بۆی ئەچێ، ئەمانە لەمەسەلەی (تحکیم) و هەڵسوڕاندنی جارس بووبوون – ئەم جارسبوونەش کەمیو زۆری بەپێی دەستەبوو.. دەستە هەبوو کەم دەستە هەبوو زۆر، بەڵام (شراة) لە رووی ئاینیو سیاسیەوە ریزی پێشەوەی هەموو دەستەکانیان گرتبوە، دەوڵەتیش کاروباری ئاینیو رەفتاری سیاسی بە جۆرێك تێکەڵاوکردبوو جیاکردنەوەیان لەیەك زۆر ستەمبوو. واتە خەلافەت ئەو سەرکردایەتیەی دەوڵەتی کە ئەکرد هەم ئاینی بوو هەم سیاسی چونکە تێکەڵ بوون، بەم جۆرە دەوڵەت وەك سەری ئایندارانی فاڵ کردبوو سەری سیاسەتکارانیشی هەر قاڵ کردبوو.

دوکتۆرە قەلەماوی ئەوە ئەپرسێ: ئەوانەی کەهاواریان ئەکرد حوکم کردن هەر بۆ خوایە ئایا ئەمانە کەس نەبوو حوکمیان بەڕێوەبەرێ خوا نەبێ؟. هەمووشیان ملکەچی ئە وبانگەوازەیان بوون؟ تیایاندا نەبوو لە دلاّ بەرامبەر بەعەلیو سوپاکەی خراپەی هەبێ؟ تیایاندا نەبوو پاڵپێوەنرابێ شەر لەگەڵ پیاو ماقوڵێ یان کەسێکی دەمارگیر یان شتێکی تر بکات؟.[23]

دووبارە دوکتۆرەی ناوبراو ئەیەوێ پاشەکییەکی مێژووی دەرکەوتنی (شراة) دەرخاتو بۆ ئەم مەبەستە ئەپرسێ:

ئەو نرکەیەی کە ئەیانکرد چێی دەرئەبڕی؟ وەڵامی ئەم پرسیارە ئەداتەوەو ئەڵێ: (ملکەچ نەکردنە بۆ خەلافەت ئەمەش خاوەنەکەی بیروباوەڕێکی هەیەو بەتەواوی ئیمانی پێیەتیو ئەم باوەڕەش ئەوەیە کە خەلیفە هەڵەی کردووە. جا ئەگەر بێتو وردبینەوە لە رووداوەکانی صفینوحرقوصیو تورەبوونو راپەڕینی ابی ذر الغفاری هاورێو دژی عثمانو لەو شۆڕشەدا کە دژی عثمان بەرپا کراو لەو جیابوونەوەی خەڵکە لە علی ئەنجامی شەڕی جمل وەڵامی ئەو پرسیارەی سەرەوەمان دەس ناکەوێ؟

ئایا رووداوەکانی مەسەلەی (تحکیم) لە صفیندا چەند بارە بوونەوە یاخود درێژەپێدانی ئەو رووداوانە نیە؟ ئەگەر خۆمان نەخەڵەتێنین ئەبێ دان بەوەدا بێین کەزۆر لەیەك ئەچنو بەڵام رووداوەکانی صفین هەنگاوێکی تازەتر بووو لە هەنگاوی سروشتی دەرچوو بوو هەنگاوانی خاوەنی بیروباوەر؟

ئەم هەڵگری بیروباوەرە تازەیەی صفین کاری تەنیا بەرهەڵستی سیاسی یاخود بێزاری دەربڕین نەبووە بەرامبەر رژێی درووست کراو، هەروەها دەربڕینی ئەو رایەش نەبووە کە ئەبوایە دەربڕرێو شتێکیشی لەم رووداوە سروشتیانە نەبووە کە لە هەموو چەرخێکدا بەهێزو پێگەیشتو بووە. بگرە راپەڕینێکی روونو ئاشکرایە دژی

خەلیفە . ئەمەش لەبەر ئەوەی کە لە رووی ئاینەوە لە لایەك خەلیفە بە خەلیفەیەکی رەوا نازانێ و دەربرینی یاخی بوونەکەیشان دژی علی و گرتنی رێبازێکی سیاسی ئەوتۆ کە لەگەڵ ئەو باوەریاندا باش ئەگونجێ . لابردنێکی سیاسیانەی خەلیفەبوو کە کەمجار لە مێژووی موسوڵمانانندا بەرامبەر بەخەلافەت بکرێت .

دوکتۆر محمود اسماعیل عبد الرزاق[24] سەبارەت دروستبوونی (شراة)و ئەو دۆخەی کە پاڵی پێوە ناو بۆ بەربەستکردنی راو ئینجا چوونە ناو شەری صفین‌دا نووسینێکی هەیە بە ناوی (خەوارجەکان لە ولاتی مەغرب) . ئێمە لەم نووسینەماندا پشت بەم نوسینەی سەرەوە ئەبەستین بە تایبەتی ئەوەی کە زۆر قوڵبوونەوەی تێدایەو کەڵکی هەیە .

بەلای مێژوونووسانی دەستە ئاینییەکانی موسوڵمانانەوە ، هەرکەسێ سەرپێچی دژی خەلیفە یاخود ئیمام کردبێ . با ئەو سەرپێچیەش سەردەمی خەلیفەکانی راشدین یان دوای ئەوان کرابێ[25] . بەسەرپێچی یەکیان لەقەڵەم داوە کە دژی رای ئەو موسوڵمانانەیە کە خەلیفە یاخود ئیمامیان هەڵبژاردووە . ئەم شیکردنەوەیەش بەپێی زمان • پڕ بە پێستی ئەو ناونانە نیە کەوا لە کۆمەڵێك یاخود لەدەستەیەکی موسوڵمان . یان پارتێکی سیاسی دەستنیشان کراو ئەنرێت . چوونکە شانبەشانی (شراة) دەستەو پارتی تر هەبوون سەرپێچ . دژی خەلیفەو ئیمامەکان کردبێ .

مێژوونووسەکان بۆ ئەوە چوون (شراة) ئەو پەری لایەنگرتنی لابردنی خەلیفەو تۆڵە سەندنەوەیان بەرامبەر دەوڵەت گرتووە ئەمەش زمانی حاڵی ئەو هۆزە عەرەبانە بوو کە قوریش نەبوون .
[26] . هەروەها ئەو بزوتنەوەیەی کە هەیانبوو خۆی لە خۆیدا شۆرشێك بوو دژی ئەرستۆکراتیەتی شیوکراتی نوێی سەحابە گەورەکان [27] . لەبەر ئەوە (شراة) وەك رۆژهەڵاتناس و هەندێ مێژوونووس زانیویانە (هاوکۆماری موسوڵمانەکان و (هاودەستوری موسوڵمانەکان) [28]

کاتێك کە مەسەلەی ئابووری کۆمەلایەتی هاتە کایەوە راپەرینێکی بە (شراة) ی عەرەبی بیابان پەیدا کرد ، ئەوانەی کە سەرەتای غەزای موسوڵمانەکان هاتە کوفەو بەصرەوە .
ئەوانەو – بەتایبەتی ئەوانەشی کە لە هۆزی تەمیم بوون و لەگەڵیان بوون ئەوپەری هەژار بوون ، لەسایەی مۆسوڵمانێتیشدا هەروا مانەوە ، هۆزی تریش هەبوون دارایی و رابواردنێکی نایابیان هەبوو . لەبەر ئەوە هۆزە هەژارەکان کە ئەم جیاوازییەیان ئەبینی زۆر زۆر رقیان هەڵئەستا ، ئەم رق هەڵسانە شیان لە شۆرشەکانیاندا وای لێئەکردن زیاتر دەست بە نەریت و سروشتی دەوارنشینی خۆیانەوە وەك دەمارگیری و هۆزگەرییەوە بگرن . رقیان لە حکومەتی سیاسی بوو . بەشێوەی ژیانی کۆمەلایەتی یاخی بوون و لەسایەیدا شۆرشەکەیان دژی سیاسەتی دەوڵەت بەرپا ئەکرد .

بێجگە لەم دوو لایەنەی لێیان دواین لایەنی سێیەمیش هەیە کە هەردوو رێبازەکە کۆنەکاتەوە . ئەویش ئەوەیە دەوار نیشینەکانی تەمیمی لەناو ئەو هۆزانەدا هەستی یاخی بوون لە خەلافەتی ئەو سەردەمە لەمێشکیا بڵێسەی سەندبوو ئارەزووی خەلافەتێکی نوێی ئەوتۆیان ئەکرد کە بەپێی دڵی ئەو عەرەبانە بجووڵێتەوە کە خەڵکی حجاز نین و دوورکەونەوە لە کرنۆش بردن بۆقورەیشییەکان .

بەڵام بزوتنەوەی (شراة) تەنیا لە چوارچێوەی هۆزی تەمیمدا نەبوو ، (شراة) سەرەتا تەمیمی بوون . لەناو هۆزەکانی تری وەك (بکر ، همدان ، اوزدو) و هیکەشدا هەبوون [29] .

هەرچەندە (شراة) ە سەرەتاییەکان تەمیمی بوون لەگەڵ وەشدا لەناو تەمیمدا هەبوون کە بەرهەڵستکاریان بکەن و هەڵوێستێکی دوژمنانەیان بەرامبەریان هەبوو تەنانەت دەستی نووندیشیان لەسەرکردەکانی (شراة) وەشان کە هاوخوێنی خۆیان بوون . لەم سەرکردانەش کە بەدەستی تەمیمەکان کوژران . ابا بلال مرداسی بوو کە بەدەستی عبادە کوری علقمە کوژرا و قطری بوو کە براکەی خۆی حرموزی کوری فجاءە کوشتی و [30] مستوردی کوری علقمەبوو لەو بزوتنەوەیەدا کە خۆی درووستی کردبوو بە دەستی معقلی کوری قیسی ریاحی کوژرا[31] ئەم کارەش ئەوەمان بۆدەرئەخات کە لای (شراة) باوەرەکەیان بەهێزەترەو دەسەلاتی چاکتر ئەروا لەگیانی دەمارگیری و[32] لەوەپێش تا رادەیەك ئەم لایەنەمان روون کردەوەو وتمان لەوانە عەرەب نەبوون و لەنەوەکانی تربوون تێکەڵی بیروباوەرەکەیان بوون .

لەگەڵ ئەوەشدا (ئامانجی سیاسی) – بۆ خۆی – محیوەری گورج و گۆڵی و خواست و مەبەستیان نەبووە : لەم رووەشەوە – ابن خلدون – بۆمان ئەگێرێتە وەو ئەڵێ : هەرچەندە بۆ سووك کردن و نەهێشتنی (شراة) هەڵوێستی توندو تیژوە رگیرا بەلام (شراة) هەستی موڵکداریێتی و سەرداریێتی و دەمارگیری و هۆزگەرێتیان لەناودا مابوو[33] .

لەبەر ئەوە ئێمە بەلامانەوە وایە کە لایەنە ئاینییەکە شوێنەوارێکی روون و ئاشکرای لەگۆرانێکی مێژوویی سەرەتای موسوڵمانێتیدا هەیەو ئەویش ئەوە بوو ئەودەمە ئاین و دەوڵەت یەك بوون ، دەستەی ئاینی لەبەشی ئاینییەوە سەریان هەڵدا : فلهاوزن کاتێ کەدێ چارەسەری مێژووی (شراة) و شیعەکان بکات لەبەر ئەوەی کە ئەم مێژووە مێژووی پارتە سیاسیە ئاینییەکانە زیرەکانە بۆ

ئەم لایەنە چووە .[٣٤] هەروەها برنارد لویس ئەویش دووپاتی ئەوە ئەکاتەوە ، مێژووی موسوڵمانێتی تا سەردەمی ئەمەوی‌یەکان لەناوڕۆکدا مێژووی (بزوتنەوەی سیاسی ئاینی) یە[٣٥] . دیسانەوە طه حسین کە باسی (الفتنە الکبری) ئەکات ئەمیش هەروای بۆ روون بۆتەوەو ئەڵێ :

(کۆنەکان سەرنجی هەموو رووداوێکیان داوە لەوانەش خەوشی عثمان بووە ، جا ئەمانە لایەنگری بووبن یان دوژمنی وابوون) . ئەمەش نیشانەی ئەوە نیە وەك لایەنە ناکۆکەمان بۆ بەکافرکردنی یەکتری‌و تاوانبار کردنی یەکتر بەدەرپەڕیو یاخود تیژڕەو پشتیان پێ بەستبوو هەموو گیروگرفتێکی سیاسی سەردەمی خەلیفەکانی راشدین بەچاوی ئاینییەوە تەماشا کرابێ[٣٦] .

مەسەلەکە – واتەمەسەلەی کفرو ئاین پاشان بوە دایکی ئەو مەسەلانەی هەموو لایەنە موسوڵمانەکان چارەسەریان ئەکرد .

ناکۆکییەکەش لەو جیاوازیانەدا چووە دەرێ کە لە نێوان لایەنە موسوڵمانەکاندا پەیدا ئەبوون ، مەسەلەکە مەسەلەی ئیمامەت‌و خەلافەت بوو . . چونکە کاتێ کە پێغەمبەر (د . خ) کۆچی دوایی کرد رژێمێکی چەسپاوی دەستنیشان کراوی دانەنا بوو بۆ ئەوەی کەدوای خۆی ئەبێ کێ کارو فرمانی موسوڵمانەکان بەرێوە بەرێ . (پاشان ئەو گیرگرفتانەش ئەنجامی ئەم کۆچ کردنە روویاندا باسیان ئەکەین) بەڵام نابێ ئەوە لەبیر بکەین کە بە چاوی هۆزایەتییەوە تەماشا کردن‌و چنوکی تایبەت یارمەتدەری ئەو گیروگرفتانەبوون بێنە کایەوە گەرچی بە شێوەیەکی گشتیش رووبەکی ئاینی گەشیان هەبوو .

موسوڵمانەکانیش هەوڵی ئەوەیاندا کە بە قورئان‌و لەرێی ئاینییەوە لەگفتوگۆ کردن‌و دەمەتەقێ کردندا پێش بکەون ، لێرەوە رێرەوی جۆراوجۆر پەیدابوون‌و بوونە دەستە دەستە هەر لایەنە وای لە قەڵەم ئەدا کە بۆچوونەکەی ونەکەی خۆی راستەو ئەنجامی ئەمەش دەرکەوتنی دەستەکانی موسوڵمانان بوو جیاوازیشیان (تەقەللادانی زیاتر بوو لە کاروباری ئاینی‌و بیردا)[٣٧] . زۆری نەخایاند ئەم جیاوازیە بووە زۆرانبازییەکی خوێناوی‌و شهرستانی لەم رووەوە ئەڵێ : (گەورەترین جیاوازی لەناو خەڵکەکەدا جیاوازی بوو لەسەر ئیمامەت شمشێر بە بنەرەتێکی ئاینی هەڵئەکێشراو بەرامبەر بە ئیمامەت رائەوشێزا)[٣٨]

لەسەر ئەم بنەرەتە ئەبینین دەرکەوتنی (شراة) بەستراوە بە گیروگرفتی ئیمامەت‌و تەقەللادان لەدەوری ئەو ئیمامەتەو دوژمنەکانیان چۆن تەماشای یەکێکیان ئەکرد بیەوێ بگاتە راستی بەڵام هەڵەی کرد واتە . ماشای (شراة) یان ئەکردو[٣٩] نەشیان ئەتوانی نکولی چاکی مەبەست‌و خواست‌و راستی‌و پاکی باوەڕیان بکەن کەئەبوایە بمردنانایەو لێیان لا نەدا نایە . (ئەوەی کە دوژمنەکانیان بۆیان ئەمایەوە تەماشا کردن بوو لێوردبوونەوە بوو ، چاوداچەقاوی بوو ئارەزووی هێنانەوەی بەڵگەیەك بوو کە وەك لەناوبردن بێ وابوو)[٤٠] .

تەنانەت زانایەکی وەکو ابن عباس لە نەهرەوان کەگفتوگۆ لەگەڵ (شراة) یکدا ئەکات هەر بەڵگەی ئەوەی نەدایە کە هەڵوێستی علی راستبووە بگرە ئامۆزاو زاوای ئەو پێغەمبەرەیە (د . خ) کە قورئانی بۆهاتۆتە خواری‌و ئەزانی قورئان شی بکاتەوە[٤١] .

هەروەها علی خۆشی پێش ئەوەی بمرێ چاکی مەبەستی (شراة) دەرئەخات‌و داوا ئەکات کە ئیتر نابێ شەریان لەگەڵدا بکرێ چونکە ئەوەی داوای راستی کردبێ‌و هەڵەی کردبێ وەك ئەوە وا نیە داوای خراپەی کردبێ‌و هەستی پێ کردبێ)[٤٢] . لێرەدا علی لە لایەنە ئاینییەکانی کەم نەکردۆتەوە بەڵام هێرشێکی بردۆتە سەر راپەراندنی خواستەکانیان‌و ئەمەش بەرپەرچدانەوەی (شراة) ە کانە بووبن ، شتێکیش کە هەیانێ سووربوون‌و دەستوند کرتنە بە باوەرەکەیانەوەو وەدیهێنانی خواستەکانیانە .

گومان لەوەدا سەرهەڵدانی کۆمەڵانی سیاسی لە ناو موسوڵمانەکاندا ئەگەڕێتەوە بۆ ئەو جیاوازی‌یە زانستی‌یە لە ئاینەکەدا هەبوون ،[٤٣] دەرکەوتنی (شراة)یش لەو بنەرەتە بەدەر نەبوو ، هەروەها مەسەلەی ناوبژی کردنەکەی علی‌و معاویە چۆن بووە هۆی دەرکەوتنی (شراة) هۆیەکی تریش لە مەسەلە زانستی‌یەکەی ئایندا تەواو خۆی مەڵاس دابوو کە ئەویش ئەوەبوو ئایا ئیمامێك مافی دانپێدانان‌و لایەنگرتنی درابێتێ رێی ئەوەی هەیە ئادەمیزاد (تحکیم)ی بۆبکات ؟ وەڵامی ئەوانەی کە لەم دواییەدا لە (شراة) گەیشتن (نەخێربوو) . ئیتر هاتن لە علی جیابوونەوەو معاویەیان بەکافر داناو علی شیان بەکافر لەقەڵەمدا . دوژمنایەتیشیان لەگەڵ دوژمنەکانیدا لەسەر ئەو ناکۆکیەبوو کە لە رێی شەریعەت لایانداوەو دەرکەوتنیشیان لەگەڵێ رووداوە لەسەر ئەوە بوو کە راستی ئەبێ بگەرێنرێتەوە رێ‌وشوێنی خوی .

لێکۆڵەوەران لەوەدا یەکیان گرتۆتەوە کە بەدواچوونی دروست بوونی (شراة شتێکی نارەحەتەو مێژوو نووسی ئەو سەردەمەش رەقترین‌و ناخۆشترین تاقی‌کردنەوەی بووە[٤٤] ناروحەتی‌یەکەشی لەوەدا نی‌یە کە زانیاری لەم رووەوە کەمێ بگرە لەو دەسکاری‌و شێواندنەدایە کە بەئارەزووی خۆ توانرا یەکی بویسترێ تاوانبار بکرێ‌و کێ نەویسترێ تاوانباری نەکات‌و لەهەردوو لایەنەکەشداو

هەرچیەکی بەشی مەبەست بێ هەیە . ئەمیش پێچەوانەی رووناك کردنەوەی دەورو بەرو ناوەرۆکی ئەو ناکۆکی‌یەیان بووە کە هەموویان وەك باوەرێك توند دەستیان پێوە گرتووەو لەو خەباتەیدا کە کردوویەتی خۆی لەرێی ئەو مەبەستەدا بەکوشت ئەدا کەبەلایەوە راست‌بووە .

علی کوری ابی طالب دوای کۆچی دوای پێغەمبەر ( د.خ) گومانی لەوەدانبوو کە مافی ئەوەی هەیە ببێتە خەلیفەو شایەنی ئەوەیە ، بۆ دەرخستنی ئەم مافە رەوایەو بۆ گردکردنەوەی خەلکی هات پشتی بە حەدیسەکانی پێغەمبەر (د.خ) بەست(٤٥) ئەبێ ئەوەش بزانین کە لە سەحابە گەورەکاندا علی دواکەس‌بوو دەنگی بۆ ابوبکر دا ببێتە خەلیفە .

کە خەلافەت لە ابوبکرەوە هاتە سەر عمر لەرقدا بێ‌دەنگ بوو دەنگی نەدا بەلام دەنگی بو عثماندا .(٤٦) دوای کوشتنی عثمان خەلافەت بەو دراو معاویەی کوری ابو سفیان لی‌ی راست‌بووەوەو داوای ئەوانەی لە علی کرد کەوا عثمانیان کوشتووەو لە ئەنجامدا ئەوەبوو کە بەناوبانگترین شەر لە صفین روویداو لەو ناکۆکی‌یەی نیوان علی‌و معاویەدا (شراة) وەك پارتێکی سیاسی خاوەن بیروباوەرو بەرهەلستکاری شیعەو عثمان دەرکەوتن‌و ئەم لادانەشیان بۆ راستی خواستن‌و حساب بۆ خوا کردن بوو .

راستە کە گومان لەوەدا نیە هەموو حزبێك ویستوویەتی بەو بەلگەو نیشانانە خۆی بپەرێنێتەوەو بەهێز بکات کە بەروونی لە قورئان‌و ئاینی موسولماناندا هەن . بەلام گومان لەوە ئەکرێ کە مێژوونووسانی تیرەیەك لەو تیرانە تاوان‌و هەلەی خۆی دەرخستبێ‌و سەرو گوێلاکی دوژمنەکەی یان نەویستێکی نەکوتابێتەوە . سەرچاوە سونی‌و شیعەکانیش بەپان‌و درێژی لەهەموو رووداوەکانی جەنگی صفین علی‌یان پەراندوەتەوەو پاکیان نیشان‌داوە . بەلام لێرەدا دوو گێرانەوە هەیە کە بە بایەخیان هەبێ ، یەکێکیان هی ابی مخنف‌ەو ئەوتریان هی نصر کوری مزاحی منتصریە . لەگەل ئەوەشدا نابێ ئەوەمان لەبیر بچێتەوە ئەو گێرراوانەو ئەو بۆچوونانەی کە زوریان پەیوەندیان بەم مەسەلەیەی سەرەوە هەیە ، مێژوویەکن‌و سەردەمی عەباسیەکان نووسراوەتەوەو لێیان کۆلراوەتەوە . ئێمەش لەناو ئەمانەدا لەسەر نووسینەکەی بلاذری ئەرۆین کە ئەلێ : ئەگەر سەرچاوە سونی‌و شیعەکان هێرش ببەنە سەر بەنی ئومەیەو هەوالەکانیان بەدرۆ بخەنەوە ، هێرشەکانیان بەرامبەر (شراة) زور دل رەقانەو توندترو بەهێزتر بوو پێیان ئەوتن ئەوانە کافرو بێ ئیمانن‌و ئەبێ پارچەپارچە بکرین چونکە ئەوان بوون بەهۆی ئەوەی علی پەشیمان بێتەوەو دوابێ ناچاربێ خوی پاکاتەوە .(٤٧)

گێرانەوە هاوچەرخەکان لە نووسینە هەمە چەشنەکانیدا نەهاتوون باسی باوەرو رێ‌رەوو کاری چینی ناوداری (شراة) بکەن‌و لەوەش نادوێن کە بۆچوونەکانی (شراة) چی‌بووە (٤٨) . ابن ندیم لە فەهرستەکەیدا ئەئەلێ : نووسینەکانی (شراة) بەدەستی دوژمنەکانیان لەناوچوون‌و سووتێنران ، لەو گێرراوانەدا ئەوەی لەم دوای‌یەدا پێمان گەیشت ئەوەیە کە بە (المحكمة الأولى) ناسراوەو تاوان‌و ئەنجامی (تحکیم) ئەخاتە ئەستۆی علی‌و باسی بێ‌دەسەلاتی‌و لاوازی ئەکات . بەم جۆرە لە گێرانەوەکاندا ئەبینین نزیك‌بوونەوەیەکی گەش‌و تێکەلاو بوونێکی زور هەیە بەرامبەر رووداوێکی مەترسیداری سەرەتای موسولمانێتی کە (ئەویش مەسەلەی (تحکیم) ە .

(جا ئەگەر هاتو سەرهەلدانی (شراة) پەیوەندی بەو کارەوە هەبێ . ئەواتە قەللادانی پشکنینکار بۆ دۆزینەوەی شێوازی (شراة) ئەبێ بەجورێك بێ هەلوێستی ئەوکەسانە بزانی کە لە دەرروونی موسولماناندا پایەیەکی تایبەتیان هەبووەو ئەم هەلوێستەش راست‌و رەوان دەربخات . ئەوەش ئاشکرایە کە پشکنینکار ئەگەر بێت‌و بەرنامەیەك رێکبخا بە نیازی چاوپوشی نەکردن لەپایەی ئەوانەی بەشداری مەسەلەی (تحکیم)ەکەیان کردووەو لەناو جەرگەی ئەو گێرراوانە پرناکۆکی‌یەدا راستی بدۆزێتەوەو لێ لانەدا تووشی ماندووبوونێکی زور ئەبێ . چونکە دەرخستنی راستی یەکەو (هەندێك رایان وایە) رێك‌وپێك کردنی لەپایەو شوێنی ئەوکەسانە مەزنتی ئەبێ .

بەلام مێژوونووسان کۆن‌و نوێ مەسەلەی (تحکیم) لایان هەردەمەتەقێ بووەو سەرگوزەشتەکەش کەپشتاو پشت هاتۆتە خوارێ‌و گێرراوەتەوەو خۆشی هی‌سەرەتای موسولمانێتی‌یە وا هاتوو ە کە راستی‌یەکە نابێ دەربخرێ‌و گومانیش نابێ لە گێرراوەکانی (ابی مخنف‌و منقری‌و طبری) بکرێ‌و ئەبێ بەراست بزانرێ کە بوونەتە سەرچاوە . کەچی (ابن عربی)(٤٩) لەم رووەوە ئەلێ : ئەم کارانە هەموویان درۆن‌و درۆکانیش روونن‌و یەکێك بووە گوستاخانە هەرچی راستی‌یەکیان تێدابووە کردوونی بەمێژووی دەسەلاتدارەکان .

ئەم هەستی گومان کردنە لەدەمەتەقێ‌و گفت‌وگۆی نێوان (شراة)و شیعەکاندا کە زۆری خایاندوە نووسراوەتەوە ئەبینرێ‌و ئەو رێبازەش کە بۆ ئەو مێژوو درووست‌کردنەو دەست لێوەردراوە گیراوە لای پشکنیکارێکی وەك یولیوس فلهاوزنو (٥٠) فلیب حتی ئەدۆزرێتەوە .

— ماوێتی —

١ - رمزية عبدالوهاب الخيرو : ادارة العراق في عهد زياد ل ٢٦٦- . ٢٦٩ .
٢ Smith: the Ibadites. Muslim World ol.. 2. P. 284
٣ Spanish Islam P. 39
٤ - ابن قتيبة : الأمامة والسياسة بەرگی (٢) ل ٢٢٤
٥ - ابن قتيبة : هەر ئەو سەرچاوەیە
٦ - رمزية عبدالوهاب الخيرو : هەر ئەو سەرچاوەیە
٧ - الشهرستانی : الملل والنحل
٨ - الدكتور احمد امين : ضحى الأسلام بەرگی (٣)ل ٣٣
٩ - الدكتور عزمي الصالحي : الشاعر الخارجي الطرماح بن حكيم الطائي بغداد - جامعة بغداد ١٩٦٦
١٠ - الدكتور عزمي الصالحي : هەر ئەو سەرچاوەیە
١١ - الدكتور عزمي الصالحي : هەر ئەو سەرچاوەیە
١٢ - الدكتور عزمي الصالحي : هەر ئەو سەرچاوەیە
١٣ - الدكتور عزمي الصالحي : هەر ئەو سەرچاوەیە
١٤ الدكتور عزمي الصالحي : هەر ئەو سەرچاوەیە
١٥ - رمزية عبدالوهاب - هەر ئەو سەرچاوەیە
١٦ - رمزية عبدالوهاب - هەر ئەو سەرچاوەیە
١٧ - سهير القلماوي - ادب الخوارج في العصر الأموي المقدمة ص ٥
١٨ - رمزية عبدالوهاب - هەر ئەو سەرچاوەیە
١٩ - النجار ، مهدي : (من تراثنا القومي مجلة الثقافة ، العدد السابع ، تموز ١٩٧٣ ل ٣٦ - ٣٨
٢٠ - النجار ، مهدي : هەر ئەو سەرچاوەیە
٢١ - النجار ، مهدي : هەر ئەو سەرچاوەیە
٢٢ - دوكتورة سهير القلماوي - هەر ئەو سەرچاوەیە
٢٣ - دوكتورة سهير القلماوي هەر ئەو سەرچاوەیە
٢٤ - دوكتور محمود اسماعيل - جدول حول الخوارج وقضية التحكيم - المجلة التأريخية المصرية ، م ٢٠ . ١٩٧٣ القاهرة الجمعية المصرية للدراسات التأريخية ل ٤٧ ٦٩
٢٥ - دوكتور محمود اسماعيل - هەر ئەو سەرچاوەیە
٢٦ - Muir . W: The Caliphate , itrrise. decline and fall. P. 281 .
٢٧ - سهير القلماوي - هەر ئەو سەرچاوەیە .
٢٨ iquet . F Hietaire del Afrique Septen trio male Sous Ladominattion Musulmane P. 35.
٢٩ - Smith . OP. P. 279
٣٠ الطبري : تأريخ الأمم والملوك ل ٥١٦
ابن خلدون : العبر بەرگی (٣) ل ١٤٥
٣١ - ابن حزم : جمهرة انساب العرب ل ٣٦٤
الدينوري : اخبار العراق ل ١٩٧
٣٢ - فلهاوزن : تأريخ الدولة العربية ل ٧٨
٣٣ ابن حزم : هەر ئەو سەرچاوەیە ل ٢٠٠ ، ٢٠١ ، ١٨٩
٣٤ ابن خلدون : المقدمة بەرگی (٢) ل ٦٩
٣٥ - فلهاوزن : احزاب المعارضة السياسية الدينية في صدر الأسلام
٣٦ برنارد لويس : اصول الأسماعيلية ، المقدمة ل ٥
٣٧ طه حسين : الفتنة الكبرى بەرگی یەك
٣٨ - احمد امين : هەر ئەو سەرچاوەیە
٣٩ - احمد امين : هەر ئەو سەرچاوەیە
٤٠ - احمد امين : هەر ئەو سەرچاوەیە
٤١ الشهرستاني : الملل والنحل
٤٢ ابن حيون : شرح الأخبار دەستنووس ل ٩٦ ، ٩٨ .
٤٣ - الجعفر بن عبدالسلام : ابانة المناهج في نصيحة الخوارج دەستنووس ل ١٥٤
٤٤ - ابن حيون : هەر ئەو سەرچاوەیە
٤٥ - سهير القلماوي : هەر ئەو سەرچاوەیە -
٤٦ - فهاوزن : تأريخ الدولة العربية ل (١)
٤٧ - سهير القلماوي : هەر ئەو سەرچاوەیە
٤٨ - ابن حيون : اساس التأويل الباطني ، دەستنووس ل ١٨٨ ، ١٨٩ ١٩٤ .
٤٩ - طه حسين : هەر ئەو سەرچاوەیە .
٥٠ - فهاوزن : تأريخ الدولة العربية - المقدمة ص ا ت ، ذ

# «چەند سەرنجێکی زمانەوانی دەربارەی کتێبی ڕێزمانی کوردی»

محمد احمد سعيد

لەم چەندانەدا کتێبێکی گەورەو بەنرخ لەلا مامۆستا «د. ئەورەحمانی حاجی مارف»ەوە بلاوکرایەوە. لەژێر ناونیشانی ڕێزمانی کوردی «مۆرفۆلۆژی» دا[1].

گومانی تیانیە کە کتێبێکی وا بە کەڵک و بەسود، ئەرکێکی گران‌و ماندووبوونێکی یەکجار زۆری ویستوە، بەتایبەتی لەبارەی بابەتێکی وا کەم وێنەو بەنرخەوە. کە قووڵبوونەوەیەکی فراوان‌و لێکۆڵینەوەیەکی زانستانەی بەشی ئەوێ.

ئاشکرایە کە ئەم کارەش بۆ نووسەرەکەی جێی شانازی‌و ڕێزە. وە خزمەتێکی گەورەو نایابە بۆ زمانەکەمان‌و تۆژینەوەی زانستی‌و گەشەسەندنی.

نایابی‌و لایەنی چاکەشی لەوەدایە کە مامۆستا د. ئەورەحمان زۆر سەرکەوتوانە بۆ زۆربەی ئەو نهێنی‌یە شاراوانەی زمانەکەمان چووە، کە کەم کەس لەمەوبەر لێی کۆڵیوەتەوە. وە کەڵکێکی زۆریشی لە کەرەستەی فۆلکلۆرو ووشە ڕەسەنەکانی زمانی کوردی وەرگرتوە بەتایبەتی لە هێنانەوەی زۆربەی نموونەکاندا چ ووشە، چ ڕستە بێ، وە بەکارهێنانی شیعری شاعیرە کۆن‌و تازەکانمان، کە ئەمەش بەلای منەوە قووڵبوونەوەیەکی زۆر ووردو کەم وێنەیە لە ڕووی زمان‌و ڕێزمانەوە.

ئومێدەوارم مامۆستای ناوبراو لە تەواوکردنی بەرنامەکەی‌و پێشکەش‌کردنی جۆرەها بابەتی وا بەکەڵك‌و مەزن درێغی نەکات، هیوای سەرکەوتنی لەو ڕێبازەدا بۆ ئەخوازم. جا منیش هەندێ وورده سەرنج‌و تێبینیم لەمەڕ ئەو کارەی مامۆستاوە هەیە کە ئەبووایە یادداشتیانی بکردایە، وە بە پێویستیم زانی کە بەم چەند سەرنجانەی خوارەوە هەندێ ڕووی بابەتەکە هەڵسەنگێنم‌و ڕوونیان بکەمەوە.

١ – لە لاپەڕە (٩٣)دا پێناسەی ناوی بەم جۆرە کردووە:

ناو: ئەو ووشەیەیە کە ناوی گیاندارێك یان بێ‌گیانێك یان بیرێك یان کارێك دیاری ئەکات وەك: ژن، ئازاد، ئەسپ، کۆتر، ماسی، بەرد، چیا، گوڵ، زەوی، ترێ، خەم، بروا، منداڵی، جوانی، تاریکایی، دروومان، کۆکە، کوتەك[2]..

لە پێناسەکەدا لایەنێکی تری ناوی نەپێکاوە ئەویش ئەوەیە کە ناوی شوێن‌و کات ناگرێتەوە. ئەبووایە پێناسەکەش بەم جۆرە بووایە:

ناو: ئەو ووشەیەیە کە ناوی گیاندارێك یان بێ‌گیانێك، یان بیرێك یان کارێك یان شوێنێك یان کاتێك دیاری ئەکات وەك: ژن، پیاو، ئازاد، کۆتر ئەسپ، ماسی، بەرد، چیا، گوڵ، زەوی، ترێ، خەم، تاریکایی، جوانی، منداڵی، سلێمانی، هەورامان، کوردستان، قوتابخانە، ماڵ، جێ، ڕێ، شەو، سەعات، دەم، چرکە..

٢ – لە لاپەڕە (٩٩) دا لە باسی ناوی مەعنەوی «گوزارە» دا نوسیویەتی:

ناوی مەعنەوی ناوی شتێکە کە بوونی سەربەخۆی نیە، بەڵکو لە شتی بەرهەست وەیا لە بیرو خەیاڵدا پەیدا دەبێ وەك: هۆش، بروا، خەم، شەرم، هێز، جوانی پیاوەتی، شادی..[3].

لە هێنانەوەی نموونەکانیدا ئەبوایە بەلای کەمەوە چاوگێکیشی بهێنایەتەوەو پەنجەی بۆ ئەو بابەتەش ڕابکێشایە چوونکە چاوگیش وەکو ناوی گوزارە خۆی ئەنوێنێ، وە بەر هیچ هەستێك ناکەوێ،

ـمـ ئەوە ئەبێت کە لە بیرو خەیاڵدا هەیە وەك : مردن ، هاتن ، ـژن ، کوشتن . .

٣ – لە باسی (ناو لە رووی رۆنانەوە) ، لە پێناسەی ناوی دارێژراودا نوسیوێتی :

ناوی دارێژراو ئەو ناوە ناساوەیەیە کە لە ووشەیەکی سادەو زیادی‌یەك پێکهاتبێت ئەو زیادی‌یە کە پێشگر یان پاشگر یان هەردوو پێشگرو پاشگر پێکەوەبن وەك :
کارگە ، کەمەرە ، ئاگردان ، تاریکایی ، دەسرۆکە ، بێکاری ، نەخۆشی . . هتد[٤] . ئەگەر بە ووردی لەو رووە بکۆڵینەوە ، دەرئەکەوێ کە لە رۆنانی ناو یاخود ووشەی دارێژراودا مەرج نیە لە ووشەیەکی سادەو زیادی‌یەك دروست بێت . ئێمە ووشەی دارێژراو یان ناوی دارێژراومان هەیە کە لە دوو ووشەی سادەو زیادی‌یەك پێکهاتووە وەك : رەوانبێژی ، خۆشەویستی ، سەربەستی . . هتد .

ئاوەڵناوو رەگی کردارو پاشگرێك      رەوانبێژی
ئاوەڵناوو قەدی کردار بە یارمەتی ئەنتەرفێکسی «ە»
خۆشەویست + باشگری (ی)
ناووقەدی کردار      سەربەست + پاشگری «ی»
سەربەستی

کە زۆربەی ئاوەڵناوە لێکدراوەکان ئەگرێتەوەو پاشگرێ ئەچێتە سەریان‌و ئەیانکاتە ناوی دارێژراوو ناوی گوزارەش .

جا بەو پێ‌یە مامۆستا لەوێدا ئەو رووەی یادداشت نەکردووە چونکە لە پێناسەکەیدا ووشەی سادەی بەکار بردوە ، پێناسەکەش بەم جۆرە بێ باشترە :

ناوی دارێژراو ئەو ناوە ناسادەیەیە کە لە ووشەیەك‌و زیادی‌یەك دروست ئەبێ ، ئەوجا ئەو زیادی‌یەش پێشگر یان پاشگر یان هەردوکیان بێت .

ئەگەر ووتمان ووشەیەك ئەوا ووشەی سادەو ناسادەش دەگرێتەوە ، ناسادەش لێکدراوو دارێژراو ئەگرێتەوە ، ئێمە لێرەدا مەبەستمان تەنها ووشەی ناسادەی لێکدراوە .

٤ – لە لاپەرە (١٠٧)ی کتێبەکەیدا باسی ناوی دارێژراو ئەکاو لەسەری ئەروا . لە بەشی (أ) دا کۆمەڵە پاشگری (گەر ، ساز ، دار ، بەند ، ەوان/وان ، چی ، باز ، کەر ، مەند) لە ووشەکانی ئاسنگەر ، چەخماخ‌ساز ، گیاندار ، ناڵبەند ، گاوان ، چاپچی ، کۆترباز ، نانکەر ، دەوڵەمەند ، دا بە ناوی دارێژراویانی داوەتە نوسین لە کاتێکدا کە هەموویان سیفەتێکی هەمیشەیی‌یان پێ دراوە بەهۆی ئەو پاشگرانەوە . بەواتە ئەتوانین بە ئاوەڵناوی بکەری دارێژراویان بدەینە قەڵەم ، وە زۆرتریش لایەنی سیفەتی هەمیشەیی ئەبەخشن . لەوە ئەچێ مامۆستا بیری لە هەمان ناوی بکەری «اسم الفاعل»ی عەرەبی کردبێتەوە .

هەر لە هەمان کۆمەڵە ووشەدا یان کۆمەڵە ووشەدا یان کۆمەڵە ناودا ، لە ووشەی (کۆترباز) دا رەخنەی لە کەریمی ئەیوبی‌و ئی . ئاسمیرنۆف گرتووە کە گوایە ووشەی (فێڵباز)یان بە ناو داوەتە نووسین[٥] .

کەچی خۆیشی بە پێچەوانەوە (کۆترباز)ی ئاوەڵناوی بە ناو داوەتە قەڵەم جگە لەوەش لە پێشووتردا ، سێ ساڵ لەمەوبەر بە ئاوەڵناوی داناوە ئەڵێ :

پاشگری «باز»یش بەزۆری ناوی سادە دەکاتە ئاوەڵناوی دارێژراو ، نەك ناو وەك (فێڵباز ، کۆترباز ، مێباز) جگە لە چەند ووشەیەکی کەم کە دەبنە ناو وەك «سەرباز»[٦] ئەگەر لە هەردوو ووشەی ، کۆترباز ، فێڵباز ووردبینەوە جیاوازی یەکی ئەوتۆیان لە نێواندا نابینین . وە هەردووکیان ئاوەڵناون . ئاوەڵناوی بکەری دارێژراو .

وە ئەوەشی نەپێکاوە کە «باز» رەگی چاوگی «بازیدن»ی فارسی‌یە . ئەبووایە روونی بکردایەتەوە وەك چۆن لە هەندێ پاشگرەکانی تردا ، لە پەراوێزەکاندا پەنجەی بۆ راکێشاون و سەرنجی خۆی‌و زمانناسەکانی نووسیوەتەوە .

لە زمانی کوردی‌دا (باز) چەند مانایەکی هەیە وەك «باز»ی ئاوەڵناو بە مانای رەش‌وسپی «باز» لە ووشەی «بازدان»و «سێباز»دا ، باز لە ووشەی (چاوباز)دا . بازیش وەکو پاشگر .

وە لە ووشەی «نانکەر» و «راوکەر» دا[٧] «کەر»ی بە پاشگر داوەتە نووسین . ئەگەر تۆزێ لە هەردوو ووشەکەو جۆرەها ووشەی تری وەك ئەو دووانە ووردبیینەوە . دەرئەکەوێ کە هەردووی لە رەگی چاوگی فرمانی لێکدراوی «نان‌کردن» و «راوکردن»ەوە وەرگیراوە ، ئاوەڵناوی لێوە دروست بووە . ئاوەڵناوی بکەری دارێژراو . بارەگەکان وەرگرین و لێیان کۆڵینەوە :

| | ناو | رەگ | پاشگر |
|---|---|---|---|
| نان کردن | نان | کە | ەر |
| راو کردن | راو | کە | ەر |

لێرەدا «کە» رەگی چاوگەو تەنها پاشگری «ەر»ی چووەتە سەرو ووشەیەکی دارێژراوی دروست کردووە .

بۆ سەلماندنی ئەم بیرەش ، ئێمە ئەگەر ووشەی داڕێژراو یان ناوی بکەری داڕێژراو لە ڕەگی چاوگی فرمانی سادەوە دروست بکەین وەك :

کردن بکەر دان بدەر خواردن بخۆر

ئەبینین نیشانەی «بـ» ی فرمانی داخوازی «أمر» و پیتە پاشگری «ەر» یان چوەتە سەر ئاوەڵناو یان ناوی بکەری داڕێژراومان بۆ دروست بووە ، وە لەو ئاوەڵناوە یان ناوە بکەرە داڕێژراوانەی کە لە فرمان/چاوگی لێکدراو یان داڕێژراوەوە دروست ئەبن نیشانەی «بـ» نادرکێنرێ تەنها پاشگری «ەر» وەك پاشگرێك ئەچێتە سەر ڕەگی فرمانەکەو ناوی داڕێژراو یان ئاوەڵناوی بکەری داڕێژراومان بۆ دروست ئەبێ وەك :

چاوگی لێکدراو :

نان خواردن نان+خۆ+ەر [٨]

نان کردن نان+کە+ەر [٩]

ڕەنج دان ڕەنج+دە+ەر

ڕەنج بردن ڕەنج+بە+ەر

چاوگی داڕێژراو : چێشت لێنان چێشت+لێ+نێ+ەر چێشت لێنەر [١٠]

بۆمان دەرکەوت کە «کەر» پاشگر نیە بەڵکو تەنها «ەر» پاشگرە . مامۆستا ئەورەحمان تێکەڵی ڕەگەکەی کردوە .

٥ – لە هەمان باس‌دا ، باسی ووشەی داڕێژراو ، ووشەی «هەوار»ی شوێنەواری بە پاشگر داوەتە نووسین ، «شوێنەوار» لە دوو ووشەی سادە پێکهاتووە «شوێن» ، «هەوار» . شوێن‌و هەواریش هەردوویان یەك مانا ئەبەخشن وە بۆ ئاسانکردنی درکاندنی ئەو دەنگی «هـ»ە کە لە دەنگی «ە»ەوە نزیکە ئەگەرچیش دەنگێکی کونسونانتە بەو شێوەیە ئەدرکێنرێ ، وە ووشەی هەوار لە ناوی شوێنەوار ڕاسترە لەوەی پاشگربێت ئەگەرچی لە زۆر شوێنی تردا وەك پاشگر خۆی ئەنوێنێ وەك لە ووشەی «خوێنەوار» دا . مامۆستا خوێشی لە پەراوێزی ژمارە (٦٣)ی لاپەرە (١٣١) دا پەنجەی بۆ ئەوە ڕاکێشاوە کە ئەم پاشگرە دوو چەشنی هەیە ، یەکیان بە مانای شوێن‌و جێگەو ئەوی تریان بە جۆرێکی دی خۆی ئەنوێنێ .

هەروەها لە پاشگری «ندە»ی لکاوە بەدووای ناوەوە وەك (باڵندە) وە لکاوەی دوای ئاوەڵناو یان ڕەگی فرمان وەك : (درندە) «در» هەم ئاوەڵناوەو هەم ڕەگە وە بۆ ڕەگی فرمانیش وەك «کوشندە» .

ئەو پاشگرە باسکراوە وەکو ئەو شێوەیە نی‌یە کە مامۆستا ئەورەحمان بۆی چووە بەڵکو (inde) یە وەك چۆن ئەڵێین (ik) لە ووشەی (دەسك)دا ، ئەمیش بەو شێوەیە (inde) یە ڕاسترە لە «ندە» ئەم بزوێنە کورتەی سەرەتای پاشگرەکە لە زمانی کوردی ڕێنوسی کوردی‌دا نیشانەی بۆ دانەنراوە ، چونکە ڕێنوسی کوردی بە تیپی عەرەبی ئەنوسرێتەوە وە تیپی عەرەبیش ئەو جۆرە نیشانەی تێدا نیە کە وەك «کەسرە»ی عەرەبی وایە وە لە ڕێنوسی لاتینی‌دا بە ئاسانی دەرئەکەوێ .

٦ – لەژێر ناونیشانی ئەو پاشگرانەی ئەچنە سەر کرداری سادەو دەیکەنە ناوی داڕێژراو باسی کۆمەڵێ پاشگری کردووە کە بە هەندێ ڕەگی کردارەوە ئەلکێن .

کەمیان لەرێ‌و شوێنی خۆیان دان وەك لە :

أ – کوشتار : پاشگری «ار» بە دوای فرمانی ڕابوردووەوە یان قەدی کردارەوە لکاوە نەك ڕەگی کرداری ڕابوردوو وەك لەم قەدوو ڕەگانەی تردا :

سووتەمەنی ، خواستەمەنی ، خوێندەوار ، خوێنەوار

خوێندەوار هەم قەدەو هەم ڕەگە «خوێن» ، «خوێند» .

ب – «ەر» لە ووشەی «دانەر» دا بە ڕەگی کرداری سادەوە نەلکاوە ، بەڵکو بە کردارێکی داڕێژراوەوە . چونکە چاوگی «دانان» چاوگێکی داڕێژراوە بەم پێ‌یە دروست بووە پێشگر لەگەڵ چاوگێکی سادەدا . . . دا + نان

لە زمانی کوردی دا ئەم چاوگی سادەی «نان»ە بە زۆری لەگەڵ ووشەی سادەو پێشگردا دێ ، ئەبێتە چاوگی لێکدراو داڕێژراو ، وە ڕەگەکەشی «نێ» یە ئەو پاشگری «ەر»ەش بۆ دروستکردنی ناوی بکەر یا ئاوەڵناوی بکەری داڕێژراو بەکار ئەبرێ « لەگەڵ کرداری سادەدا بێ وەك : نووسەر .

یان ناسادە ، ناسادەش بە هەردوو جۆرەکەیەوە لێکدراو وەك : ڕەنجبەر ، داڕێژراویش وەك : داهێنەر ، چێشت لێنەر ، دانەر . کە لە داهێنان‌و چێشت‌لێنان و (دانان)ەوە وەرگیراون .

لە ووشەی «دانەر»دا دوو بزوێن بە دووای یەکدا هاتووە ، بزوێنی «ێ» ی کۆتایی ڕەگی کردار وە بزوێنی «ە» ی سەرەتای پاشگری «ەر» وە لەوێدا بزوێنی «ێ» تێ ئەچێ [١١] .

٧ – هەردوو ووشەی (چیمەن‌و مەسینە) پاشگری ژمارە (٢١) ی لاپەرە (١١٨) و ژمارە (٤٦) ی لاپەرە (١٢٣) دا من وای بۆ ئەچم کە هەردووکیان ووشەیەکی سادە بن چونکە «چیم‌و مەس» بەگوێ کەم کوردا ئاشنان ، بە ووشەیەکی مانادارو سەربەخۆ

-جن . «چیمەن‌و مەسینە» بە ووشەی سادە ئەچن . وە بۆ ئەو ـشگری (نیە) ناوی «گەچینەو قوڵینە» مان هەیە کە شیاو لەبار ترن .

٨ – لەژێر ناونیشانی هەندێ پێشگریش هەن کە بەرەگی کردار ـب ناوەوە ئەلکێن و ناوی دارێژراو دروست ئەکەن[١٢] .

أ – لە پێشگری (را) داو لە ووشەی «ڕایەخ» دا ، «ەخ» وەکو ـەگی کرداری «خستن» مامەڵە ناکرێ ، ڕەگەکەش «خە»یە وەکو من جێگەکە ڕائەخەم . .

ووشەی «ڕایەخ» هێشتا لێکۆڵینەوەو ووردبوونەوەی تری ئەوێ . ئەگەر بێتو باشتر لێ‌ی ووردبینەوە ئەبینین ، وە بەتایبەتی لە «ەخ» دا دەنگەگۆڕکێ‌ی تێدایە ، دەنگی بزوێنی «ە» چووەت» چووەتە شوێنی دەنگی «خ» کۆنسونانت ، وە دەنگی «خ» ش چووەتە شوێنی «ە»و «خە» بووە بە «ەخ» وە بەلکاندنی پێشگر بە ـەگەکەو بووە بە (ڕایەخ) ، دەنگێکی تری نیمچە بزوێن هاتووەتە ـێوانیانەوە ، ئەویش چونکە دوو بزوێن بە دواوی یەکدا نایەن ، ئەگەر هاتیش ئەوا یان یەکێکیان تێ ئەچێ ، یاخود نیمچە بزوێنێك ئەچێتە نێوانیانەوە . ئەو حاڵەتە دەنگەگۆڕکێ زیاتر لە ووشەکاندا ـوو ئەدات وە زیاتر گۆڕینەکەش لە دەنگە کۆنسونانتەکاندا[١٣] .

ب – پێشگری «بەر» بە پێ‌ی بۆ چوونی مامۆستا (د. ئەورەحمان) لە ووشەی «بەرچنەو بەرکوت» دا بە هیچ جۆرێ پێشگر ـیە . وە ووشەیەکی سادەیەو مانایەکی ڕوون‌و ئاشکرای هەیە ، ـەرامبەر بە «ثمر» ی عەرەبی ئەوەستێ . بەرچنە لە چاوگی ـێکدراوی «بەرچنین»ەوە هاتووە ، ڕەگی چاوگەکە وەرگیراوە وە ـشگری «ە»ی چووەتە سەر ناوێکی دارێژراوی دروست کردووە .

«بەرچن» ئەو کەسەیە کە بەری دار یان میوە ئەچنێ وە بە ـکاندنی پاشگری «ە» مانای ووشەکەی لە ئاوەڵناوەوە بۆ ناو گۆڕیوە .

«بەرچنە» ئەو دەفرەیە کە لە تولی بارێك دروست ئەکرێ‌و میوە ـن بەری داری تێ ئەکرێ لە گەرمیاندا پێ‌ی ئەوترێ «بەرچینە» ـن «قەرتاڵە» . وە هەر لە هەمان بابەت ووشەی زۆرمان هەیە وەك «کاروان کوژە» کە دوو مانای هەیە . یەکیان ناوی ئەستێرەیەکە وە ئەویتریان جۆرە بنجکێکە لە دەرودەشت بە خۆکردی ئەڕوێ هەروەها ووشەی «کلاش چنە»ش هەیە کە ناوی جۆرە گیانەوەرێکی بچکۆڵەیە وە ووشەی «شوان خەڵەتێنە» کە جۆرە ـندەیەکەو لە شێوەی چۆلەکەدایە .

ئەمانە هەموویان پاشگری «ە»یان چووەتە سەرو بوونەتە ناوی دارێژراو . «بەر»ی ووشەی «بەرکوت» هەر هەمان مەبەستی پێشوە بەدانانی «ثمر»ی عەرەبی .

٩ – لە باسی ناوی لێکدراوداو بۆ پێکهاتنی لە ناوێکی سادەو ڕەگی کردار بەهۆی ئەنتەرفێکسەوە ، تەنها باسی ئەنتەرفێکسی «و»ی کردووە وەك «دەست‌وبرد»[١٤] «برد» قەدی کردارە یان فرمانی ڕابوردوە نەك ڕەگی کردار .

ئەگەر زیاتر بچینە ناو ووشەکانی زمانەکەمانەوەو لێ‌یان ووردبینەوە ، بۆمان دەرئەکەوێ کە ئەنتەرفێکسی «ە» شمان هەیە بۆ پێکهاتنی ناوی لێکدراو ، لەو بارەوە وەك : «تەنەشۆر . ناوو ڕەگی کرداری «شۆردن»یان «شۆرین» .

أ – تەنەشۆر : ئەو تەختەیەیە کە مردووی لەسەر ئەشۆرنەوە .

ب – گیسکەزێ /گیسکەزا : بەوگیسکە ئەوترێ کە بەگیسکی ئەزێ .

جـ – خوشکەزا ، برازا : «زا» وەکو ناویش خۆی ئەنوێنی بەمانای «منالێ» «نەوە» .

١٠ – دیسان لە دروست‌بوونی ناوی لێکدراودا ئەڵێ : لە دوو ڕەگی کردار بەیارمەتی ئەنتەرفێکسی «و»ەوە ناوی لێکدراومان بۆ پێك دێت . نموونەکانیشی «هات‌وچۆ» ، «گفت‌وگۆ»ن کە بەشی یەکەمیان قەدی کردارن‌و لە چۆنیەتی گۆڕینی دەنگی بزوێنی کۆتایی ڕەگی کرداری «چوون» نەدواوە کە «چ»بووە بە «چۆ» وە ناوە لێکدراوەکانی : ( قرچە ترچ ، ملچە ملچ ، جیرەجیر ، لوورەلوور ، گفەگف ، بۆرەبۆر ، قیژەقیژ) کە لە دووپات کردنەوەی ناوێك‌و بە یارمەتی ئەنتەرفێکسی «ە» پێکهاتوون ، مامۆستا ئەورەحمان لە پەراوێزی ژمارە «٧١»دا ئیشارەی بۆ ئەوە کردووە کە ئەگەر ناوەکە کۆتایی بە بزوێنی «ە» هاتبێت ، ئەوا لەو دوو بزوێنە ، کۆتایی‌و پێوەندی یەکێکیان تێ‌ئەچێ‌و یەکێکیان دەمێنێتەوە .[١٥]

لەم بارەوە چەند سەرنجێ هەیە :

أ – زوربەی دەنگە سروشتەکان کۆتایی‌یان بە دەنگی بزوێن دێ .

ب – لەو دوو بزوێنە نەك یەکێکیان تێ‌ئەچێ بەڵکو بزوێنی کۆتایی ناوە دووبارەکراوەکەش تێ‌ئەچێ .

جـ – لە پێکهانتی ناوی لێکدراودا بە دوو پات‌کردنەوەی ناوێك ، شێوەیەکی ترمان هەیە لەو بارەوە ، ئەویش بەبێ یارمەتی ئەنتەرفێکس . وەك : (خورخورە ، گرگرە ، شەقشەقە) ، کە تەنها بزوێنی ناوە دووبارەکراوەکە ماوەتەوە ، وە بزوێنی دوای ناوە پێشینەکەش تێ‌چووە .

ئەوەی شایانی باس بێ کە مامۆستا (د. ئەورەحمانی حاجی

مارف) کۆمەڵێ پاشگری شیاوو دیارتری وەبیرمان هێناوەتەوەو خستونێتی‌یە سەر باسەکەی ، کە لەمەوبەر نە ناویان لە ناواندا بووەو نە زماناسەکان وەبیریان دا هاتووە ، نە باسیان لێوە کردوون . ئەمەش لایەنێکی تری باشەی کردەوە زانستی‌یەکەی مامۆستایە .

تەنانەت بەوەشەوە نەوەستاوە ، چووە ماوەو بۆشایی بۆ باسەکە هێشتووەتەوە ئەلێ لە زمانی کوردی‌دا کۆمەڵێ پاشگری تر هەن ئەچنە سەر ووشەو ناوی دارێژراو دروست ئەکەن ، بەڵام ئێمە هەر ئەوەندەمان بەبیردا هاتووە . وە کۆتایی باسەکەی بە «هتد»ی هێناوە .

جامنیش حەز ئەکەم هەندێ پاشگری تر بخەمەسەر ئەو (هتد)ە وە کەلێنێکی بچکۆلەی تر پر بکەمەوە ئەویش بەم پاشگرانە کە هەندێکیان ئەچنە سەر ناوی سادەو هەندێکی تریان ئەچنە سەر ناوی لێکدراو و ناوی دارێژراو دروست ئەکەن وەك :

١ – «ەنین» لە ووشەی «نازەنین»دا .

٢ – «ینی» لە ووشەی «ماتەمینی»دا ناوی گوزارەی دروست کردووە ، ئەگەرچی ماتەم لە ووشەی «مأتم»ی عەرەبیەوە هاتووە بەڵام وای لێ‌هاتووەو شێوەیەکی کوردانەی وەرگرتووە .

٣ – «ەوانە» : لە ووشەی (کلکەوانە ، حەوتەوانە ، بنەوانە)دا کە چووەتە سەر ناوو ئاوەڵناوی ژمارەو ئاوەڵکرداری شوێن . «بنەوانە» بە مانای سەرچاوە وە هەروەها بە مانای ئافرەتێ یان کچێ خزمەتی باوکی یان برای یان مامی بکات .

٤ – «وانکە» : لە ووشەی (ملوانکە ، بەروانکە)دا

٥ – «ان» : لە ووشەی (تۆیان ، گۆلان ،قولان) زیاتر شێوەی پاشگری (ێن)ە

٦ – (کێ) : لە ووشەی (جاوشارکێ ، چاوبرکێ ، خەوەنوچکێ)دا چووتە سەر ووشەی لێکدراو ، لە ووشەی «هەڵپەرکێ»دا چووەتە سەر ووشەی دارێژراو .

٧ – «ێ» : لە ووشەی (زۆرەملێ ، ملەقوتێ ، زرمەزلێ)دا .

٨ – (تاتکێ) : لە ووشەی (سەرەتاتکێ ، ملەتاتکێ)دا .

٩ – (هەم) : لە ووشەی (بەرهەم)دا .

١٠ – (ەوێڵە) : لە ووشەی (دانەوێڵە)دا .

١١ – «یلك) : لە ووشەی (گوڵیلك)دا .

وە لە پیشگرەکانیشدا پێشگری «تێ» ئەچێتە سەر رەگی کردارو ناوی دارێژراو دروست ئەکات وەك :

«تێ» لە ووشەی «تێ‌ژەن»دا .

«تێ‌ژەن» ئەو مەشکە گەورەیەیەکەماستی تیا ئەژەنرێ .

پەراوێزەکان :

١ – دکتۆر ئەورەحمانی حاجی مارف / رێزمانی کوردی . بەرگی یەکەم (مۆرفۆلۆژی) بەشی یەکەم «ناو» . پاپخانەی کۆری . زانیاری . عیراق . بەغدا ١٩٧٩ .

٢ – هەمان سەرچاوە . لاپەرە «٩٣»

٣ – هەمان سەرچاوە . لاپەرە «٩٩»

٤ – هەمان سەرچاوە . لاپەرە «١٠٦»

٥ – هەمان سەرچاوە . لاپەرە «١٠٩» . پەراوێزی ژمارە (٢٠)

٦ – ووشەرۆنان لە زمانی کوردی‌دا . د . ئەورەحمانی حاجی مارف . چاپخانەی کۆری زانیاری کورد (١٩٧٣)

٧ – دکتۆر ئەورەحمانی حاجی مارف . رێزمانی کوردی . بەرگی‌یەکەم (مۆرفۆلۆژی) بەشی یەکەم «ناو» لاپەرە (١١٠)

٨ – لە کوردی‌دا «خۆر» رەگی کردار چاووگ ، نی‌یە بەڵکو «خۆ»یە ، «خۆر» رەگی چاوگی «خوردن»ی فارسی‌یە ، لە زۆر شوێندا مامۆستا ئەورەحمان بە رەگی «خواردن»ی کوردی داوەتە نووسین . ئەمەش وا نیە . چونکە لەو شوێنانەی کە وەکو «خۆر» دیارە ئەوا ئەو دەنگی «ر»ە سەر بە رەگی فرمانەکەنیە ، بەڵکو پاشگری «ە»ی چووەتە سەر رەگی کردارەکە «خۆ» وە بە دەنگی بزوێنی «ۆ» کۆتایی هاتووە ، وە پاشگرەکەش بە بزوێنی «ە» دەستی پی‌کردووە ، ئەوا یەکێ لە بزوێنەکان تێ‌چووە ، چونکە دوو بزوێن پێکەوە بە دوای یەکدا نایەن ، وەبزوێنی «ە» لەوێدا تێ‌چووە .

٩ – هەمان مەبەستی پێشوو .

١٠ ،١١ جاری واش هەیە کە دەنگی بزوێنی کۆتایی رەگی کردارەکە تێ‌ئەچێ .

١٢ – د . ئەورەحمانی حاجی مارف . رێزمانی کوردی . بەرگی یەکەم (مۆرفۆلۆژی) بەشی یەکەم «ناو» لاپەرە (١٣٣)

١٣ – لەم ووشانەی وەك : (تەرزە ، چەوەنەر ، وەزع) ، دەنگەگۆرکێ روو ئەدات ئەبن بە : (تەزرە ، چەنەوەر ، وەعز) تادوایی .

١٤ – رێزمانی کوردی . بەرگی یەکەم (مۆرفۆلۆژی) بەشی یەکەم (ناو) – لاپەرە (١٣٥) .

١٥ – هەمان سەرچاوە . لاپەرە (١٣٧)

١٦ – ووشە رۆنان لە زمانی کوردی‌دا لاپەرە (٨) . د . ئەورەحمانی حاجی مارف ١٩٧٧ .

نووسەری : ریجینالد وایلد
خاوەنی نووسراوانی "تەندروستی و نەخۆشی و زانستی خۆناسین" و
"خۆداناسین لە چاوی زانستی خۆناسینەوە" وهی تر
کوردی نووسی : شاکر فەتاح

- دەتەوێ خۆت بناسیت ؟
- دەتەوێ لە ژیانی رۆژانەتدا کەڵك لە زانستی خۆناسین وەربگریت ؟
- دەتەوێ بزانیت هۆشی شارراوە چۆن دەکەوێتە گەڕ ؟
- بەپەرۆشەوەیە ژیانێکی خۆشی وا رابوێریت کە شایانی خۆت بێ ؟
- بەتەنگەوەیت کە سایەتیەکی ناوازە بۆ خۆت بهێنیتە بوون ؟
- ئەگەر ئەمانەت دەوێ ئەم نووسراوە ، تا دەتوانیت بخوێنەرەوە .



## پێشەکی !

بێگومان هەمووومان حەز بەوە دەکەین کە کامەرانترو ئازاترو پایە بڵندترمان لێبێت . زانستی خۆناسین ، لە توانایی‌یدا هەیە بمانخاتە سەر ئەو ڕێگایەی کە بمانگەیێنیٚ بەو ئامانجانەمان .

کەسایەتی لە شەوو ڕۆژێکدا دروست نابیٚو لەدایك نابیٚ .

کەواتە بۆئەمەی دەروونێکی شایستە بۆ خۆمان بهێنینە بەرهەم ، پێویستە خاوەن ئارامو نیازێکی بەهێز بین . چونکە زانستی دەروونی ، خۆیشی لە توانایی‌دا نیە کە بەکەڵکی پیاوێك بێت ، سەرساردی یان بێکارەیی بەسەریدا زاڵبوویێت .

بەڵام ئەگەر ئێمە لەوانە بین کە هەرگیز وەڕس نابین‌و کۆڵ نادەن‌و تا پێیان بکریٚ تاقیکردنەوەکانیان دووبارە بکەنەوە ، بێگومان کەڵکێکی زۆر لە دۆزراوەکانی زانستی دەروونیی ئەم چەرخە وەردەگرن . ئەم زانستانە لە باریدا هەیە بمانخاتە سەر ڕێی ڕاست . دەیشتوانیٚ ئەم دەستکردە گرانەمان فێربکات ، دەستکردی دەروونی بایەخدارو بەنرخ . هەروەها دەیشتوانیٚ لە ژیانی سەرلێشێواوی ڕزگارمان بکات . ئەوەی زانستی خۆناسین لەباریدا هەیە بیکات ، تێکۆشاوم لەم نووسراوە
بچکۆلەیەدا پیشانی بدەم .

ئەوە کردەوەیەکی گەورەو دڵکێشکەرە ، کە بیەویٚ دەروونێك دابمەزرێنیٚو کەسایەتییەك دروستبکات لەسەر زەویدا هیچ فرمانێك لەوە ناوازەتر نیە ! . . هیچ شتێکیش لەوە بەکەڵك‌و فەڕتر نیە ! . . چونکە کەس نیە بتوانیٚ دەروونت لیٚ داگیربکات . بویٚ هەیە سامانت لەدەست بچیٚ ، بەهۆی مردن یاخود دوورکەوتنەوە ، دۆستەکانت لەدەست دەربچیٚ ، بۆی هەیە کە بەدوای ناوبانگك‌دا بگەڕێیت ، خۆیت لیٚ بشارێتەوە ، تەنانەت تەندروستیش هەتاسەر بۆت نەمێنێتەوە .

لە ڕاستی‌دا . ئامانە هەموویان ، تا ئەندازەیەکی گەروە ، ڕۆژگارو کارەساتی ژیان کاریان تیٚ دەکەن .

بەڵام هەرکامێك لە ئێمە بگریت ، دەتوانێت دەروونێك پەروەردەبکات هیچ کارەساتێکی ڕۆژگاریش نیە کە بتوانیٚ ئەم دەروونەمان لیٚ جیابکاتەوە . دەروون تەنیا سامانێکە کە بە کەس داگیرناکرێت . لە توانایشماندا هەیە کە تا سەرەومەرگك خەمی بخۆین‌و پەروەردەیبکەین‌و گەشەی پیٚ بکەین :

هەر ئەمەندەیش نیە . بەڵکو ئەم ڕەنج‌و تەقەللایە کە بۆ بەرهەمهێنانی دەروونێکی شایستە بە مرۆڤ ، بەخت‌دەکرێن ، لەباریاندا هەیە کە ژیان تا دوایی بە ڕازاوەیی‌و ناوازەییەوە بپارێزن . هەتاکو ئێمە لەو کۆڕی خەباتەدا بین ، لە وەڕس‌بوون و گێژەو وێژی‌و هەناسەساردی لە ژیان ، بەدوور دەبین .

لە دوو هەزارو چەند سەد ساڵێك لەمەو پێشەوە ، لە یۆنانستانی کۆن‌دا ، ٤سوکرات] چەند ووشەیەکی بەدەمدا هاتووە ، ئەوپەڕی ژیری‌و پەندو ئامۆژگاریی مرۆڤایەتی‌ی تێدا پیشانداوە :

«نامەویٚ هیچ بکەم ئەوە نەبیٚ ، کە بە گەورەو . بچووکتانەوە بتانگێڕم بە جیهان‌دا ، بۆئەمەی بیخەمە مێشکتانەوە کە لەپێش ئەمەی بیر لە لەشتان‌و سامانتان بکەنەوە . خەمی گیانتان بخۆن کە بیگەیێننە ئەوپەڕی بڵندی» .

لەپاش سیٚ سەد ساڵ ، پیاوێکی گەورەتر لە ٤سوکرات] ، ئەم پرسەی لە هاوتەمەنەکانی خۆی کرد :

«مرۆڤ چیی بۆدە مێنێتەوە ، ئەگەر بۆی هەڵکەوت هەموو جیهانی دەستبکەویٚ ، بەڵام دەروونی بدۆڕێنیٚ ؟»

دەستوورەکانی دەروون ، لە شەڕو ئاشتی‌دا وەك یەکن . کاروباری دەمدەمی نایانگۆڕیٚ . هەر ئەوەندە هەیە کە شەڕ ، زۆرتر پێویستی بە هەندیٚ کردەوە هەیە کە لەم نووسراوەدا پێشنیاز کراون ، وەك : ئازایەتی‌و ، مەندی‌و ، بەرگەگرتن‌و ، چاوپۆشین‌و ، یارهەتی‌و گەمەی بڵندو کردەوەی تر . . .

بەو ڕێگایانەی پیشانمان داون ، ئەگەر بۆ کاتی ئاشتی پەسندبن ، بێگومان بۆ کاتی شەڕۆ پەسندترو بایەخدارترن . چ لە کاتی شەڕدا ، چ لە کاتی ئاشتی‌دا ، ئێمە دەبیٚ بۆ ئەوە تێبکۆشین کە کەسایەتیمان ڕۆژبەڕۆژ بڵندبوونەوەدا بیٚ . ئەمە فرمانێکی سەرشانمانە ، بە رامبەر خۆمان ، پێش ئەمەی بێتە فرمانێك بەرامبەر کەسانی تر . جا ئەگەر ئەم نووسراوە بچکۆڵەیە ، بتوانیٚ یارمەتیی ئەو خوێندەوارانەی خۆی بدات ، کە ڕەنج دەدەن بۆ ژینێکی بڵندترو بەکەڵك‌تر ، خاوەنەکەی پاداشێکی وای دەست‌دەکەویٚ کە لە بەشی خۆی زۆرتر بیٚ .

## زانستی خۆناسین
## « کۆنو نوێی »

(١)

زانستی خۆناسین ، زانستێکی زۆر کۆنە ، لەگەڵ ئەمەیشدا بە زانستێکی زۆر نوێیش دادەنرێ . ئەو ، لە لایەکەوە ، ئەوەندەی مرۆڤ کۆنە . لە لایەکی تریشەوە ، نوێیە وەك تازەیی ی رادیۆ ، یاخود ئەو فڕۆکانەی کە لە کاتێك‌دا چوار سەد میل دەبڕن ئەویش لەبەر ئەوەیە ، کە زانستی خۆناسین ، بریتی‌یە لە لێکۆڵینەوەی هۆش . ئەمەیشەوە تێ‌دەگەین ، کە زانستی خۆناسین ، بریتی‌یە لە تێکۆشینێك بۆ چوونە ئەودیو لەشی مرۆڤەوە ، بۆئەمەی لە هەندێ شت تێ‌بگەین ، وەك : بیرو ئارەزووو خرۆش‌و بیرەوەری‌و هەست .

لەوەدا هیچ گومان نیە ، کە مرۆڤ هەر لە سەرەتای پەیدابوونیەوە ئەم سەر زەوی‌یەدا ، تا ئەندازەیەکی گەورە ، دەروونی بووە .

چونکە هۆش – پەسندی ناکات ، کە تا ماوەیەکی درێژ مابێتەوەو تێ‌نەکۆشابێ ، لە خۆی‌و ئەو کەسانەی لەناویاندا ژیاوە ، تێ‌نەگات .

ئەو کابرایە بۆچ وای‌کرد ؟ ئەی بۆچ وای نەکرد ؟ سەبارەت بە چی‌یە ئەم پیاوە لە هیچ ڕوویەکەوە لەو پیاوە ناکات ؟ من بۆچی ئەم فرمانە دەبینم ، کەچی هەموودەم وام دەوێ فرمانێکی تر بکەم ؟

ئەم پرسەو هەزاران پرسی تر ، دەبێ لە سەرەتای مرۆڤایەتی‌یەوە هاتبنە مێشکی مرۆڤەوە . جا چونکە ئەم پرسیارانەیان لە خۆیان کردووەو تێکۆشاون وەرامیان بۆ بدۆزنەوە ، ئەو مرۆڤانە بە (زانستی دەروون) – خواز دادەنرێن . ئەڵێ ، ئەوانە لە زانستی دەروونیان دەکۆڵی‌یەوە ، پێش لەمەی کە گوێیان لە زانستی دەروون بووبێ .

ئەم پرسیارانە کە لە سەرەتادا ، کاڵو نەکوڵیو دەردەکەوتن ، چەشنی هەموو پرسیارێکی مرۆڤایەتی کە تازە دەست‌پێ‌دەکات ، زۆری پێ‌نەچوو ، ووردە ووردە ، چوونە شێوەیەکی ڕووناك‌ترو دیاری‌کراوترەوە .

تەنانەت لە کاتی ( ئەرەستوو )یشەوە ، کە لە یۆنانستانی کۆن‌دا دەژیا لە ناوەند ساڵەکانی (٣٨٤ پێ . ز و ٣٢٢ پێ .ز)دا ، زانستی خۆناسین وای لێ هاتبوو کە بە بابەتێك لە بابەتەکانی لێکۆڵراوەی تەواو دابنرێ . لەوسایشەوە تا ئێستا راستی پەرستەکان بیر لەوە دەکەنەوە کە هۆش چی‌یەو چۆن فرمان دەبینێ ؟ .

بەلاّم زانستی خۆناسینی باو ، کە هەندێ پێ‌ی دەڵێن زانستی خۆناسینی نوێ ، تەمەنی لە (٥٥) ساڵ تێپەڕ ناکات ، چونکە لە نزیك ساڵی ١٨٩٠ دا دامەزرا .

بۆئەمەی جیاوازیی ناوەند زانستی خۆناسینی کۆن‌و زانستی خۆناسینی نوێ تێ‌بگەین ، پێویستە بێتەوە بیرمان کە تا پەنجا ساڵیش لەمەوپێش ، زانستی خۆناسین بریتی‌بوو لە بابەتێك لەو بابەتانەی کە راستی پەرستەکان خۆیان پێوە خەریك‌دەکرد . واتا لەسەر کورسی‌یەوە لێ‌ی دەکۆڵرایەوە .

ئەویش بەو جۆرە بوو ، کە خاوەن بیرەکان لەناو کورسی‌یەکانیان‌دا نوقوم‌دەبوون ، بۆئەوەی باش ووردبینەوە لە کارو فرمانی هوش‌و ڕەووشتی هۆش ، تا ئەوی بۆیان دەدۆزرایەوە بینووسن ، ئەو تێکۆشانەیان بۆ ئەمەبوو کە ( دەستوورەکانی هۆش ) دابرێژن .

ئەم لێکۆڵینەوە ، ووردە ، پچڕەپچڕە ، کە مرۆڤ لە هۆشی خوی‌دا دەیکا ، پێ‌ی دەڵێن : (لێ‌ووردبوونەوەی دەروونی) .

پێشینان ، لەم ڕێگایەوە رۆیشتن لە دۆزینەوەی چەند راستی‌یەکی بەنرخ‌دا سەرکەوتن .

بەلاّم زانستی خۆناسینی نوێ ، لەو کاتەوە دەستی‌پێ‌کرد کە ڕۆشنبیرەکان دەستیان‌کرد بە وازلێ‌هێنانی لێکۆڵینەوەی سەر کوسی ، پاش ئەمەی بۆیان دەرکەوت کە زانستی خۆناسین تا لەسەر ئەم پێڕەوی‌یە کۆنە بڕوات ، هیوا ناکرێ زۆر پێش‌بکەوێ .

گوتیان : « ئەگەر تۆ بتەوێ لێکۆڵینەوە بکەیت لە فرمانی ئەندامانی لەشی مرۆڤ‌دا ، ناچیتە سەر کورسی‌یەکی گەرم‌و نەرم‌و هیچی تر نەکەیت . بەڵکو دەچیتە جێگایەکی تاقی‌کردنەوە ، یاخود ژوورێکی نەشتەرکاری‌یەوە . دیسانەوە ، ئەگەر بتەوێ لێکۆڵینەوە بکەیت لە گەوهەرەکانی کیمیادا ، ناچیت ، تەنیا دەست‌بکەیت بە بیرلێ کردنەوەیەکی وورد . بەڵکو دەست‌دەکەیت بە بەکارهێنانی لوولەکانی تاقی‌کردنەوەو تەرازووەکان‌و بابەتەکانی تر . کەواتە لە لێکۆڵینەوەی « زانستی خۆناسین » یشدا ، بۆچ ئەم جۆرە لێکۆڵینەوە زانستی‌یانە بەکارنەهێنین ، کە لەسەر بنچینەی تاقی‌کردنەوە دامەزراون ؟

جا لەو کاتەدا بوو کە زانستی خۆناسینی نوێ لەدایك‌بوو . لەم کۆڕەدا ، دوو ناوی گەورە دەردەکەوون‌و دەدرەوشێنەوە ، کە تا سەر ئەوەمان بیردەخەنەوە کە چۆن لە ڕێچکەی راستی پەرستی‌و زانستی خۆناسینی کۆن لایان‌داوە . یەکێکیان ناوی ( ویلهلم ماکس ووندیت)ە کە لە ئەڵەمانیادا دەرکەوتووە . ئەوی تریشیان ناوی (وولیەم جیمس)ە کە لە ئەمەریکادا دەرکەوتووە .

لە ساڵەکانی دوایی ی سەدەی نۆزدەهەم‌دا ، (ووندیت) ، یەکەم شوێنی تاقی‌کردنەوەی دەروونی ی لە ئەڵەمانیادا دامەزراند ، کە تاقانە بوو لە هەموو جیهاندا . پاش ئەو (وولیەم جێمس)یش لە ئەمەریکادا ( شوێن تاقی‌کردنەوە)یەکی دەروونی ی تری دامەزراند . ئیتر لێرەوە بوو ، کە زانستی خۆناسینی نوێ‌ی تاقی‌کراوە ، ڕێگای بۆ ڕۆشن‌بووەوە .

سێ‌یەم ناوی گەورەیش ، کە پێویستە بیر بخرێتەوە لە کاتی

لێدووان‌دا لەبابەت زانستی خۆناسینی نوێوە ، (سیگمۆند فرۆید)ە لە دانیشتووانی شاری ( ڤیانا ) ، کە لە دەرگای پزیشکایەتی‌یەوە چووە ناو پەرستگای دەروونی‌یەوە . لە ساڵی ١٨٩٠ دا پسپۆڕێکی تازە پێگەیشتووبوو لە دەماردا ، ئەیکۆڵی‌یەوە لە کەل‌وپەلی دەمارداو لە چۆنێتی‌ی فرمان‌کردنی دەماردا ، ئەم لێکۆڵینەوەیە ، زوو بەزوو گەیاندی‌یە ئەنجامێك ، پوختەکەی ئەوەبوو کە کەل‌وپەلی دەمار ، ڕەنگە بەهۆی هۆشەوە کاری تێ بکرێ . هێشتا سەدەی نۆزدەهەم نەبرابووەوە ، ( فرۆید ) دەستی‌کرد بە بلاْوکردنەوەی نووسراوەکانی کە لەبابەت (هۆشی شارراوە) و (شی‌کردنەوەی دەروون)ەوە دەدوران ، کە بەهۆی ئەوەوە لەدایك‌بوونی کارەساتێکی گەورەی تر لە کارەساتەکانی زانستی خۆناسینی نوێ ، ڕووی‌دا .

زانستی‌ی دەروونی‌ی نوێ ، لە پەنجا ساڵەکەی دوایی‌دا ، توانی چەند هەنگاوێکی ئازایانە بنێ . چەند شوێنێکی تاقی‌کردنەوەی دەروونی لە گەلێك زانستگادا کرانەوە لە ئەورووپاو ئەمەریکاو ڕۆژهەلاْتی دووردا ، لە چین‌و ژاپۆنیادا .

ئەم زانستی خۆناسینی نوێ‌یە ، ئیمڕۆ ، کاردەکاتە ژیانی مرۆڤایەتی ، لە زۆر لاوە . چیرۆك‌و چیرۆکی لاسایی‌یەکانمانی ڕەنگاورەنگ کردووە ، پەروەردەکردنی نوێی ئاراستەکردووە ، هەروەها هوروژمیشی بردۆتە ناو خانووی پزیشکایەتی‌یەوە .

لێکۆڵینەوەکانی زانستی خۆناسین ، گەلێك ستوونی ڕۆژنامەو گۆڤارەکانی پڕکردۆتەوە ، بە هەزاران نووسراو لەسەر بابەتەکانی زانستی خۆناسین ، بە گەلێك زمان‌و ، نووسراونەتەوە . زۆر لە گیروگرفتەکانی مرۆڤایەتی‌ی ڕۆشن‌کردۆتەوە . یارمەتی‌ی زۆر کەسانیشی داوە کە لە خۆیان‌و لە کەسانی تریش باش‌تر تێبگەن .

لە بەشەکانی تری ئەم نووسراوە بچووکەدا ، تێ‌دەکۆشین هەندێ لە دۆزراوەکانی ناوازەی ئەم زانستە ، بە ڕۆشنی پیشان بدەین . ئەم دۆزراوانە ، زۆرتر بە کەڵکی پیاوو ژنی ئاسایی دێن ، ئەو کەسانەی کە لە ژیانی ڕۆژانەیاندا بەدوای ئامۆژگاری‌و ڕێ پیشان‌دان‌و پشتوانی‌دا دەگەڕێن .

## پوختەی گوتراو

١ - زانستی خۆناسین ئەوەندەی مرۆڤ کۆنە . چونکە ئەو تێکۆشینە دەنوێنێ کە ئامانجی تێگەیشتنی هۆشە ، هۆشی مرۆڤەکە خۆی‌و هۆشی هاوخوێنەکانی .

٢ - زانستی خۆناسین ، تا چەند سەد ساڵێکیش لە شێوەی لێووردبوونەوەی دەروونی‌دا خۆی پیشان دا ، بریتی‌بوو لە لقێکی ڕاستی‌پەرستی .

٣ - زانستی خۆناسینی نوێ ، خۆی بۆ ئەوە دەکوتێ کە دەروون لە ڕێگای تاقی‌کردنەوەو کردەوەوە لێکۆڵینەوەی تێدا بکات . جێی تاقی‌کردنەوەو کەل‌وپەلی دەروونی بەکاردەهێنێ . لێووردبوونەوەی دەروونی تەنیا بەشێکی بچووکە لە پێڕەوی‌یەکەی‌دا .

٤ - زانستی دەروونی‌ی نوێ ، ئیمڕۆ ، لە پەروەردەکردنی منداڵ‌و پزیشکایەتی‌و ژمارەیەکی زۆر لە زانستەکانی تردا بەکاردەهێنرێ . ڕۆشنایی‌یەکی بەهێزیشی داوە بەسەر ڕەووشتی مرۆڤ‌و هانەدەرانی ئەو ڕەووشتەدا .

## تا چ ئەندازەیەك زیندوویت ؟

(٢)

ژیانی هۆش سێ ڕووی هەیە : زانیاری‌و دەروون‌و ویستن ، ئێمە لەم بەشەدا لەبابەت ڕووی زانیاری‌ی ژیانی هۆشەوە دەدەوێین .

زاناکانی دەروون ، مەبەستیان لەم واژە ، ئەو واتایەی نیە کە ناسراوە . زۆرتر مەبەسیان لە « ووریایی » یە . ئەویش لەبەر ئەوەیە کە لە هەر دەمێکدا ، ئاوڕ بدەینەوە بەم لاو بەو لای خۆماندا ، دەبینین شتومەك‌و کاروبار ، چروپڕ کۆبوونەتەوە . ئەوانەیش ووریایی‌و سەرنج‌دانیان دەوێ لێان .

دیارە نووستوو یاخود بێ‌هۆش ، زۆر ئاگایان لە خۆیان نیە . هەزارو یەك شت ببینن لە کوێ‌دا ، یاخود ببیەن یان سەرنجی لێ بدەن ، باکیان نیەو خۆیانی پێوە خەریك ناکەن . ئەوانەی گێژو وێژیشن ، تێکڕا ، بە بەشێکی زۆر کەمی ژیانەوە نەبێ خۆیان خەریك‌ناکەن . لەوەیشدا هیچ گومان نیە کە بەشی کەسێکی ئاسایی لەوانە هەموویان ، زۆرترە لە بەشی کەسێکی گێژوویژ . لەگەڵ ئەوەیشدا تەنیا ئاگای لە بەشێکی زۆر کەمی ژیان هەیە ، لەو شتانەی کە پێویستە سەرنجیان لێ بدرێ‌و ووریانو ، خوێن لە دەماریاندایە ، پڕ بەپڕی جامەکەیان ، لە دەستی ژیان مەی وەردەگرن‌و دەینۆشن . ژیانی ئەو جۆرە کەسانە ، پڕپیتترە ، جیهانی ئەوانە دەوڵەمەندترە . ئەوانە ، تا ئەوپەڕی توانایی‌یان ، خۆشی لە ژیانێکی تازەو ناوازە دەبینن .

ئێمەیش پێویستە ئەوە بزانین کە جیهان بۆ هەموو لایەك هەر ئەو جیهانەیە . هەر ئەو جیهانەیە کە بۆ نوستوو و ، گێژوویژی نازیرەك‌و مرۆڤی ئاسایی‌و ، بلیمەت‌و هەڵکەوتووی تێ‌گەیشتوو لە واتای ژیان ، وەك یەك خۆی دەردەخات .

جیهان نیە کە دەگۆڕرێ . بەڵکو ئەو کەسانەن کە هەریەکە با جۆرێك سەیری جیهان دەکەن‌و تێ‌ی‌دەگەن . . جا لێرەوە ئەم ڕاستی‌یا گرنگە دەروونی‌یەمان بۆ دەردەکەوێ :

«جیهانی ئێمه بەو چەشنه دەبێ که خۆمان دوروستی دەکەین . ئەویش بەنده بە دەوڵەمەندیی هوش و کارگوزاریی هۆشەوە . ئێمه ئەوە دەبینین که لە توانایماندا هەیە ببینین» .

زوربەی ئێمه ، لە توانیی‌یدا هەیە ، زۆرتر ببێته خاوەنی زیرەکی و کارگوزاری . خەریك بە خۆت تاقی بکەرەوە .

بیربکەرەوە لە یەکێك لە دۆسته خۆشەویستەکانت . چاوەکانی رەنگیان چۆنه ؟

قژی سەری بە لای راستدا دەشکێنێتەوە ، یان بەلای چەپدا ؟ بەزۆری دەستەسرەکەی لە کام گیرفانیدا دادەنێ ؟

مل‌پێچەکانی بە زۆری ، رەنگیان چۆنه ؟

ئەگەر توانیت ئەم پرسانه ، بە ئاسانی وەرام بدەیتەوە ، لە دانگی ئەو چینه دەژمێررێیت که لە هەموو چینێك وورياترو پرژینترن . بەڵام زۆر لە خوێندەوارانی ئەم نووسراوە ، لە توانایی‌یاندا نیه ئەو وەرامە بدەنەوە . لە لایەکی تریشەوە ، سەرنج بدە لە مرۆڤی خاوەن دڵخواست . چ جیهانێکی چرو پرە جیهانەکەی ، کاتێ که شتێك یان کاروبارێك ، پەیوەندیی دەبێت بە مەبەسەکەی ، یاخود بە دڵخوازەکەیەوە ! . .

ئەو شاگردەی دڵی چوو بێت بە فرۆکدا دەتوانێ هەر لە دوورەوە ، جوری فرۆکەکەت پێ بلێ .

ئەو پیاوەیش پەپوولەی هەموو رەنگ کۆدەکاتەوە ، لە راستیدا خۆی فڕێ‌دەداتە جیهانێکی پڕ سەرسورمانو ئارەزووەوە ، که دەرگاکانی ، لە زوربەی ئێمه داخراون .

ئەمەیش راستی‌یەکی گرنگی ترە دەیڵێم : ئەو دوو خاوەن دڵخوازەو ، هەموو ئەو کەسانەی که بە گەرمی خەریکی فرمانی خۆیانن ، بە کۆششێکی وورياپانەی کەم ، توانیویانه ئەم زانیاری‌یە دەست خۆیان بخەن . بێ‌ئەوەی بە قەمچی لە خۆیان بدەن ، چوونەتە ناو جیهانێکی فراوانترەوە . لە راستیدا زانیاری‌یەکەیان ، بەهۆی ئارەزوو و چەشەکردنەوە ، دەستکەوتووە . کەواتە چاکترین رێگا بۆ کۆکردنەوەی زانیاری ، یاخود شارەزابوون لە بابەتێکدا ئەوەیە : که دڵت بخەیتە سەر ئەو بابەتە .

ووریایی‌یەکەت بخەرە ژێر چنگی ئارەزووی دڵتەوە ، بۆت دەردەکەوێ که زانیاری‌یەکەت بە ئاسانتر دەست دەکەوێ .

دیارە وا چاکترە که ئەو ئارەزووە سوورشتی بێ‌و نزیك بێ ، بەڵام لە هەندێ جاردا ، ئەندێشەیی‌و دوور نەبێ ، نابێ .

ئەو شاگردەی که بەزۆر فێری کردار (افعال)ی زمانی یۆنانی دەکرێ ، که دوورن لە ئەندازەی گشتی‌یەوە ، بۆی دەردەکەوێ که گرانه بۆی ، بتوانێ خۆشی‌یەکی دەمو دەستی ، لەو ووتەو واژە گرانو گرێدارانه وەربگرێ .

بەڵام ئەگەر توانی شەنگ‌و شۆخی‌ی یۆنانستانی کۆن بهێنێتەوە بەرچاوی خوی‌و ، ئەوەیش بهێنێتەوە یادی ، که ئەم زمانه ، رۆژێك لە رۆژان ، زمانی (سوکرات‌و ، ئەفلاتوون‌و ، ئەسکەندەر) بووە ، گەرم‌و گوری‌یەکی نوێ دەچێتە خوێنیەوە بەرامبەر فرمانەکەی ، که بەهۆی ئەوەوە رەنج‌و تەقەلاکەی لا دەگۆررێ‌و دەبێتە ئارەزوو بەجێ‌هێنان‌و لەو تەنگ‌وچەلەمەیەیش که تێدایەتی خۆشی وەردەگرێ . دەیشتوانێ پیشەی دوارۆژی خۆی بهێنێتە پێش‌چاوی خۆی‌و ، شارەزابوون لە رێزمانی زمانی یۆنانی‌دا ، بە هەنگاوێکی تازە دابنێ بۆ پێشکەوتنی لەو پیشەیەدا . جا لەم ئەنجامه دوورانەوە ئەو واتایانه دەست‌خۆی بخات ، که بیخەینە سەر ئەو بیرەی که ئەو فرمانەی مامۆستاکانی بەزۆر داویانە بەسەریدا ، فرمانێکی بەکەڵکی وایە ، که ئەوە هەڵدەگرێ خۆی تێدا ماندووبکات .

جا ئەم هۆیە دەستکرانە ، هەرچۆنێك بن دەستوورەکە ئاسانە بۆ تێگەیشتن : که ئەگەر بێتو بە گیانێکی پڕ ئارەزوو و خۆشەویستی‌یەوە دەست‌بکەین بە ژیان ، ژیان بەلامانەوە : فراوانترو پرپیت‌ترو بەنرخ‌تر دەبێ .

تەنانەت ئەو فرمانەیش که گیان لە خۆی وەرس دەکەن ، دەتوانرێ بەم شێوەیە باریان سووك‌بکرێ . .

لەبیرت نەچێت ، هەرگیز ، که خۆتیت جیهانی خۆت دوروست‌دەکەیت . ئەو جیهانەیش که تێیدا دەژیت هەر ئەو جیهانەیە که خۆت بۆ خۆتت هەڵبژاردووە . گەلێك یاسا بلاّوبووەوە لەناو مرۆڤایەتی‌دا بە مەبەستی بڵندکردنەوەی خووی ووریایی‌و ناسك‌کردنەوەی . چەند جورێك پێشنیازیش دانرا بۆ مەشق‌کردن بە بیرەوری ، بۆئەمەی بەهێز بێ‌و قاڵ‌بێ . بەڵام زۆر لەو مەشقانه دەست‌کردن ، دوورن لە سوروشتەوە . چاك هەر ئەوەیە که مرۆڤ خووی خۆی لە رێگایەکی سوروشتی‌یەوە بەهێزبکات بەهۆی ئەو کەرەستانەیشەوە بیکات که لەبەر دەستیایە .

ئەرێ تۆ شەرمن‌و دڵناسك‌و گوشگیری ؟ وا دەست‌پێ‌بکە که خەمخۆری‌یەکی تازەی مرۆڤایەتی بخۆیت . بام ئەم خەمخۆری‌یە تازەیەت ، هەر بۆ مرۆڤایەتی بێت . تێ‌بگە لە شێوەی ژیانیان ، لە بەرگ‌و پۆشەنی‌یان ، لە جۆری گفتوگۆیان ، لەو بابەتانەی که حەزدەکەن لێ‌یان بدوێن ، لەو رێگایانەی که دەیانگرن بۆ چارەکردنی ئەم بابەت‌و ئەو بابەت . بەڵام ئەوانەت که کرد ، بەو چاوەوە سەیریان مەکە ، که رەش‌بین بی‌و تەنیا بۆ دۆزینەوەی هەڵەو نەنگی‌و کەم‌و کووری بگەرێی بەڵکو هەر بۆئەوەی که خۆشی لە مرۆڤایەتی ببینی ، بە

واتایەکی تر ، مرۆڤایەتی بکە بە بابەبابەتێکی خۆش بۆ خۆت ، دڵت پێ‌ی بکرێتەوە ، هەروەها چەند کەسانێکی نوێ‌یش بخەرە ڕیزی ئەو کەسانەی دەیانناسیت . دوور نیە ئەم فرمانە ، بۆ تۆ ببێتە مەشقێکی تاسوق‌و ناوازە ، کە بەهۆی ئەوەوە ، شەرمنی‌یەکەت لی‌ی کەم‌ببێتەوەو ، خۆیشت جوامێرترو لێ‌بوردەترت لێ بێ . چونکە لەڕاستی‌دا ، کەم کەسی وا هەیە ، کە بێ‌بەش بێت لەو ڕەووشت‌و کردەوانەی کە دڵی پیاو کێش‌بکات‌و خۆشەویستی‌ی تێ‌بخات .

بیرەوەرەی‌یش هەر بەو جۆرەیە . سەری خۆت گێژمەکە بەو ڕێگا دەستکردانەوە کە بۆ بەهێزکردنی بیرەوەری بەکاردەهێنرێن . بیرەوەریی خۆت لەو کەرەستانەدا بەکاربهێنە کە ڕۆژ بەڕۆژ لە کارەساتی ژیانتدا دێنە بەردەمت . دوور نیە ، هاوری‌کانت ، جاروبار ، ناسیاوانی خۆیانت پێ بناسن . تێکۆشە ناوەکانیان لەبەر بکەیت . چونکە هیچ شتێك دڵی مرۆڤ وا خۆش ناکات ، کە بزانێ یەکێك بەرێکەوت نەبێ ، تووشی نەهاتووە ، لەگەڵ ئەوەیشدا کە لە دەمێکیشەوە بووە ئەو جارە دیویەتی ، کەچی لەم کۆبوونەوەی دووەمەیاندا بە ناوی خۆیەوە ناوی دەهێنێ .

بەڵام کوا پیاو دەتوانێ هەموو ناوێك لەبەربکات ؟ وەرام ئەوەتا : کە (ناو)و (ناوبراو) کە مرۆڤەکەیە لێرەدا ، پێکەوە ببەستی‌و ، پچێك خۆشەویستی‌یش بۆ هەردوو لایان بخاتە دڵیەوە . بام بڵێین تۆ بووی بەناسیاوی کابرایەك ناوی (فەرهاد)[1] بوو ، وا دەرکەوت ، قژی زەرد ، چاوەکانی شین بوو ، وەك دانیشتووانی شارەکانی ئەوروپای ژووروو . وا تۆ کلیلێکی دەرگاکەت دەست‌کەوت . دیارە کە ئەوروپایی‌یەکان هونەرمەندو کارگوزارن وەك ئەو فەرهادەی کە کێوی بێستوونی بۆ دەزگیرانەکەی خۆی کۆڵیوەو تاشیوە . بەم ڕەنگە سەرنجدانێکی هۆشت بەم جۆرەی لی‌هات : قژی زەردە ، چاوی شین ، چەشنی ئەوروپایی‌یە . . . کەواتە فەرهادە . . ئەگەر ئەم ڕێگایەت بە هەڵبەست هاتە پێش‌چاو ، ئاگات لێ‌بێ ، لە جێ‌یەکی تردا چۆن بیرەوەری‌یەکەت بەکاردەهێنی . دەبێ لە ڕێگای پێکەوەبەستن‌و بیرکەوتنەوە بەکاربهێنرێ . کە ئەم ڕێگایە زانراوو نەزانراو پێکەوە دەنووسێنێ . ئەمەیش ، لەو وێنەیەی پێشووە دەکات کە ناوی (فەرهاد)ی تێدا بوو . جا لەبەر ئەوەی بیرکەوتنەوە ئاسانەو ئاسایی‌یەو ، دووریشە لە زۆر لەخۆ کردنەوە ، بیرەوەری لە کۆرێکی ئاسایی‌دا گەشە دەکات . دوور نیە پەیوەندی‌یەکانی ناوەندیان پڕوپووچ بن ، بەڵام هەرچی چۆنێك بێ ، ئەنجامەکەی دوورست‌دەبێ .

کەم نین ئەو کەسانەی کە گوێت لێ‌یان دەبێت‌و سکاڵای خۆیان دەکەن بۆ تۆ ، لەدەست نەمانی بیرەوەری‌یان ، یاخود لەدەست بێ‌دەسەڵاتی‌یان لە نووچ‌گرتنی بیردا . ئەگەر ئەو بارە ، سەبارەت بەوە نەبێ کە پەستی‌یەکی ڕاستەقینە پەیدا بووبێ لە شانەکانی مێشك‌دا (کە ئەمەیش کەم ڕوودەدا) ، زۆربەی سکاڵاکە لە یەکێك لەم دوو شتە پەیدادەبێ : یان ئەوەتا ئەو کەسە نەیتوانیوە بیرەوەریی خۆی پەروەردەبکات و گەشەی پێ بکات ، یاخود ئەوەتا دڵی کرمێ بووە لە دەسەڵاتی خوی لە بیرکردنەوەو نووچ‌گرتنی بیردا .

تەنانەت ماسولکەکانیش ، شل‌و شێواویان لێ دێ ، ئەگەر بەکارنەهێنرێن . زۆری وایشمان تێدایە ، کە هێزەکانی هۆشیان کەم بەکاردەهێنن . زۆر جاری وایش هەیە ، کە گوێمان لە زۆر کەس دەبێ ، هۆشی خویان تاوانباردەکەن و بەبێ کارەی تێ‌دەگەن . لە ڕاستی‌دا هۆشەکانمان زورتر لە هاوڕێکانمان دەکەن : تێکرا ، ئەوەندەی پیایاندا ڕادەپەرمووین ، هەر ئەوەندە کاردەکەن ، ئەگەر هاتوو دڵ‌کرمێ بووین لە کارگوزاری‌یان ، ئەوانیش ناپاکیمان لەگەڵ دەکەن‌و بەربەستی مەبەستمان دەکەن .

کە مرۆڤ لە نووچ‌گرتنی دەدوێن ، وەك لە فرمانێکی چاوبەستانەی ، کەم هەڵکەوتوو و ، بەگران دەست‌کەوتوو بدوێن وایە . زۆر لەو یاسایانەیش کە ناویان ناون (یاسای هۆش) ، هەر لەسەر ئەم بنچینە چرووکە دامەزرێنراون . لە ڕاستی‌دا ، نووچ‌گرتنی هۆش ، لە هەموو شتێکی جیهانی پتر سوروشتی‌یە . هوش هەر بۆ ئەوە دانراوە کە نووچ بگری‌و بیری قووڵ بکاتەوە ، هەروەك وورگ بۆ ئەوە دانراوە خۆرشت بکا نۆش ، یان سی‌یەکان بۆ هەناسەدان دانراون .

نووچ‌گرتنی بیریش ، هەر بەوە پێك‌دێ کە بە سووك‌و ئاسانی بیر بخەیتە سەر شتێك‌و نووچی لەسەر بگریت تا چارەی بۆ دەدۆزیتەوە . چاکترین نووچ‌گرتنی بیر ئەمەیە .

ئەگینا ئەگەر پرسیاری نابەجێ بکەیت لە بارەی ڕاستی ئەم فرمانەوە ، یان لە کاتی فرمانی نووچ‌گرتنەکەدا خۆت تاقی‌بکەیتەوە ، ئەوە بە نووچ‌گرتنی بیر ناژمێرێ . چونکە ئەگەر ، لە کاتی نووچ‌گرتنی بیردا ، بەشێکی هۆشت سەرنج‌بداتە بەشەکەی تری ، هۆشت دەبێ بە دوو کەرتەوە . مەرجی نووچ‌گرتنی بیری ڕاستەقینەیش ئەوەیە کە هەموو لایەکی هۆش پێکەوە بکەوێتە گەر ، ئەوەیش بەشێوەیەکی وا ئاسایی‌و سووك‌و ساکار بێت ، کە زۆرە ملی‌ی تێدا نەبێ ، واتا ئەوەیش شتێك بێ وەك خواردن‌و هەناسەدان ، بە ئاسانی ، بێ گیروگرفت ، جێ‌بەجێ بێ . هۆشت تاوانبار مەکە . وەك هەیە پەسندی‌بکە ، هەروای دابنێ کە سوروشت ، کەل‌وپەلێکی وای پێ بەخشیوی کە بەتەواوەتی بۆ ئەو فرمانەی پێ‌ی سپێرراوە بسازێ . جا لە بیروباوڕێکی‌وا زیندووکەرەوەدا ، بیرە پێشەوەو دەستیش بدەرە گەشەپێ‌کردن‌و بەرهەم‌هێنانی هێزی بیرکرنەوەو نووچ‌گرتن لە بیردا ، ئەوەیش هەر بەوەبەندە کە بە هەموو ساکاری‌یەوە دەست‌بکەیت بە بیرکدنەوەو

نووچ‌گرتن له بیردا .

دواجار ، بام ئەم ڕاستی‌یەیش بڕیاربدەین : « هۆش ئەندازەی پیاوە» . ئێمە دەگەینە ئەو ئەمەنەی کە هەست دەکەین پێ‌ی گەیشتووین . هەروەها لە کامەرانی‌یشدا : بەلامانەوە چەند پێ بەشمان ، ئەوەندە کامەران دەبین .

ئێمە لەو جیهانەدا دەژین کە هۆشمان دوروستی‌کردووەو هیچی تر . هەرچەند زیندوێتی‌یەکەمان بەهێزتر بێ ، زورترمان چنگ‌دەکەوێ لە ژیان . هەرچەند ئاگری ئارەزوومان بڵێسە بسێنێ ، ئەوەندە هێزی وریایی‌مان ڕوشن‌ترو پرشنگ‌دارتر دەبێ ، هەروەها جیهانەکەمان پڕییت‌ترو فراوان‌تر دەبێ . هەرگیز ناشێ جیهان بێتە بارێکی گرانو فرمانێکی سەخت‌و ناخۆش بۆ ئەوانەی خاوەن هۆشێکی تەواو وریابن . بە هەزاران کارەسات‌و تاقی‌کردنەوەی ڕەنگاورەنگ‌و پڕفەڕ خۆیان بۆ تۆ ئامادەکردووە ، چاوەڕوانی ئەوەن بیاندۆزیتەوەو تێ‌یان بگەیت . ئەوانە نزیکن لە بەردەستان . کە وای لێ‌هات ، پڕیاربدە وریابیتەوەو بژیت .

ئاسوی ژیانت فراوان‌بکە ، بەدوای شتدا بگەڕێ ، ئاگات لە خۆت بێ ، فێر بە . زانیاری‌ی هەمووڕەنگ دەست خۆت بخە .

چونکە هەمو کلیلێکی زانیاری هۆشت فراوانتر دەکات ، خۆیشت فراوانتر دەبیت .

ئەم ژیانەی کە ەسەری پیاوی لێ سووردەمێنێ ، بە چاوی بەستراوەوە گوێ‌ی گرانو ، هۆشی گێژو وێژەوە بەلای‌دا تێ‌مەپەڕە . هۆشت بخەرەکار . هۆش بۆ ئەوە دوروست‌کراوە ، کە بەکاربهێنرێ . پشتی پێ ببەستە . چونکە ئەگەر پشتت پێ‌بەست ، بۆت دەردەکەوێ ، کە هۆشت شایستەی پشت‌پێ‌بەستنە . وریابەرەوە . هەموو جیهان لە بەردەستت‌دایە چاوەڕوانیت‌دەکات .

ڕەنگە پرس‌بکەیت ، پاداشت چی دەبێ ؟ پاداشەکەت هەر ئەوەندەیە کە تۆ گەشەدەکەیت . گەشەدەکەیت لە ژیری‌و زانیاری‌و تاقی‌کردنەوەی ژیان‌دا . هەر ئەوەندەیە کە تۆ لە جیهانێکی خۆشترو فراوانتردا دەژیت .

ئەوە هەر هۆشە کە چاکەو خراپە دوروست‌دەکات هەر ئەویشە کە کامەرانو هەناسەساردو ، دەوڵەمەندو هەژار لە مرۆڤ دوروست‌دەکات .

**پوختەی گوتراو**

١ – هەموو کەسێ جیهانی خۆی دوروست‌دەکات « جیهانی ئێمە» ئەو جیهانەیە کە هۆشمان پەسەندی دەکات .

٢ – ئارەزوو کلیلێکی زێڕینە بۆ فێربوونو بیر کەوتنەوەو شتی وا . دەیشتوانین ئارەزوو زیندووبکەینەوە لە خۆمان‌دا .

ئەگەر لەئارادا نەبوو ، ئەویش لە ڕێگای هێنانە پێش‌چاوەوە . واتا چاکەو سەرکەوتوویی دواڕۆژی خۆمان ، بام دووریش بێ بهێنینە پێش چاومان .

٣ – بیرکردنەوەی قوولْ ، کردەوەیەکی سوروشتی‌یە بە مەشق‌کردن گەشەدەکات . هۆش کە پشتی پێ بەستراو باوەڕی پێ کرا چاکەی لێ‌ی دەوەشێتەوە .

٤ – هۆشمان ئەندازەی ڕاستەقینەی نرخی پیاوەتیمانە لە زانیاری‌و وریابوونەوەو ئارەزووماندا هەر گەشەکردنێك ڕوو‌بدات ، ئەوەندە کەسایەتیمان گەشەدەکات .

## هەستەکانت چۆن ئاراستەدەکەیت ؟
## (٣)

وەك لەوەپێش لێ‌ی دووایین دەروون ڕووی دووەمی ژیانی هۆشە . ئێمە هەر تەنیا بیرکردنەوەمان نیە ، هەست‌پێ‌کردنیشمان هەیە . ئاخۆ زانستی خۆناسینی باو ، لەبابەت جیهانی دەروونەوە ، چی دەتوانێ بڵێ ؟

لەپێش هەموو شتێکدا پێمان دەڵێ : « دەروون بریتی‌یە لە هێزێك پاڵ بە ژیانەوە دەنێت» . دەروون بۆ کەسایەتی‌ی مرۆڤ ، وەك بەنزین بۆ ئۆتۆمبیل ، یاخود هەڵم بۆ شەمەندەفەر وایە .

هەروەك ، کەس ، نەژیاوە بە ژیری‌و زرنگی‌یەوە ، بێ‌ئەمەی زیرەکی‌ی خۆی بخاتە کار ، هەروەها ، کەسیش ، نەژیاوە بە هێزو پێتەوە ، بێ ئەمەی سۆزی خۆی بخاتەکار .

لە هەندێ کۆمەڵ‌دا ، ڕەووشتێك هەیە : سۆز بە چاوێکی سووکەوە سەیردەکەنو ، پلاریشی تێ دەگرن . لە هەندێ کۆمەڵی تریشدا ، مەشقی کۆمەڵایەتی بۆ ئەوە دەچێ کە بەربەستی دەروون بکرێ‌و ، نەهێڵرێ بە هیچ کلۆجێك دەربخرێ ، بەڵکو جاری وا هەیە ، مرۆڤ دەخاتە سەر ئەوەی . کە بەزۆر ، خۆی بە پیاوێکی مەندو زرنگ پیشان‌بدات . بێ هاوتایی ، لەم ئاینەدا ، ئەوەیە : ، کە هەر کارەساتێك لە ژیان‌دا هاتە پێشت ، بەپێ‌ی ئەو ڕەووشتە پوختەیەی سەرەوە بەرامبەری بکەیت .

ئەم بیروباوەڕانە ، لەناوەڕۆکیاندا ، کەمەکێ ڕاستی هەیە ، ئەویش ئەوەتا کە وورووژانی سۆز ، نە پەسەندە ، نە بەکەڵك دێ .

سۆزی وورووژاوی وا ، کە سەرکێشی مان لێ بکاو مل نەنێ بۆ فرمانی خۆی ، هێزێکی پڕسامە ، بەکەڵکمان نایەت بۆ ڕاپەڕاندنی فرمانی چاکی ژیرانە . لەبەر ئەوە شتێکی زور نابەجێ‌یە ، کە جڵەوی دەمارەکانت لە دەستت دەربچێ . تۆ ، بەوە ، هەر ، بەڵگە نادەیت

بەدەستەوە کە لە توانایتدا نەماوە زاڵببیت بەسەر دەروونتدا ، بەڵکو ئەویشت لێ دقەومێ کە ئیتر پێت ناکرێ لە بەرامبەر کارەساتی ناخۆش‌دا ، بە جۆرێکی پەسەند خۆت ڕابگری . ئەگەر جڵەوی دەمارت لەدەست دەرچوو ، دەرونیشت لەدەست دەردەچێ ، کە هەرگیز نابێ لە دەستت دەربچێ . ترسی یاخیبوویش ، کە زاڵ نەبووبین بەسەریدا ، هەر بەو ڕەنگەیە . ئەویش ڕێگامان لێ دەباتە بەست ، ناهێڵێ هیچ فرمانێکی بەکەڵك ڕابپەڕێنین . ترس ، لەو کاتەنەدا کە دەگاتە ئەوپەڕی هێزی خۆی ، دەس‌و پێمان دەبەستێ‌و ، لە جێگای خۆمان‌دا ووشکمان دەکات ، کە پێویستە ، لەبەر هەڕەشەی سەرگەردانی چارەی خۆمان بکەین . جا ئەم ڕاستی‌یەیە لەبابەت سۆزی بێ‌ئەندازەوە ، کە هەندێ لە ڕۆشنبیرانی خستۆتە سەر ئەوەی کە بڵێن : بۆ مرۆڤ وا چاکترە کە هەرگیز جڵەو بۆ سۆزی خوی شل‌نەکات . ئەمەیە ، ئەو ڕازەی کە لەپشت ئایینی «نەرمی‌و شیرینی‌ی ڕەووشتە»وە خۆی شاردۆتەوە . هەر ئەمەیشە کە بۆمان دەردەخات چۆن هەندێ کۆمەڵ ، بەلایانەوە ڕەوایە ، کە هەر سۆزێك ، ئەگەر دەربخرێ ، بە شتێکی ناپەسەند دەژمێرێ . بەڵام ئەمانە هەموویان ، لەوە دەکەن ، کە یەکێك هەندێ زەهر بنۆشێ ، بۆ ئەمەی لە نەخۆشی‌ی زەهرێکی پێشوو ڕزگاری ببێت . تۆ لەوە دڵنیا بە : لەوانەی کە توانیویانە بە شەنگ‌و شۆخی‌و هێزو هەڕەتەوە بژین ، یاخود لەوانەی کە توانیویانە کردەوەی مەردانە ڕابپەڕێنن بۆ کەڵکی گشتی ، کە سێك نەبووە گەیشتبێتە مەبەسی خوی ، بێ‌ئەمەی سۆزێکی قووڵی بەهێزی خۆی یارمەتی‌ی دابێ . بەربەست‌کردنی سۆز ، ئەوە دەبەخشێ ، کە دەرگا لەرووی گەورەترین هێز ، بۆ پێك‌هێنانی ژیانێکی پەسەندترو بڵندتر ، دابخرێ .

بۆ وێنە ، ئەوە بخەرەوە بیرت ، کە لە بەشی پێشوودا ، لە بارەی ئارەزووەوە قسەمان کرد .

ئارزوو ، تاقی‌کردنەوەی دەروونی‌یە . لە هەر کوێ‌یەك ئارەزوو پەیدابوو ، ئەو فرمانانەی کە لە پێشدا ڕقمان لێ‌یان هەڵ‌دەساو ، بە پشم‌و قینەوە سەیرمان دەکردن ، وایان لێ دێ کە بە ئاسانی‌و سووکی‌یەوە ڕابپەڕێنرێن و پڕ بەدڵ خۆشیشمان بوێن .

دیسانەوە ئەوە بخەرەوە بیرت ، کە چۆن لە توانایی خۆشەویستی‌دا هەیە ، کەسایەتی‌ی مرۆڤ بگۆڕێ . تەنانەت خاوەن خۆشەویستی‌یەکە وای لێ‌دێ ، هەروەك بەناو زەوی‌یەکی تازەدا بڕوات‌و بە هۆی جادووەوە ، جوانی‌یەکەی زۆرتر بووبێ‌و بۆنە خۆشەکەی پتر لێ هاتبێ ، وای دێتە پێش . ئەمەیش بەڕاستی ڕوودەدا ، نەك بە درۆ .

بیرکەرەوە : چۆن نیشتمان‌پەروەری ، گەلێك پیاوی گەیاندۆتە ئەوپەڕی مەردایەتی‌و سنگ فراوانی ، کە لە توانایی مرۆڤ‌دا نیە بیهێنێتە پێش‌چاوی خۆی .

بیرکەرەوە : چۆن سۆزی ئایینی کڵپەدار پیاوان‌و ئافرەتانی کێش‌کرد بۆ خۆبەخت‌کردن لەپێناو بیروباوەڕیان‌دا .

نە پاشگەز بوونەوە لە ترسی ئازارو کوشتار ، نە شکایشن لەبەر دوژمنیان‌دا ، نە باکیشیان هەبوو لە کەس ! هەروەها ، لە لایەکی تریشەوە ، چۆن پاڵی بە هەندێکی ترەوە نا ، کە خۆیان بەخت‌بکەن لەپێناو بەزەیی پیاهاتن‌و دەست‌گیرۆیی‌ی بێ‌ئەندازەدا ، بەرامبەر بە هەناسەساردان‌و بێچاران ، تەنانەت بەرامبەر بە خوێڕیی‌و نەنگەویستی هەموو جۆرە مرۆڤێك‌دا ! . .

تەنیا هەر بەهۆی سۆزی بڵندەوە ، ئێمە دەتوانین بگەینە سەر پۆپەی مرۆڤایەتی‌ی واوە ، کە بەبیرمان‌دا نەهاتووە بیانگەینێ .

ئەوەیش هەر بەهۆی بیرکردنەوەیەکی لەسەرخۆوە پێك‌دێت . ئەو بیرە بە هێزەی کە لەسەر بچینەی هەستی قووڵ دابمەزرێ ، بۆ هەموو ژینێکی پەسەند پێویستە .

کەواتە ئەوەی پێویستە پێکی‌بهێنین ، بریتی‌یە لە شتێکی مام ناوەندی لە ناوەند دوو هێزی ئەم پەڕو ئەو پەڕدا . واتا مام‌ناوەندی‌یە لە ناوەند بەربەست‌کردنێکی تەواوی هەموو سۆزەکانمان‌و ، بەرەڵلاکردنی ئەو سۆزانەدا لە شێوەی سەربەستی‌ی شاخەئاگرینەو ، ووروووژانەکانیدا . . پێویستە لەسەرمان ، سۆزەکانمان پەروەردەبکەین و بیانخەینە ژێر چنگمانەوە ، نەك سەرزەنشتیان بکەین‌و ڕیزگاویان‌بکەین . بە واتایەکی تر دەبێ مەبەسمان ئەوەبێ ، سۆزەکانمان بە زیرەکی‌یەوە ئاراستەبکەین . بۆ شتی باش‌و بەکەڵك .

پێویستە بە زیرەکی‌یەوە بیربکەینەوە ، فرمانیش بە سۆزەوە ڕابپەڕێنین . پوختەی ئەم قسەیەیش ئەوەیە ، کە دەبێ بە بیرێکی پاکژو چاوێکی تیژەوە بڕیار بدەین لەسەر ئەو کردەوانەی بەجێ‌هێنانیان پەسەندە لە ژیان‌دا ، هەروەها بڕیاربدەین لەسەر ئەو ئامانجانەی هەڵدەگرن خۆمانیان بۆ بکوێتن . بۆئەمەی لەپێناو بەدی‌هێنانی ئەو ئاواتانەو ، بەجێ‌هێنانی ئەو کردەوانەو ، گەیشتن بەو ئامانجانەیش‌دا ، هەرچیمان لەدەست دێ ، لە هێزەکانی سۆزو دەروون کۆبکەینەوەو بەکاریشیان بهێنین .

« بیری ڕوون» ، و «هەستی قووڵ» ، دوو کەرەستەی ژیانێکی سەرکەوتوو و ، پڕ فەڕن .

ئەمەیش دەمانگەیێنێ بە واتایەکی دوورتر . ئەوە دیارە کە هەندێ سۆز هەیە لە هەندێ سۆزی تر ، بەکەڵك‌ترە بۆ ژیان . بۆیەکا ژین بە خۆشەویستی‌یەوە چاکترە لە ژین بە پشم‌و لەرزەوە . ژین بەهیواو مەندی‌و چاوپۆشی‌یەوە چاءترە لە ژین بە هەناسەساردی‌و تووڕەو ترۆیی‌وو دڵتەنگی‌و گیری‌یەوە .

بەڵام ئاخۆ سۆزە باشەکانمان چۆن گەشە پێ‌دەکەین ؟ سۆزە

خراپەکانمان چۆن لە ڕەگ‌و ڕیشەوە دەردەهێنین؟ ئاخۆ ڕێگەیەك هەیە بۆ زاڵبوون بەسەر سۆزو هەستەکانماندا؟

یاخود سۆز هەر لە خۆیەوە دەردەچێ، پەیوەندیی نیە بەوەوە، کە چۆن بیردەکەینەوە، یان چی بە ئاوات دەخوازین؟

لە سەرەتای دەست‌پێ‌کردنمانەوە، بیرو باوەڕێك هەیە. پێویستە پیشانی بدەین: تۆ ناتوانیت، بە بیرکردنەوە، هیچ سۆزێك بکوژیت.

تەنانەت ئەگەر دانیشیت جیر بکەیتەوە رەنجیش بدەیت بە زۆر لە هۆشی خۆتی بکەیتە دەرەوە، بۆت ناچێتە سەر.

هەر کەسێ هاتبێت‌و ویستبێتی بەم جۆرە یەکێك لە سۆزە کڵپەدارەکان لە دڵی خۆی دەربپەڕێنی، بێ‌گومان. لەم کۆرەدا، رەنجەرۆیی‌ی خۆیی‌ی خۆی بۆ دەرکەوتووە. نەء! تۆ ناتوانیت، بەهۆی هوروژمی راستەوراستەوە هیچ سۆزێك لەناوبەرێت!.. بەڵام بێتو بە شیرینی لەگەڵیدا بجوولێیتەوە وە بە پێچ‌و پەنا بۆی بڕوێت، دەتوانیت ئەو سۆزە لەناو بەریت ئەو سۆزە لە ڕەگ‌و ڕیشەوە دەربهێنی، بە مەرجێ سۆزێکی بەر ئاوەژووی بەرامبەر بوەستێنی. لێرەدا دەتوانیت قسەکەی (ووليەم جێمس) بەکاربهێنیت، کە ناوی ناوە «هێزی دەرپەڕێنەری سۆزێکی نوێ» ئەگەر ویستت لە هەر سۆزێکی ناخۆش رزگارت بێ، سۆزێکی پێچەوانەی ئەو سۆزەی بەرامبەر دابنێ‌و گەشەی پێ بکە.

ئەگەر لەوانە بوویت، کە دڵیان بەلای پشم‌و قیندا دەچێ، خۆشەویستی لە دڵندا پەروەردەبکە، ئەگەر ترسنۆکی دڵی داگیرکردبووی، ئازایەتی لە دڵتدا بەهێزبکە.

بەڵام، مرۆڤ، چۆن دەتوانێ لە دەروونیدا، سۆزێکی پەسەند گەشەپێ‌بکات؟

بۆ ئەمە دوو ڕێگا هەیە:

یەکەم: ڕێگای بیرکردنەوەی هەموو دەمی لەو سۆزەی کە حەزی لێ‌دەکرێ، لەگەڵ دەرخستنی چاکەو فەرەکانیداو، خۆ هێنانە پێش‌چاویش بە دەست‌کەوتنی ئەو سۆزەوە. بۆ ئەم مەبەسە، نووسراوەکان یارمەتی زور دەدەن. بە خوێندنەوەی پاڵەوانەکان، ئازایەتی‌ی مرۆڤ پتری لێ‌دێ. هەروەها تێکەڵی‌ی ئەو کەسانەیش کە خاوەنی ئەو جۆرە سۆزانەن، کارمان لێ دەکات. ئەو جۆرە سۆزانەمان تێدا بەهێزدەکات. شت هێنانە پێش‌چاویش هێزێکی کاریگەرە. ئارەزووکردنێکی زۆر بۆ ڕەووشتێك لە ڕەووشتەکان، دەمانخاتە سەر ئەو ڕێگایەی کە بمانگەیێنێ بەو ڕەووشتە. ئەگەر هاتوو مرۆڤ خۆی وا هێنانە پێش‌چاوی خۆی کە بە ئاوات گەیشتووەو، خوی هێنایە پێش چاوی خوی چۆن پیاوێکی لێ دەردەچێ ئەگەر بەو ئاواتەی گەیشت، ئەوانە هەموو. کردەوەیەکی هۆشی‌ی وان، کە ئەو مرۆڤە، زووبەزوو، بەو ئاواتەی دەگەیێنن. بەڵام، ڕێگاکەی دووەم، ڕێگایەکی کردەوەیی‌یە، ئەویش بریتیی‌یە لەوە: کە بە جۆرێکی وا بجولێینەوە، وەك ئەو ڕەووشتەمان گرتبێ بەڕاستی، یان ئەو سۆزە خۆشەویستەمان لە دلێدا جێ‌گیربووبێ، وا بێ. ئەگەر لەمەودوا، هەستت بە دڵتەنگی‌و خەفەتباری کرد، چاوەڕوان بە، کام کەست پێ‌گەیشت، قسەیەکی دڵ زیندووکەرەوەی لەگەڵدا بکە. ئەو کەسە، چ کارەیەك بێ، بام بێ، شیر فرۆش بێ، یان نامە بەر، یاخود هاوکارو فرمانت بێ، لە هەموو کانی دڵتەوە ئەو قسە شیرینەی لەگەڵدا بکە. دەستەکانت بشکێنەوە بەرەو دوادا، سەرت بەرزکەروە، بە زەردەخەنەیەکی جوانەوە، ئەو قسە دڵ بووژێنەرەوەی لەگەڵدا بکە. ڕەنگە زور سەرت سووربمێنێ، کە هەست بە خۆت بکەیت، سروەیەکی خوشی‌ی نوێ هەر لەو کاتەدا، بە گیانت دەگات. بەکورتی، ئێمە دەتوانین، تا ئەندازەیەکی گەورە، بەهۆی بزواندنی لەشەوە، ئەو سۆزانە، هۆگری دڵمان بکەین. لە ڕێگەی لەشەوە، ئەو سۆزەی حەزی لێ دەکەیت، بینوێنە لەوەپاش بۆت دەردەکەوێ، کە تۆ دەرگایەکت کردۆتەوە بۆ ئەو سۆزە، دەتوانێ لێ‌یەوە بێتە ژووری. لەپێش دەمی کەسێکی تردا، هەستێکی خۆت، پیشانبدە، بۆت دەردەکەوێ، کە ئەو هەستە، حەزێکە بەرەبەرە بچێتە ناو دەروونتەوە.

ئەمانە هیچیان، لە جۆری «پێش بینی‌ی کورسی»ی ئاسوودە و ئاسان ناکەن. ئەمانە، هەموو، لە تاقی‌خانەی زانستی خۆناسیندا، تاقی‌کراونەتەوە. ڕاستی‌و دوروستی ئەمانە، جار لەدوای جار، بە تاقی‌کردنەوەکانی پیاوو ئافرەتی ئاسایی‌یش، هەر دەرکەوتووە.

جا بەهۆی ئەم ڕێچکانەوە، کەسانێکی زۆر، توانیویانە، گێژو وێژی‌و ترسنۆکی‌و دڵ‌خراپی‌ی خۆیان دەربارەی هەمووان، بگۆڕنەوە بە وووریایی‌و ئاوایی‌و دڵنیایی، کە ژیان لەو ناوچەوانیاندا چریسکەبکات.

ماوەتەوە چەند قسەیەکی دوایی. هەر بیر نیە، بەتەنیا کە ئێمە بکات بەوەی کە هەین. هەروەها ئەو هەستانەیشە کە لە کەسانی تر پتر سنگمانی ئاواکردۆتەوە. ژیان بەو سۆزانەوە کە پەسەندن، کڕین‌و فرۆتنێکی بەسوودە. ئێمەیش لە توانایماندا هەیە کە سۆزەکانی خۆمان هەڵبژێرین.

هەروەك دەتوانین، جورێکی تایبەتی لە دۆستان پەروەردە بکەین بۆ خۆمان، هەروەها دەیشتوانین جۆرە سۆزێکی تایبەتی بۆ خۆمان پەروەردەبکەین. ئیتر هەر ئەوەندەمان لەسەرە، کە بزانین چۆن سۆزێك بۆ خۆمان هەڵ‌دەبژێرین، بەو مەرجەی زیرەکی‌و خەمخۆری‌ی خۆیشمانی تێدا بەکاربهێنین.

# ئەو گۆڕانکاری‌یە سەرەکی‌یانەی کار دەکەنە سەر سیستەمی بلاوکردنەوە لە جیهان

## بەشی سێ‌یەم

نووسینی : د. ابراهیم الداقوقی

**٦ ـ ئابووری‌یەتی دەزگاکانی بلاوکردنەوە :**

**لە پاش** بیستەکانی ئەم سەدەیە دەزگاکانی بلاوکردنەوە بوون بە دەزگای **بازرگانی لە** ئەنجامی **ئەو** گۆڕانە مەزنەی کە **بلاوکردنەوە بە** خۆیەوەدی ، **کۆمپانی‌یە** زلەکانو دەزگاکانی ڕۆژنامە گەری دەستیان کرد بە دامەزراندنی ئێستگەی **بلاوکردنەوە** لە سی‌یەکانەوە ، پاش ئەوەی بلاوکردنەوە شێوازی نوێ‌و تەکنیکی جاردانی داهێنراوی ، داهێنا ،[٣٢] بازاری جاردانەکانی لە ڕۆژنامەکان بەرەو تر بوو ، بەجۆری ڕۆژنامەو گۆڤارەکان . ئێستا لە ١٠٪ی ئێستگەی بلاوکردنەوەی بازرگانی‌و لە ٢١٪ی ئێستگەی تەلەفزیۆنی بازرگانی‌یان هەیە لە **وولاتە** یەکگرتووەکانی ئەمەریکادا .[٣٣] لەگەڵ ئەوەی کە (بۆزانینەکان) لە **ڕادیۆو تەلەفزیۆن** سالی ١٩٧٠ بەگوێرەی بۆزانینەکانی **هۆیە**کانی تری ڕاگەیاندن

هاتنەخوارەوە لە هەموو دەزگاکانی
ڕاگەیاندنی ڕۆژئاوا ، جگە لە یابان ک
ئاستی بەرزی خۆی پاراست ، (٣٤) بەڵام
دەزگاکانی بڵاوکردنەوە لە دەوڵەتە
پیشەسازی‌یە گەورەکان بوونە دەزگای
ئابووری ، بە جۆری دەرامەتی بۆزانینەکاز
لە ڕادیۆو تەلەفزیۆن ساڵی ١٩٧٠ لە
ئەمریکا نزیکەی ٤ر٤٣٨ ملیۆن دۆلار
بوو ، (٣٥) بەتایبەتی کە زیاتر لە (٤٠٠)
هەزار کەس لە نووسینگەکانی بۆزانینی ئەو
دەزگایانە لە ولاتە یەکگرتووەکانی
ئەمەریکادا کاردەکەن . (٣٦)
لەبەرنامەی ساڵانەی ڕادیۆ لە ساڵی
١٩٦٩ دەبینین ئەم دەزگاو کۆمپانیانەو
کەسانەی خوارەوە خزمە تگوزاری
پیشکەش بەکارسازی ڕادیۆو تەلەفزیۆن
کرد لە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا :
٥٦ ئاژانسی پسپۆڕ لە بەڕێوەبردن ، ٣٥٦

دەزگای بەرهەمی ڕادیوگەری ٥٨٨
دەزگای بەرهەمی تەلەفزیۆنی ، ٣٨٨
دەزگای بەرهەم‌هێنانی بازرگانی
تەلەفزیۆنی ، ٥٥٣ دەزگای بەرهەم‌هێنانی
ئیستگەی ڕادیۆ ، ٣٠٧ کۆمپانیای
بەرهەم‌هێنانی فیلم ، ٣٩ کارگەی کاری
تەلەفزیۆنی هەمەجۆر ، ١٢٨ دەزگاو
کۆمەڵەی تایبەتمەند ، ٦٢ کۆمپانیا
خزمەتگوزاری ئەندازەگەری پیشکەش بە
ڕادیۆیەکان دەکەن ، ٧٢ دەستەی
ڕاوێژکاری کردن بەڕێوەبردنو سەرپەرشتی
٣٣ ئاژانسی دەنگوباس ، ٦٧
دەزگای پەیوەندیی گشتی‌و جار ، ٣٧
دەزگای دەلالی ی تەلەفزیۆنی بۆ
کۆکردنەوەی ئابوونەی تەلەفزیۆنی هێڵ
کاری ، ١٦٩ نوێنەری ئیستگەی ڕادیۆ ،
١٦ کۆمپانیای بازەپێدانی پیشەسازی
لەگەڵ دەیان بەکۆمەڵدان ئەو کۆمپانیاو
کارگانەی کە دەزگای پێشوازی لی‌کردنی
ادیۆو تەلەفزیۆن دێنە بەرهەم و ئابوونەی





تەلەفزیۆنی هێڵکاری دەفرۆشن .[٣٧]

لەهەموو ئەوەدا . مەودای فراوانی دەوڵەمەندیی دەزگاکانی رادیۆو تەلەفزیۆن لە دەوڵەتە گەورە پیشەسازییەکاندا دەردەکەوێ . کە یارمەتی پێشخستنی ئەو دەزگایانەو بەجێگەیاندنی ئەرکەکانیان بەشێوەیەکی کاریگەرانە . دەدات . بەتایبەتی کەدەرامەتە زۆرو زەبەنگەکانیان لە جاردانی شمەکی لە کارهێنانی بەربەرەکانی کەر .

سەرچاوەی سەرەکی داهاتی ئەم دەزگایانە پێك‌دێنن . لەبەرئەوە دەتوانن پرۆگرامی رادیۆو تەلەفزیۆنی هەمەرەنگ پێشکەش بکەن ، لەگەڵ زیادکردنی بلاوکردنەوەی رادیۆکاریو تەلەفزیۆنی .

بەلام لەو دەوڵەتە سوشیالیزمانەی کە پیشەسازی پێشبرکێی تێدانیە ، زوربەی دەرامەتی دەزگاکانی بلاوکردنەوە لەرێگەی بووجەی تایبەتەوە دێت کە دەوڵەت بۆ ئەو دەزگایانەی تەرخان دەکات ،سەرەرای ئەوەی کە دەرامەتی پرۆپاگندەی ئابووریی بەرهەمەکانی کەرتی سوشیالیست لەو وولاتانەی کە تەقەللای ئەوە دەدەن کە جەماوەر ئاگای لێبێ بۆسازکردنی توانایی هەلبژاردنی ئەو شمەکانە ، دەرامەتەکە داهاتێکی باش‌پێك دێنیٚ بۆ ئەو دەزگایانە ، بەتایبەتی کە هەندێ لە دەوڵەتە سۆشیالیزمەکان کاتێکی‌باش بۆ پرۆپاگندەی ئابووری تەرخان دەکەن ، داهاتی پرپاگندەی ئابووریی رادیۆیەکان ساڵی ١٩٧٢ لە (٥٠) ملیار دیناری یۆغۆسلافی زیاتر بوو[٣٨] بەلام لەتەلەفزیۆنی یۆغۆسلافی (٣٥) ملیار دیناری یۆغۆسلافی بوو ،[٣٩] چونکە دەزگاکانی بلاوکردنەوە . هەفتەی (٩١) دەقیقە بۆ پروپاگندەی ئابووری تەرخان دەکات .[٤٠]

ئەم دەرامەتانە ، لە رژێمە



سۆشیالزمەکان تەرخان دەکرێن ، سەرەرای دەرامەتی تر بۆ بەرز کردنەوەی ئاستی پرۆگرامی بلاوکردنەوە وبەرزکردنەوەی توانایان بۆ ئەوەی پرۆگرامی باشتر پێشکەش بکەنو کاتی بلاوکردنەوە زیاتر بێت . چونکە پەیوەندییەکی بەتین لە نێوان پرۆپاگندەی ئابووریو واقیعی ئابووری – وولاتە سۆشیالیزمەکان – داهەیە ، کە هەریەك لەوانە تەقەللای پێشخستنی ئەوی تر دەدات لە چوارچێوەی بەخشندەکانی نەخشەکێشانی ئابووریو سیاسیی دەوڵەت دا .[٤١]

**٧ – زمان**

ئەگەر زمان لەبەربەستە بنچینەییەکانی ڕژانی سەربەستی زانیاری بێ لە بوواری ڕاگەیاندنی دەوڵەتان ئەوە زمان ڕەگەزێکی گرنگ لە ڕەگەزەکانی کارتێکردنی بێ ئەرکو بەئەرکی سەرکاری بلاوکردنەوە پێك دێنێ لەبەر ئەوەی کە هەمەزمان بە دیاردەیەکی بێ ئەرك دەدرێتە قەڵەم لە سیستەمی بلاوکردنەوەدا ، چونکە دەبێتە هۆی قووت کردنەوەی جیاوازیی چینایەتیو بەردەوام بوون لە بەدەستەوەگرتنی هەندێ بنەڕەتی کۆنی ڕزیو کە سیستەمەکانی بلاوکردنەوە تەقەللای ئەوە دەدەن لە ڕێگەی بەیانکردنی سوود نەبوونییەوە ، بەتایبەتی لە دەوڵەتە نەشو نماکەرەکاندا وازی لێبێنن . هەروەها هەمە زمان – هەندێ جار – دەبێتە هۆی جۆرە دەمارگیرییەكو سەرکێشییەك کە هەردووکیان جاروبار دەبنە هۆی ڕەت کردنەوەی هاوکارییو ئاڵوگۆری بیروڕاو ، بەڵکو هەندی جار دوژمنکاری ، هەروەك لە بەلچیکا کە دژکاری دوو کۆمەڵەی فەرەنسیو فلمەنکی لەگەڵ یەکتر بووە هۆی دامەزراندنی دوو دەزگای بلاوکردنەوە بۆ هەردووکیان کە (VRT)و (RTV) ین وێڕای دەزگای (CSI) بلاوکردنەوەی تایبەت بە ئەڵمانو رادیۆی تری بیگانە[٤٢] .

هەروەها هەمە زمان بە لایەنێکی بێئەرکی سیستەمەکانی بلاوکردنەوە دەژمێردرێت ، لەبەر ئەوەی کە ئەوە پێویست بە تەرخانکردنی دەرامەتی سەرڕێژ دەکات بۆ بەرهەمهێنانی پرۆگرامی هەمە زمانو بابەت لەبەر جیاوازی ڕۆشنبیری ئەو نەتەوانەی کەبەو زمانە جیاوازانە دەدوێن . بەتایبەتی لە دەوڵەتە نەشونماکەرەکانی خاوەن دەرامەتی دارایی سنوورداریبە دانیشتوانی هێجگار قەڵەبالغ بۆ نموونە هیندستان کە (٧٠) زمانی زیاتر تێدایە ، ئەوەش هۆیەك بوو ، پاش ئەوەی کە ئیمپریالیزمی بەریتانی ماوەیەکی دوورو درێژ دەسەڵاتی هەبوو ، کە زمانی ئینگلیزی بکەنە زمانێکی میری وولات ، پاش سەربەخۆبوونی . دەشێ هەمە زمان ڕەگەزێکی بەئەرك بێ بۆ سیستەمەکانی بلاوکردنەوە کە ڕێگە بە کۆمەڵان دەدرێ ڕۆشنبیري خۆیان لە ڕێگەی پەیداکردنی ڕەگەزی هاوبەش لەناو خۆیاندا پێشبخەنو لە دوایيدا هەمەجۆری ئەم ڕۆشنبیرییانە بۆ گەشەپێدانی گیانی لێبوردن و کزکردنی دووبەرەکی تەرخان بکرێ وئینجا دەس بکرێ بە پێشخستنی ئەو ڕۆشنبیرییانە لەچوار چێوەی کۆمەڵگایەکانیان ، وەك ئەوەی کە لەیەکیەتی شورەوی لە ئارادەیە کە دەزگا بلاوکردنەوەکانی بە زیاتر لە سیی زمانی نەتەوایەتی بلاو دەکەنەوە . یاوەك لە یۆغۆسلافیا کە بە سوربیو کەرواتیو مەقدۆنیو تورکیو سلۆڤینیو ڕۆمانی کە زمانەکانی گەلانی یەکیەتیی یۆغوسلافین بلاودەکەنەوە[٤٣] ، وێرای ئەوەی کە بەزمانی ئەڵبانیو مەجەریو ئیتاڵیو ئەڵمانی کە زمانی دراوسێیەکانو کەمایەتیە دانیشتووەکانی یۆغۆسلافیان ، بلاو دەکەنەوە .

بەلام یەکیەتیی زمان ، ڕەگەزێکی بە کەڵکی سیستەمی بلاوکردنەوە پێك دێنی ، چونکە دەبێتە هۆی هەڵسەنگاندنی ناکۆکییەکانی ناوخۆو ڕاستکردنەوەی بارو دۆخەکانو پێشخستنیان بەهۆی هەست ونەستو دەربڕینی کەسیی . بەڵکو جاروبار دەبێتە هۆی دامەزراندنی سیستەمێکی یەکگرتووی بلاوکردنەوە لە ژمارەیەك لەو هەرێمانەی کە بەزمانێك دەدوێن ، وەك ئەوەی لەوولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاو ، هەرێمانی عەرەب دا لەئارادایە دوای جێبەجێکردنی پرۆژەی هەڵدانی مانگی دەستکرد ساڵی ١٩٨٢ .

لەبەر ئەوەی کە نەخشەی سیاسیی هەر دەوڵەتێك لە دەوڵەتانی جیهان کە کەمە نەتەوایەتی تێدایەو وەك هاو وولاتی لەناویاندا دەژین ، هەندێ دەوڵەت کاتی لەبار بۆ بلاوکردنەوە بەزمانی ئەو کەمایەتییانە تەرخان دەکەن ، یاخود دەزگای بلاوکردنەوەیان بۆ تەرخان دەکەن ، هەروەها ئەم سیستەمانەی بلاوکردنەوە بۆ پێك گۆڕینەوەی پرۆگرامی ڕادیۆگەریو تەلەفزیۆنی ناوخۆیان هەوڵ دەدەن ، بۆ بەهێز کردنی پەیوەندیی دراوسێیەتیو پێشخستنی ڕۆشنبیریی کەمایەتییەکان بۆ ئاگادارکردنیان بە دڵنیاییو ئاشتیو گەشەپێدانی گیانی هاووولاتییەتی چاك لەناویانداو دەسگرتنیان بەرەو برایەتیو تەباییو هۆگری لەگەڵ نەتەوەی گەورە کە ئاسایی لە زۆر لەو وولاتانە حوکم دەبات بەڕێوەو کە زمانەکانیان بەپێی دەسەڵاتی نەتەوەکە

زمانەکەی لەئارادا دەبێ . کەزۆر جار دەبێتە هۆی ڕێنمایی‌کردنی ڕادیۆیەکان بەم زمانە ، لە دەزگاکانی بلاوکردنەوەی مەڵبەندی‌یەتی . بۆ ئەو ناوچەو هەرێمانەی کە بەزمانی هەمە جۆری تر دەدوێن .

**٨ - ئایین :**

مەسەلەی ئایینی بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆو ناراستەو خۆکار دەکاتە سەر سیستەمەکانی بلاوکردنەوە لە کۆمەڵگایە جیاکاندا . لە کاتێ کە (٢٢) دەزگای بلاوکردنەوەی دەوڵەتان بۆ بلاوکردنەوەی ئایینی لە (١٦٠) وولات لە جیهاندا تەرخان کراون[٤٤] . سیستەمی ڕادیۆگەری ئایینی جیاواز لە وولاتێکدا هەیە . وەك هۆڵەندە کە پێنج دەزگای ڕادیۆی ئایینی تێدایە کە ئەمانەن .

**١ - دەزگای ڕادیۆی خۆپاریزەکان VRO**

**٢ - دەزگای ڕادیۆی کاثۆلیك kro**

**٣ - دەزگای ڕادیۆی بێ‌لایەنان VOO**

**٤ - دەزگای ڕادیۆی پرۆتستانت NCRO**

**٥ - دەزگای ڕادیۆی خۆنەبەستەوەکان بە (نەریتی کلێسای ئینگلیزی)VPRO**

وێڕای دەزگای بلاوکردنەوەی تایبەت بە سۆشیالیستەکان (EO و بێ‌لایەنەکانی خاوەن ڕێبازی ڕاست‌ڕەو (TROS) کە هەموویان ئامانجیان وەدەس‌هێنانی ئارەزووەکانی دانیشتوانی ئایینی‌و ڕۆشنبیرین . نەك دەسکەوتی ماددی .

هێرمان دیبۆلد دەربارەی ئەم بارە تایبەتی‌یەی کۆمەڵی هۆڵەندی‌یەوە دەڵێ . «زۆرانبازیی نێوان کاثۆلیك‌و پرۆتستانت لە کۆتایی سەدەی نۆزدەم بو وەهۆی جیاکردنەوەی دەزگای تایبەت بە هەریەك لەو دوو کۆمەڵە ئایینی‌یەو وێڕای کۆمەڵەکانی تر ، هەر تاقێك دەزگای تایبەت بە خۆی بۆرەخسا ، ئەو دەزگایانەی کە ژیانی هاو وولاتانی خستە قالبێکی ئایینی لەپێشکەوە تاکو گۆڕ»[٤٦] .

ئەگەر سەربەستی‌ی ئایینی لە زۆربەی دەوڵەتانی جیهان دوور لەدەس‌تێخستنی دەوڵەت پەیرەودەکرێ . ئەوە دەوڵەتی تر هەن کەلە دەزگاکانی بلاوکردنەوەیان ڕێگەی پێشکەش کردنی پرۆگرامی ئایینی نادەن ، وەك زۆربەی دەوڵەتانی باوەر بە مارکسیزم هێناو ، هەروەها ، هەندێ لەو دەوڵەتانەی کە دەستوورەکانیان دەقی زانست خوازیەتی‌یان تێداهاتووە وەك تورکیا ، بەبۆنەو جەژنەو وەرزی ئایینی ڕێگەی پرۆگرامی ئایینی دەدەن . بەڵکو هەندێ دەزگای بلاوکردنەوە هەیە کە ڕێگە بە بیروباوەڕی ئایینی نادەن ، جگە لە تاکە ڕێبازێکی ئایینی نەبێ ، کە جموجوولی خۆی بنوێنێ کە پشتوان‌و لایەنگر ڕاکێشێ وەك ڕادیۆکانی ئێران ، بەتایبەتی کە پرۆگرامی پێشکەش کراو تیایاندا کەمە[٤٧] .

هەروەها ڕادیۆی بازرگانی وا هەیە کە لە سەعاتی دیارکراوی بلاوکردنەوەیانەوە بۆ ڕادیۆی ئایینی دەگۆڕێن هەروەك ڕادیۆی مۆنت کارلۆ پەیرەوی دەکات . کە بلاوکردنەوەی پرۆگرامی ئایینی پاش نیوەشەو دەس پێ‌دەکات .

**٩ - هۆیەکانی سروشتی :**

سیستەمەکانی بلاوکردنەوە لە دەوڵەتە جیاکاندا دەکەونە ژێرکارتێکردنی هۆیەکانی سروشتی ئەو دەوڵەتانەو شوێنی جوگرافی‌و ئارەزووەکانی هەرێمی یاخود ئایدیۆلۆجیان .

بۆنموونە دەوڵەتێکی وەك ئیتالیا ڕوو بەرەکەی درێژایی ٧٢٥ میلەو پانایی لە نێوان ٨٠ و ١٣٥ میل دەبێ‌و بەرزی‌و نزمی زەوی‌یەکەی لە نزمایی‌یەوە بۆ گردو لە چیاوە بەرەو دەشتایی ، شێوازی بلاوکردنەوەی دیارکراوی گەرەکە ، بۆ داپۆشینی زەوی‌یەکانی‌و لەپێناوی وەستان بەرووی سیستەمەکانی تری بلاوکردنەوە کە دەگەنە دانیشتووەکانیان لە مۆنت کارلۆ (مۆناکۆ) و لۆکانۆ (سویسرە) و کابۆدیستریا (یۆغۆسلافیا) و تەلەفزیۆنی فەرەنسی[٤٩] . بەتایبەتی کە زیاتر لە نیوەی بەشداران لە دەزگای ڕادیۆی ئیتالیا RAI کە ژمارەیان دەگاتە (١٢) ملیۆن لەبەشی ژووروی دادەنیشن ، کەچی ٢ر٥ ملیۆن لەوانە لە ناوەڕاستی‌و ئەوانی تر بەسەر ناوچەکانی خواروو دوورگەکاندا دابەش دەبن[٥٠] .

کەچی دەبینین دەوڵەتێکی فراوانی وەك یەکیەتی شۆرەوی کە بە گەورەترین دەوڵەت دەژمێردرێت لە جیهان لە رووی ڕووبەرەکەیەوە . چونکە ڕووبەرەکەی دەگاتە ٨ر٦٤٩ر٤٨٩ میل دوو جا[٥١] (یانزیکەی ٢٢ر٤٠٢ر٢٠٢ کیلۆ مەتر دوو جا دەبێ) ودانیشتوانی لە چارەگێك ملیار کەس زیاترەو زیاتر لە (٢٠) نەتەوەی تێدایە کە بە نزیکەی (٣٠) زمان قسەدەکەن ، پێویستیان بەئێستگەو دەزگای بلاوکردنەوەی زۆر زل‌و زۆر بەهێز هەیە . لەبەرئەوە دەبینین ڕادیۆی مەمەرکەزی بەهێزی تێدایە (دوو هەزار کیلۆ وات) وپرۆگرامەکانی بۆسەر ١٧ مەڵبەندو دەزگای ڕادیۆی هەرێمی لەڕێگەی پێنج تۆری ڕادیۆ بلاودەکاتەوە ، وێڕای ئەوەی کە هەفتەی (٥٤٥) سەعات بە (٦٤) زمان بلاو دەکاتەوە .

هەروەها شوێنی جوگرافی دەوڵەت

کەدەکەوێتە نێوان سیستەمی هەمەجۆری بلاوکردنەوە ، کاردەکاتە سەر کاری بلاوکردنەوە تیایا . بەڵکو سیستەمی بلاوکردنە وەشی دەگۆرێ .

دەوڵەتی ژاپۆن کە لە ژووروووەوە بەرەو خوارو دەکشێو بەناو پێنج دورگەی گەورەو دەیان دوورگەی بچووك تێدەپەرێو کە دەکەوێتە نێوان دوو سیستەمی جیاواز :

سیستەمی بلاوکردنەوەی بازرگانیی تایبەتیی وولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکاو سیستەمی رادیۆ رەسمی یەکانی گشتی یەکیەتیی شوڕەویو کۆماری چینی میللی سیستەمێکی تایبەت بەخۆ سازکرد کە نێوان سیستەمی رادیۆگەری تایبەتیو گشتی کۆدەکاتەوە [٥٣] کەچی (کەنەدا) بەرامبەر هێزی سیستەمی رادیۆیەکان لە وولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا دراوسێ ی کەنەدا ، بەهۆی سەرسورمانو دوودڵی شکستی هێنا . . چونکە هێزی رادیۆ لەهەر کۆمەڵێك پێویستە خاڵی خۆ لەسەر راگرتنی لێ بدۆزێتەوە [٥٤] . ئەو دەوڵەتە بچووکانەی کەبە دەوڵەتی گەورە دەورەدراون ئایدیۆلۆژیەتیان جیایە لەهی وان ، تەقەللای ئەوە دەدەن کە پەیرەوی سیاسەتێکی بێ لایەن بکەن لە پرۆگرامی رددە ، بەهۆی شوێنی جوغرافیانو پاراستنی دۆستایەتی خۆیان لەگەڵ دراوسێ یەکانیان وەك ئەوەی کە ئێستا سەبارەت بەرادیۆی سوێدەوە لە ئارادایە کە پروگرامەکانی دژ بە کۆمونیزمی بلاودەکردەوە لەکاتی شەرە قسەی نێوان هەر دوو ئوردوگای رۆژهەلات ورۆژئاوا دا [٥٥] .

کە نازیەت ساڵی ١٩٣٣ لەئەڵمانیا دەسەلاتی گرتە دەستو غۆبلز بوو بەوەزیری پرۆپاگندەی رایخی سێ یەم «ئێستگە لەسەردەمی نازیەت بووە زۆرترین هۆی کارتێکردنی پرۆپاگندە زیاتر لە هەر ئامرازێکی تری هاتوچۆ پەیامی خۆی جێبەجێکرد لە رێنمایی کردنی گەلی ئەڵمانی بەرەو ئەو ئامانجانەی کە هیتلەر دەیویستن [٥٦] لە دەسەلات سەندنی هەریمی لەسەر حیسابی دراوسێ یەکانی ئەڵمانیا . رادیۆی نازیەت لە ئەڵمانیا بووە بەهێزترین رادیۆ لە ئەورووپاو [٥٧] «بۆ حزمەتی مەبەستەکانی پرۆپاگندە بۆ دەوڵەتی نازیەت تەرخان کرا [٥٨]» بۆ جێبەجێ کردنی ئامانجە دوژمنکاری یەکانی هیتلەر بە دەسەلات داگرتن بەسەر جیهانو سەپاندنی رەگەزپەرستی ی نازیەت بە سەریدا .

یاخود دەوڵەت تۆری رادیۆگەری یاخود تەلەفزیۆنی بەهێز دادەمەزرێنێ بۆ جێبەجێکردنی مەبەستە سیاسیو ئایدیۆلۆژی یەکانی لە ناوچەکەی خۆیدا یاخود لە هەموو جیهاندا . ئیسرائیل پاش شەری تشرینی ساڵی ١٩٧٣ بلاوی کردەوە کەسوورە لەسەر دامەزراندنی تۆرێکی تەلەفزیۆنی کە وولاتەکانی عەرەبو بەشەکانی تری ناوچەی رۆژهەلاتی ناوەراستو ئەفەریقا دەگرێتەوە . بۆ وەدەس هێنانی ئامانجەکانی لەرۆژهەلاتی ناوەراستدا . لە کەرتکردنی قسەی عەرەبەکانو تێکدانی تەبابیان لەگەڵ دەوڵەتانی ناوچەکەو ئەفەریقا . وێرای گومراکردنی رای عەرەبی گشتیو وورەپێبەردانی عەرەب پاش سەرکەوتنە مەزنەکەیان لە شەری تشرین دا .

هەروەها بوونی سیستەمێکی رادیۆی بازرگانی لە وولاتێکی دیارکراودا ، کار دەکاتە سەر سیستەمەکانی بلاوکردنەوەی بازرگانی تر رادیۆی لۆکسمبرگ – کە یەك لەو ئێستگانەیە کە بۆ جاردانی بازرگانی تەرخان کراون لە ئەورووپا وێرای رادیۆی مۆنت کارلۆ کاری کردە سەر رادیۆیەکانی هاوسێ لە هەریەك لە ئیتاڵیاو ئەڵمانیاو فەرەنسا ، ئەوانیش دیسانەوە رێگەیان بە بلاوکردنەوەی جاردانی بازرگانی دا ، بەتایبەتی پاش ئەوەی کۆمەڵێك لە پیاوانی خاوەن کاری فەرەنسا پێشنیارێکیان دەربارەی دامەزراندنی ئاژانسێ جاردانی بازرگانی لە فەرەنسا پێشکەش کرد [٥٩] .

**١٠ – مەسەلەی بازرگانی** :

هەرچەندە کەسیستەمی رادیۆی بازرگانیو لەئاستی بازرگانیی هەمە جۆر لە زۆربەی هەموو لایەکی جیهاندا هەیە بۆ مەبەستی بازرگانی ناوخۆ یاخود نیشتمانی ، هەندێ دەوڵەت هەولو تەقەللای ئەوە دەدەن کە سیستەمی رادیۆی بازرگانی دابمەزرێنن کە دەسەلاتیان بۆ دەرەوەی هەرێم• سنوورەکانی جوغرافیان درێژ بێتەوە ، بەجۆرێ کارەکانیان بۆ مەبەستی جاردانی بازرگانیی دەوڵەتان تەرخان بکەن ، لە پێناوی دەسکەوتنی قازانجی زۆر لە پشتەوەوە .

ئەم جۆرە سیستەمانەی رادیۆ پێویستیان بە بنیادنانی دەزگای بەهێزی ناردن هەیە . بۆ ئەوەی بتوانن رووبەرێکی بێ ئەندازە داپۆشن تابگەنە لای گوێگران لە هەموو لایەکی دونیادا . هەروەها بە ژمارەیەك زمان بلاودەکەنەوە کە پەیوەندی بە جار دەرەکانەوە هەیە کە دەیانەوێ جاردانەکانیان بگاتە ئەو کەسانەی کە بەوزمانە دەدوێن .

هەرچەندە کە رووبەری میرنشینی لۆکسمبرگ لەهەزار میل کەمترەو دانیشتوانی لە ٣٥٠ هەزار کەس تێپەر ناکات ، بەلام ئێستگەی رادیۆی بەهێزی هەیە ، تینی دەگاتە ٢٠٠٠ (دوو هەزار کیلۆ وات ، واتە وەك رادیۆی مۆسکو دەبێ لە رووی تینو لە ئێسگەکانی رادیۆی

[redacted]

دەنگی ئەمەریکا (کەهەر ئێستگەیەکی (٥٠٠ کیلۆواتە) و ڕادیۆی B.B.C کە تینی تەنیا دەگاتە هەزار کیلۆوات . تێپەڕدەکەت[٦٠] .

هەروەها میرنشینی بچووکی . مۆناکۆ دەزگای زۆر بەهێزی ناردنی بۆ ڕوو بەرە بچووکەکەی خۆی دامەزراند . کە تینی ڕادیۆیەکەی دەگاتە ١٤٠٠ کیلۆوات و بە (٣٠) زمان بلاودەکاتەوە وپرۆگرامەکانی ڕۆژێ بە درێژایی نزیکەی ٢٤ سەعات بلاو دەکاتەوە[٦١] بەمەبەستی گەیاندنی پرۆگرامی ڕادیۆ بازرگانی‌یەکانی بەهەموو گۆشەیەکی جیهان دا . لە کاتێکا کۆمپانیای SO FIRAD ی فەرەنسی خۆی لە نیوەی زیاتری بەشەکانی ڕادیۆی مۆنت‌کارلۆ هی ئەوە سالی ١٩٧٤ ئێستگەیەکی گواستنەوەی بۆ خۆی لە لبنان دانا . لەپاشان گواستی‌یەوە قیبرس . دوا بە دوای ڕووداوەکانی سالی ١٩٧٥ لە لبنان .

مەسەلەی بازرگانیی هەندێ سیستەمی ڕادیۆ کار دەکەنە سەر توانای ڕادیۆی دەولەتەکانو ڕاددەی ئەو توانایانە بە پرۆگرامی خۆخەریك کردنو ڕابوێری لە بەردەوامبوونی لەگەل گوێگر بەمەبەستی سەرنج ڕاکێشانی و ئینجا وەدەس هێنانی ئامانجەکانی لە پشت ئەوەوە . بەستراوەتەوە .

**١١ - قەدەغەکراوو ڕێگە نەدراوەکان :**

سیستەمی بلاوکردنەوە لە ولاتە جیاکانی جیهان دەکەونە ژێر کارتێکردنی قەدەغەکراوی کۆمەلایەتی و سیاسی ، لەبەر ئەوە دانەرانی پرۆگرامەکان تەقەللای ئەوە دەدەن کە خۆیان لەو قەدەغەکراوو ڕێگەنەدراوە دوور بخەنەوە لەترسی ورووژاندنی ڕای‌گشتی و کاربەدەستان دژیان . لە ئەنجامی ئەوەدا ناوەرۆکی پرۆگرامەکانی بلاوکردنەوە بەپێی کارتێکردنی سیستەمی بلاوکردنەوە لەلایەن ئەو قەدەغەکراوو ڕێگەنەدراوانە کاریان لێ‌دەکرێ . کە دەتوانین هەندێکیان بەمەسەلەی لەبارچوونو تەلاقو خۆکوشتنو داوێن‌پیسی‌و سنوور دانانی وەچەو ئابڕووبردنی نیشتمانی یاخود سەربەرزی نەتەوایەتی یا ئابڕووی نەتەوەیی یاخود پیرۆزەکانی ئایینی . دەستنیشان بکەین .

لەوولاتە موسلمانەکاندا ناشێ لە ڕادیۆ یا کۆری تەلەفزیۆنی باسی (لەبار چوون) بکرێ . چونکە ئەوە بەپێچەوانەی یاسای ئیسلامەتی‌یە کە لەبارچوونی وەك کوشتنی بەئەنقەست داناوە . لەبەر ئەوە لەبارچوون لە جیهانی ئیسلامی لەو قەدەغەکراوانەیە کەدەبێ لەکاتی ئامادەکردنی پروگرامی بلاوکردنەوە . لێی دوورکەویتەوە . بەکەمی لەکاتی ئێستادا بەلکو لەوانەیە دەربارەی ئەو قەدەغەکراوانە لە دەزگاکانی بلاوکردنەوەی سەر بە سیستەمی بلاوکردنەوەی ولاتێکی دیارکراو دەمەقالێ بەرپابکرێ . ئەگەر جیاوازی ئایینی‌و سیاسی توندو تیژ یا ڕێبازی سەرکێش هەبێت . دەزگای بلاوکردنەوەی سوشیالیزم لە هولەندە (VARA) ویستی مەسەلەی (سنووردانانی وەچە) لە پرۆگرامێ پێشکەش بکات کە سالی ١٩٦٤ بە بەشداری کردنی ژمارەیەك لە پسپۆڕان لەم بووارەوە ئامادەکرابوو[٦٢] کە چی ئەم تەقەللادانە تووشی بەرەنگاربوونێکی بەتەوژم بوو لەلایەن دەزگای بلاوکردنەوەی کاثۆلیکی لە هولەندە (KRO) چونکە سنوور دانانی وەچە لە ڕێبازی کاثۆلیکی دا قەدەغەیە .

هەرچەندە زۆربەی ڕادیۆیەکانی ئەورووپی تا ماوەیەکی نزیك خۆیان دوور دەخستەوە لە لێدوانی «لادانی جینسی» هەرچەندە کە پەرلەمانی بەریتانی ڕێگەی بەوە دابوو . کەچی دەزگای ڕادیۆی سۆشیالیزمی هۆلەندی (VARA) کۆڕێکی لەم بارەیەوە بەست بە بەشدارکردنی لادەرە جنسی‌یەکان خۆیان لە سالی ١٩٦٥ وە بەوەی لەو بابەتانەیە کەشیاوی لێکۆلینەوەو گفتوگۆ لەسەرکردنە[٦٣] .

ئەگەر زۆربەی دەولەتانی گەشەسەندوو ژمارەیەك لەو ماددانەی کە قەدەغەن بلاوبکرێنەوە لە یاساکانی چاپەمەنی خۆیان دادەنێن . بەچەشنێ قەدەغەکراوی گەورە لەناو ئەو قەدەغەکراوە زۆرانە بە تایبەتی ئەوانەی سیاسین وون دەبێ . ئەوە هەندێ دەولەتی پێشکەوتووی پێشەسازی وەکومەلایەتی لە ڕۆژئاوا ئەوەی لە ئابڕوومەندیی نیشتمانی یاخود سەربەرزیی نەتەوایەتی یا شەرەفی نەتەوە دەدات نایەلن لە دەزگاکانی بلاوکردنەوەکانیان بلاوبێتەوە کە سالی ١٩٦٨ لاوێك نامەی دکتۆرای پێشکەش کرد . کە لەیەك لە زانکۆکانی هولەندە لێی کۆلرایەوە . کورتەی نامەکە لە تەلەفزیۆن پێشکەش کرا کە لە کارە بەدەکانی ئیمپریالیزمی هولەندی‌و تاوانە شەڕخوازەکانی لە ئەندەنۆسیا لە ڕۆژانی سەربەخۆیی ئەندەنۆسیا دەدوا .

ئەو سەربازانەی کە لە ئەندەنۆسیا سەربازبوون هەلچوونو شالاوێکی توندو تیژیان بردە سەر پرۆگرامی ناوبراو ، هەروەها ڕۆژنامە ڕاست ڕەوەکانیش هێرشیان بردە سەر چونکە وایان لەقەلەم دا کە لە شەرەفمەندیی نیشتمانی‌یان دەدا[٦٤] ، ئەوەش بووە هۆی ئەوەی کە دەزگاکەی بلاوکردنەوەی ناوبراو لە هەفتەیەکدا دوو پرۆگرام ئامادە بکات تا کاروبار بگەڕێتەوە سەر دۆخی جاران .

مل ملانێی نێوان سیاسی‌یەکانو

دەزگاکانی بلاوکردنەوە دەربارەی بلاوکردنەوەی یا بلاونەکردنەوەی قەدەغەکراوو ڕێگەنەدراوی سیاسی ، بەرواڵەتێك لە ڕواڵەتەکانی ئەو پەیوەندی‌یە ئۆزەی کە لە نێوان سازکەرانی بڕیاری سیاسی‌و ئامادەکەرانی پرۆگرامی بلاوکردنەوەدا هەیە لەو دەزگایانە دەدرێتە قەڵەم .

**سێیەم : ئەنجام**

ئەگەر هەر سیستەمێکی بلاوکردنەوە دەبرینی ئایدیۆلۆژیەتی سیاسی بێ . کە سیستەمی ناوبراو لە سێبەریا هاتۆتەکایەوە وەك دەڵێن . ئەوە گۆڕانە سیاسی‌یەکان پێکەوە یا خود تاك‌تاكە کار دەکەنە سەر کاری ئەو سیستەمانەو شی‌کردنەوەی ناوەڕۆکی لە ڕووی ئامانجەکانی‌و ئەو خەڵکەی کە مەبەستی‌یەتی وکارتێکردنی ئەو خزمەتگوزارانەی کە پێشکەشیان دەکات .

لەبەر ئەوە گۆڕانکاری‌یانە سیستەمی هەموجۆری بلاوکردنەوەی وولاتانی جیهانیان لێك جیاکردەوە هەر سیستەمێك لەوانە نیشانەی خۆی هەیە کەپی‌ی لەهی تر جیادەکرێتەوە . بەلام ئەوە ڕێگە لەوە ناگرێ کە دوو سیستەمی بلاوکردنەوە یا زیاتر . لە وولاتێك گردبنەوە .

ئەگەر زۆربەی ڕاگەیێنانی بلاوکردنەوە لەسەر ئەوە ڕێك کەوتوونەکە چوار سیستەمی بلاوکردنەوە لە جیهاندا هەیە :

١ – سیستەمی بلاوکردنەوەی بازرگانی‌و تایبەتی وەك سیستەمی بازرگانیی دامەزراو لەسەر بنەرەتی پرۆژەی تایبەتی . وەك لە وولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکاو هی تردا .

٢ – سیستەمی بلاوکردنەوەی ڕەسمی یاخود میری : ئەو ڕادیۆیانەن کە دەسەلاتی دەوڵەتیان بەسەرەوەیە وەك لە سیستەمەکانی سۆشیالیزم‌و دەوڵەتە نەش‌ونماکەرەکان دا .

٣ – ئەو سیستەمە بلاوکردنەوەیەی کە دەستە گشتی‌یەکان بەڕێوەیان دەبەن : وەك سیستەمی دەستەی ڕادیۆی بەریتانی .

٤ – سیستەمی بلاوکردنەوەی نەتەوایەتی یاخود نیشتمانی ئەو سیستەمەیە کە لەیەك کاتدا دوو جۆرە سیستەمی بلاوکردنەوەی بازرگانی‌و میری بەخۆوەدی وەك لە کەنەداو ئوسترالیا .

ئەم سیستەمانە هەندێکیان لەگەڵ هەندێکی تر بەیەکدا دەچن . بەجۆری نزیکە زیاتر لە سیستەمێ لەهەر وولاتێك لە وولاتانی جیهان . بێتەکایەوە . بۆ نموونە لە ئەمەریکا . لەوێ ڕادیۆی بازرگانی هەیە لەتەك ئەو ڕادیۆیانەی کە خزمەتگوزاری دیارکراو پێشکەش دەکەن‌و دەستەی میری تایبەتی بەڕێوەیان دەبەن . وەك ڕادیۆی دەنگی ئەمەریکا . کە ئاژانسی ڕاگەیاندنی ئەمەریکی بەڕێوەی دەبات . لە بەریتانیا لەتەك دەستەی ڕادیۆی بەریتانی B.B.C سیستەمێکی بلاوکردنەوەی تر هەیە . کە دەستەی بازرگانیی تایبەتی بەڕێوەی دەبەن کە ئەویش دەزگای ڕادیۆی سەربەخۆیە I.B.A یە . لە کەنەدا ڕادیۆی بازرگانیی تایبەتی هەیە لەتەك ڕادیۆیەکانی میریی ڕەسمی‌یەوە . ئەوەیش هەمان باری ڕادیۆیە کە لە مەکسیك‌و ئوسترالیاو ژاپۆن داهەیە . وەك ئەوبارەی کە پێش ڕووداوەکانی ساڵی ١٩٧٥ کە لە لبنان دا هەبوو .

ئایا ڕێگایەك هەیە بۆ دامەزراندنی سیستەمێکی ڕادیۆیی یەکگرتوو لە هەر وولاتێك لە وولاتانی جیهان . لەبەر ڕووناکی ئەو گۆڕانکاری‌یانەی کە کار دەکەنە سەر کاری ئەو دەزگایانە ؟ .

ئەم جۆرە سیستەمە یەکگرتووە لە ژێر سێبەری یەکیەتی زمان یاخود ئایدیۆلۆژی‌یەت یاخود ئایین یاخود کە لەپووری نەتەوایەتی نەبێ پێك نایەت . وەك لە دەوڵەتە کۆمونیزم‌و سۆشیالیزم‌و ئایینی‌یەکاندا لەبەر دەسەلات سەپاندنی دەوڵەت بەسەر دەزگاکانی بلاوکردنەوە لەو وولاتانەداو پارەپیدان‌و ڕێنمایی کردنێن بۆ خزمەت کوزاریی ئامانجە ئایدیولوجییە کانی . بەلام ئەوە واناگەیێنێ کە دەوڵەتە سەرمایەداری‌یەکان‌و لیبرالی‌یەکان جڵەوی سیستەمەکانی بلاوکردنەوە ناگرنە دەست‌و ڕێنمایی‌یان ناکەن بۆ خزمەت‌کردنی ئامانجە ئایدیۆلۆژی‌یەکانیان . لەو وولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا کە یەکێك لە بەهێزترین ڕادیۆیەکانی جیهانی تێدایە . کە دەنگی ئەمەریکایە V.O.A ، ولەژێر دەسەلاتی میری دایە . لەڕێگەی ئاژانسی ڕاگەیاندنەوە . بە بەهێزترین هۆیەکانی پڕۆپاگەندەی ئایدیۆلۆژی‌یەتی ئەمەریکی‌و ڕێگەی ژیان تیایا . دەژمێردرێت . وێڕای ئەوەی کە تیژترین چەکی ئەمەریکایە لە شەڕی سایکۆلۆژی دژبە جیهانی سۆشیالیزم‌و بزوتنەوەی ڕزگاریخواز لە جیهانی سێیەم دا .

بەلام بنیادی ئابووری لەو وولاتە سەرمایەداری‌و لیبرالی‌یەکاندا ڕێگەیان پی‌ێ نادا کە سیستەمی بلاوکردنەو یەکگرتوو دابمەزرێنن ، چونکە نموونەی ڕادیۆیی لە ئارادابوو . لە زۆربەی ئەو وولاتانە بوونی دوو سیستەمی ڕادیۆیی‌یە . یاخود زیاترە . لەگەڵ لە ئارادابوونی سیستەمێکی بازرگانیی تایبەتی لەتەك ئەو سیستەمانەوە تیایاندا .



# جوانی و چێتر

جەزا عەلی ئەمین

هەموو مرۆیەك بە پێی زەوقی خۆی لە جوانی دەگا . هەندێك پێیان وایە تەلەفزیۆن سەرچاوەی خۆراکی گیانە ، هەشن بێ چەندو چوون دەڵێن خوا بۆ کەسی دانەناوە بۆ تەقاویتان نەبێ ! گەلێك مۆسیقای نزمیان بە دڵە ، هەندێکی دیکە ئارەزووی گۆرانی بە کۆمەڵی (باخ) یان لا خۆشەویستە . هەندێکیش بروایان وایە هونەری ئەهرامەکانی میسرو پەرستگاکانی یۆنانی کۆن بێ وێنەن . هەشن ساختمانەکانی نیویۆرکیان بەدڵە کە چۆن چۆنی سەری لە هەوران قایم کردووە .

ئێی وا هەیە بە پیاسەو گەرانی ناو کۆڵانە نارێکەکان دڵی دەکرێتەوە ، هەندێکی دیکەش حەزی لە سەیرکردنی ئەو شەقامە نوێیانەیە کە لەم بەرو ئەو بەرییەوە خانووی بڵند هەڵچوون .

هەندێك دەیسەلمێنن وێنەی تەجریدی لە سەردەمی تەقینەوەی ئەتۆمدا دوا ووشەی هونەو ، هونەری گەیاندبێتە ئاستی زانست . . خەڵکی کەش بەر پەرچی ئەو رایە دەدەنەوەو دەڵێن :

نامەی هونەرمەند خۆ نقوم کردن نیە لە قووڵایی ئەتۆمدا ، بەڵکو خۆ خستنە ناو قووڵایی گیانی مرۆڤایەتیو دەروونی مرۆڤایەتییەوەیە .

هەندێك دەخوازن بۆ پشوویەکی سیاحی (گەریدە) بێ بچنە دەرەوەی وولات ، تا دنیا ببینن‌و هەندێ کەل‌وپەل لەگەڵ خۆیاندا بهێنن .

هەندێك کامیراو دەفتەری بیرەوەریو قەڵەمی رەش هەڵدەگرنو بەرەو دارستان‌و رێی دێهاتەکان وەدەر دەکەون تا بە دیمەنی جوان جوانی نیشتمان مەست بن .

دەتوانین لەو بەراورد کردنەدا تا کۆتایی نەهاتن هەر بەردەمام بین بەلأم خۆشترینیان لای من بەراورد کردن‌و لە حاند راهێنانی ئەو زەوقانە نیە . .

یان بووترێ کامیان لە هەموویان بۆ من ئاشناترن ؟

بەڵکو مەبەست خورد بوونەوەیە لە کێشەیەك ئەویش ئەوەیە : (زەوقە جوان‌و ناشیرینەکان لە چی پێك دێن ؟) .

ئەو کچە قوتابییەی کە سینەمای خۆش دەوێ چۆن تەعبیر لە هەڵچوونی خۆی دەکا ؟

ئەو لە ئەنجامی بینیندا بیرو هەست‌و نەستەکانی مەرام نییە . . کە دەرهێنەرو نووسەری فلیمەکە مەبەستیانە ، ئەو بەتەنێ بە کول‌و دڵەوە

دەروانێتە هونەرمەندە جوانە کەوهیچی دیکە !

ئەمە خۆشەویستییە ، بێ شەرم وشکۆ بۆ بەڕێوەبەری گۆڤارو ڕۆژنامەی نووسیوە :

(من وێنەی هونەرمەندان کۆ دەکەمەوە ، تکایە وێنەی ئەو هونەرمەندانەی لای خوارەوەم بۆ بنێرن کە لە شارەکەماندا وەگیر ناکەون ، کاتێ وەرم گرتن پارەکەتان بۆ دەنێرم) .

پاشان لیستەیەك بە ناوی هونەرمەندانەوە دەنێرێ ، ئەوجا تەلەفونی هونەرمەندی هەڵبژاردەی خۆی وەدەست دەکەوێ ، دەیدوێنێ ، نامەی بۆ دەنێرێ ، ژووانەکانی لەگەڵدا ساز دەکات !

پێی وایە بەو تەرحە مامەڵە لە تەك هونەردا دەکرێ .

کچی ئاوا بچووك لەوە بێ ئاگایە دەربڕینی سۆز بەو جۆرە جێ پێکەنینو شەرمەزارییە . گشت دایكو باوکێك لەسەر ئەوە سوورن لە کاتو دەمێکی لەباردا خواردن بە منداڵەکانیان بدەن . . . یاخود لە سەرەتای کردنەوەی قوتابخانەدا جلو بەرگو کتێبی قوتابخانەی هەبێو کەمتر لە سەر شەقام بسوورێتەوە ، زۆرتر لە کتێبخانەدا دانیشێو لەکارو باری ناوماڵدا یارمەتی گەورەکان بدا .

کەس وکار بە هەڵەداوان رادەکەن تا کورەکەیان ، یا کچەکەیان بچێتە قوتابخانەی زمانی ئینگلیزی یا فەرەنساوییەوەو فێری مۆسقاو بەفرە خلیسکێ بێ .

منداڵ دەچێتە هەموو ئەو قوتابخانانەوە بەڵام لە راستیدا بە ئارەزووی خۆی رەفتار دەکا .

کەس وکاری دەروانە کارتی تاقیکردنەوەکان ، یا لەبەر دەرگای قوتابخانەی مۆسیقاو بەر یاریگای بەفرەخلیسکێدا دەوەستن چاوەنواری کورەکەیان دەکەن پێیان وایە بەوە ئەرکی سەرشانیان بەجێ هێناوە . . بەڵام ئایا ئەوە بەسە تا بەدڵنیاییەوە بڵێین (لەوێندەرێ مرۆی ژیرو زرینگ گەشە دەکا ؟) بێگومان نەء . . تەنها سووربوون لە سەر ئەوەی زانیاری زۆرو زەبەند بدرێ بە منداڵ بەس نیە ، بەڵکو دەبێ مەلەکەی هەڵچوونەکانی پەرە پێبدرێ تا هەست بە ئازارو شادیو خەونەکانی مێشكو دڵە گەورەکان بکا . دەبێ لە رووی گیانییەوە مرۆیەکی گەورە بێ . بوونی رەنگو قەڵەمو بۆیە لەگشت ماڵێکدا کارێکی تابڵێی پەسندە . . بەڵام لەوە لەپێشتر توانینی گۆڕینی هەموو ئەو شتانەیە بۆ دەوڵەمەند کردنی منداڵ .

هەندێ لە کەس وکار پیانۆ بۆ منداڵەکەی دەکرێ لەگەڵ ئەوەشدا هەرگیز ناچنە ئۆپێراو بالێو ئاهەنگەکانەوە . . منداڵان فێری ئەوە دەبن لە هەندێ ئامێری مۆسیقا بدەنو کەس وکار سەرسام کەن .

کاتێك گەورەش بوون بە لەخۆ رازیبوونەوە دەڵێن مۆسیقای بیتهۆڤن پیر بووە !

ئەگەر پیانۆ لە ماڵێکدا هەبوو کەسیش لێی نەدا بێگومان رۆڵی ئەو ئامێرە وەکی ئەو پەیکەرە بچووکە زۆرانەی لێ دێ کە لە ماڵدا هەنو هیچی دی . ئەوەندە هەیە وا لە مێوان دەگەیەنرێ گوایە خاوەن ماڵ مرۆیەکی رۆشنبیرە !

هەندێ چەند سەعاتێك بەدیار تەلەفزیۆنەوە دادەنیشن ، هەشن بە ناو دارستاندا رادەکەن . سێیەم کتێبێ دەربارەی (جاسوسی) دەخوێنێتەوە . چوارەم ، یان راستتر چوارەم کچ لەسەر بەرگە پشتی گوڵ دەچنێ ، هەندێ وەك کەس وکاریان دەڵێن لە پەنای سینەماکاندا دەسوورێنەوە . نێ دیکەش وەرزشیان پێ خۆشە . یا دەچنە شانۆگەرییەکەوە بێ ئەوەی گوێ بدەنە ئەوەی چ نمایشێك دەبینن .

زوربەی هەرە زۆری خێزانەکان نازانن پەروەردەی جوانی چییە ، زوربەی قوتابیان بەدەم باوێشکەوە گوێ لە مۆسیقای پەسند دەگرن . بە پەستییەوە لە هۆڵی پێشانگاکاندا دەگەڕێنو هیچ تێ ناگەن ، یان دەچنە شانۆگەرییەکەوە بێ ئەوە لەجێی خۆیدابێ قاقا پێدەکەنن ، بە مانایەکی دیکە ئامادەی جوانی وەرگرتن نەبوون . بۆ نموونە لە یەکێ لە سەربازگاکانی پێشرەواندا منداڵان کاتێ زانییان منداڵێك دەیەوێ ببێتە هونەرمەند تێرو پڕ پێ پێکەنین . پێیان وت : رەنگەکانت پێویستن دەیاندەی بەکێ ؟ یاری تۆپی پێ گرنگەو دەتوانرێ بوترێ بێ وێنەیە .

بەڵام روونو ئاشکرا نیە ئەو منداڵانە ئەو لێکدانەوە درندەییەیان دەربارەی کاری هونەرمەند کە بریتییە لە پیسیلە کوێوە هێنایان ؟ چەند جوانە منداڵ تووشی سەدمەبێ بەجۆرێ هەست کردن بە جوانی رەسەنی لا بێدار کاتەوە .

بەڵێ ، جارو بار هێمایەکی ساکار یا بزەیەك شتی وا دەڵێن موحازەرەیەکی دوورو درێژ ئەو مانایە نادا . گەورەکان گەلێ رێبازو شێوەیان هەیە تا کار لە دەروونی منداڵ بکەن . بەڵام لە کاتێکدا باسی پەروەردە کردنی زەوقی منداڵان دەکرێ کێشەکە تا ئەو رادەیە گرنگ نیە بەرادەی گرنگی پێدانێ کە پەیوەندی هەیە بە زەوقی بەخێوکەرەوە .

پەروەردەی جوانی بەشێکە لە پەروەردە بە شێوەی گشتی جودا دەبێتەوە . . پەروەردەی زەوقی هونەری هەر چەندێ گرنگ و بە بایەخ بێ بەڵام (مەرام) نیە بەڵکو هۆیەکە وا لەمرۆ دەکا بەتەنێ چێژی هونەری نەبێ بەڵکە چێژ لە ژیان بکا .

پەروەردە کردنی چێژی هونەری لای منداڵ مانای فێر کردنێتی تا بەیارمەتی هونەرەوەو لە رێگای ئەوەوە جوانی ژیان بە هەموو رووەکانییەوە ببینێ .

لە کتێبی (هەموو شتێك بە منداڵی دەستپێدەکا) وەرگیراوە ل ٦٥ — ٦٨ نووسینی سرگی میخالکوف .

# سەدەی رادیۆ

مولود حمه رنه.بی

سەرەتای سەدەی بیستەم ، پێشکەوتنێکی شارستانی مەزنی ، لە گشت رووی هونەرە ناسراوەکانیدا بەخۆیەوە بینی . لەگەل ئەم ژبارەشدا ، هۆیەکانی دەربڕینی ئەم هونەرانەو پێشکەشکردنی بە بیری مرۆڤایەتیو کۆمەلّ پەرەیسەند . ئەمەش شتێکی سروشتیيە ، چونکە پێشکەوتنی بیری مرۆڤایەتی ، دەبێ لەگەلّ پێشکەوتنی هۆیەکانی دەربڕینو دۆزینەوەی هۆی نوێی هونەری هاوتابێ . . . بۆ ئەوەی بتوانێ بیروباوەڕەکە بخاتە قالّبێکی ئەوتۆوە ، وای پێشکەش بکات کە تەلە باریکەکانی هەستو هۆش بزوێنێو ! ! بچێتە ناو مێشکەوەو بەسۆزو کاریگەر بێت .

جا ئەم شێوانە دەبڕینی ئەم سەدەیەو شێوەکانیەتی . هەڵبەتە هەر شێوەیێکی نوێ دەربڕینی مرۆڤایەتێکی نوێیو هونەرێکی نوێیە . .

داهێنانو هاتنەناوەوەی رادیۆو پەیدابوونی هۆی نوێی دەربڕین ، ئەنجامی بوونی چەندەها بارو دۆخ بووە . . . هەموو زانیاریی مرۆڤایەتی ، کە لە مێشکی مرۆڤ سەدەی بیستەمدا پەنگی دەخواردەوە ، بەشداری پالّدانی پتەرپێشەوەبردنی رەورەوەی ئەم هۆیانەی کردووە .

رادیۆ لەسەرەتای پەیدابوونییەوە ، تەنیا هۆیەکی نوێ بوو یان قۆناغێ بوو لەو قۆناغانەی کە مرۆڤ بەهۆیەوە دەیویست ئاواتو خواستی لە پێشخستنی ژیانو پێداویستیەکانی ، وەك ئاخاوتنو نووسینو چاپەمەنی بێنێتە دی .

رادیۆش ، وەك چوارچێوەو هۆیەکی نوێ بۆ دەربڕینی کۆسپو تەگەرەی مرۆڤو ئەدەبو هونەر هاتەناوەوە ، دوای ئەوەی کە شێوەو هۆیە کۆنەکان بۆ دەربڕینی هەمان بابەتو ناوەرۆك لە هەمان سەدەدا ، پەکیان کەوتبوو .

پێشکەوتنی زانستو پەرەسەندنی شارستانیەتی ، کە هونەری رادیۆیی‌یان دۆزییەوە ، توانییان دەرفەت بۆ گشت جۆرە هونەرێك ، بەتایبەتی ئەدەب ، باو بکەن ، کە پێشان لە سەرچاوەی دلّو دەروونو هۆشو مێشکی بوێژو هەستیاراندا جێگای نەدەبووەوە ، لەو کاتەی کە ئەدەبی لە ئەدەبی خوێنراوەوە بۆ ئەدەبی بیستراو پالّداو هێنایە مەیدانەوە .

نەك تەنیا ئەمەو بەس ، بەلّکو داهێنانی رادیۆو بلاّوبوونەوەی ، بە شۆرشێك لە جیهانی ئەدەبدا دادەنرێت . دەشتوانین بلّێین : رادیۆ ، بەو هەموو دەسکەوتە مەزنانەی وەچنگی هێناوە وەك فراوانترین هۆی بلاّوکردنەوەو راگەیاندن ، توانی پەیامە پیرۆزەکەی خۆی لە خزمەتکردنی پێشکەوتنی مرۆڤایەتی بەرێتەسەرو بەردەوامبێ لە پالّدانی رەورەوەی فیکری مرۆڤایەتیو ئامانجە پیرۆزەکانی بەرەو پێشەوە .

ئەمەش لەبەر چەند هۆو بەهۆی چەند شێوازێك ، لەمانە : پانوبەرینیی رووی زەمین . رادیۆ دەتوانێ پەیامە پیرۆزەکەی بگەیەنێتە دوورترین ناوچەو شوێنی سەر رووی زەمین ، بێ ئەوەی تەگەرەی هاتووچۆو بلاّوبوونەوەی نەخوێندەواریو چاپەمەنیی دواکەوتوو رێگای پێ‌شل بکات ، وە پەیرەوو شێوازی ئەوتۆ کە گشت تێی بگاتو بیری خۆی پێ دەولّەمەند بکات .

بەهۆیەوە ، ئەدەب توانی تەگەرەی ئاسنین بیرێو خوی بگەیەنێتە گشت ناوچەی زەمین ، دوور یا

نزیك ، وە تەلی باریكی هەستو هوشو مێشكی هاوولاتی هەر نەتەوەیێك لەهەر ناوچەیێك بێت بزوێنیو لە خەوی چەندەها ساڵەی ژێردەستیو دواكەوتنو كوێرەوەرییەوە هەڵی بسێنیٚ .

بەم جۆرە توانی باشترین خزمەت پێشكەش بە فیكرو بەرهەمی هونەری بكات

هەروابێتەوە ، پیتو ووشەو لاپەڕەی نووسراو – بەوێنە – لە چیرۆكێكدا یا سروودێك ، لەرێگای ئیستگەی‌رایۆوە بووە بە پیتو ووشەی بیستراو ، وە بە شێوەیێكی یەكسەر جێگای خۆیان لە گویٚی هەر هاوولاتێیك لەهەركویٚ بێت ، بیەویٚ بیبیسیٚ ، بكەنەوە . جا ئەگەر هاتوو خوێندنەوە بەند بوویٚ تەنیا بە كەرتی خوێنەوارو رۆشنبیر ، جیهانی ئەدەبیش ، جگە لەلایەن ئەوانەی بایەفی پێدەدەن ، بەرتەسك بوویٚ ، ئەوە هیچ گومان لەوە ناكریٚ كەوا رادیۆ ئەم دەرفەتەی نەك تەنیا بۆ خوێنەوارانو رۆشنبیران باوكرد ، بەڵكو بۆ نەخوێنەوارو كوێرانیش .

هۆیەكی‌تر رادیۆو ئەدەبەكە خۆیەتی :

ئەگەر بێتو لە پێشوودا ئەدەب سەرچاوەی بەپیتو دەوڵەمەندی رادیۆ بووبێت ، . . . وە رادیۆ لەم بوارەدا پشتی پیٚ‌بەستبێتو ، بەپیٚ‌ی پێویستو مەبەست ، لە قاڵبی تایبەت‌دا دایڕشتبێت ، ئەوە دەتوانین ئەوە بدركێنینو ئەوە بڵێین : بەڵیٚ ، رادیۆ لەم سەدەیەدا نەك تەنیا شیلەی ئەدەب هەڵدەمژێتو بۆ مەبەستی خۆی بەكلوردێنێتو بەس ! ! ، بەڵكو شێوەیێكی تایبەت بەخۆی لە ئەدەبدا خوڵقاند كە بەرووبوومی «سەدەی پەخشین» ە لە ئەدەب .

ئێستا ئەدەبی رادیۆ ، لەمیان بەرنامەكانی رادیۆدا ، بەشێكی بنجو پوختەی ماددەی بیستراو پێك‌دێنێت ، زۆر جاریش لە ٦٠٪ لەسەدا شەست تێدەپەڕێت .

نەك تەنیا ئەمەو بەس ، بەڵكو لە هەندیٚ دەزگای رادیۆدا ، وەك لە نیۆیۆركو پاریسو رۆمادا ، شەپۆلو كەناڵی تایبەت بە باسوخواسی ئەدەبو بلاوكردنەوەی ئەدەبو . . باسی بەسەر هاتو سەرگوز شتەی ئەدیبان تەرخان كراوە . واتە هەر لە كردنەوەوە تا كۆتایی پیٚ هاتنیان‌دا ، بەرنامەكانیان لە ئەدەب بەولاوە هیچی تر نییە .

**«سروشتی كاری رادیۆو سروشتی ئەدەب»**

ئەدەب بە مانا گشتی‌یەكەی ، ئەو هەستە مرۆڤایەتییە نەمرەیە كە لە سنووری شوێنو كات بەرزتر دەبێتەوەو ، وەك كەلتوورو فۆلكلۆر بۆ نەوە هاتووەكان دەمێنێتەوە . ئەدیبیش ، ئەو ئاوێنە پاكو بێگەردەیە كە ئەم هەستە رەنگدار دەكاتەوەو ئەوەی لە ژیانی رۆژانەیدا دەیبینیٚ ، دەیخاتە چوارچێوەی قاڵبی كاری هونەری پاكو پوختەو تەواوەوە .

ئەدیب لە مرۆڤی تری ساكار جیایە .

كەسێكی ساكار جۆرەها هەڵوێست ببینیٚ ، یا بەجۆرەها تاقیكردنەوە تێپەڕێت ، هەروەك چۆن دەچێتە مێشكی‌یەوە ، ئاواش دەردەچێت .

بەلاٚم لای ئەدیب ، دەتوانین بڵێین كەوا لە ناو دڵو دەروونیو مێشكییەوە ، وەك جۆرە تێكەلاٚوبوونو خوڵێكدانێكی كیمیاوی پەیدا دەبیٚ . . . بە ئەنجامو دووردەی نویٚو . . . ناخێكی‌تری نوێوە دەردەچێت .

لێرەدا مەبەستمان ، مانای ئەدەبو ســێنــاسانــدنــەكــانی ئـەدەبو جورەكانیو . . . ئەدیب نییە . بەڵكو مەبەستمانە بڵێین : ئایا لەم بارەیەوە ، ئەم كارە لەگەڵ سروشتی رادیۆدا جیایەیان نا؟ ، . . كە هەندێكیان بە ئەركی راگەیاندنو روشنبیركردنیو كات بردنە سەر دایدەنێن لە رێگای پێشكەشكردنی جۆرەها بەرنامە كە رادەی بیرو زانیارییان رۆشنتر بكاتەوەو وایان لیٚ بكات یەكسەر دەربكەونە سەر كاروباری وولاٚتیانو جیهانی دەرەوە . یاخود هەروەك هەندێك دەڵێن ، ئەم داواكاریە قەت لە ئەدەب ناكریٚ ، چونكە ئیشی ئەدەب دەستبەجیٚو یەكسەر نییە ، بەڵكو كارەكانی لەسەر خۆیەو دەبیٚ بە چاكیو تەواوی هەرسی بكات .

بە واتایەكی تر ، ئایا ئەركی ئەم كارە لەگەڵ سروشتی رادیۆ جوادیە یان نە؟

لە وەلاٚمدانەوەیدا دەڵێن ، رەنگە ئەم بۆ چوونە تا رادەیەك راست بیٚ ، بەلاٚم لە ئەنجامی تێروانینی تەسكین بۆ ئەركی رادیۆ هاتۆتە كایەوە .

وە ستانێكی سەرپێی بەرامبەر بەو

بەرنامانەی رادیۆ پێشکەشیان دەکات . دوو جۆر کار رەچاو دەکرێن :

یەکەمیان : کارێکە بە هەڵسوکەوت و رووداوی رۆژانەوە بەستراوە .

دووەمیشیان : لەسەرخۆیەو . با هەمان مەبەست و ئامانجیش هەڵبگرێت . بەڵام هیچ پەیوەندێکی بەهەڵسوکەوت و رووداوەکەوە نیە . کەواتە جیاوازی هەیە لە نێوان تەمسیلیەك یان سروودێك کە بۆ رادیۆ دەنووسرێ بۆ ئەوەی لە بۆنەیێکدا بلاوبکرێتەوە . وە لە نێوان تەمسیلیەك یان سروودێك کە کارێکی هونەرییەو . هەر کاتێ بویسترێ . دەشێ بلاوبکرێتەوە چونکە بە تاکە نەبەستراوەتەوە .

مەبەستی یەکەم . ئامانجی راگەیاندن یا پرۆپاگاندە یان رۆشنبیرییە . . . لەگەڵ رووداوی رۆژانە دایە . . . تەنیا شێوەکەش درامایەو بەس .

جا لەبەر ئەمە . ناتوانرێ ئەوەی کە لە رادیۆوە . وەك تەمسیلیەو شتی تر پێشکەش دەکرێت . بەهیچ جۆرێك بە ئەدەبی رادیۆ دابنرێت .

ئەوەی دەمانەوێ پێش چاوی بخەین ئەوەیە کە بەهیچ جۆرێ سروشتی ئەرك و کاری رادیۆ لەگەڵ سروشتی ئەدەب دژاودژنیە . بەڵکو دەتوانرێ وەك دەفرێك یان چوارچێوەیەك دابنرێ . ئەوەی ئەدیب دەیەوێ لە قاڵبێکی شانۆگەری یا رۆمان . . یا هۆنراوەییەوە تێیدا دابڕێژێت .

لێرەوە دەگەینە خاڵی سەرەکیی باسەکەمان . دەبێ شێوەی ئەو ئەدەبەی دەخرێتە قاڵبی رادیۆوە چۆن بێت ؟ . . . ئەو قاڵبە کار لە شێوەو ناوەرۆك-ی ئیشی ئەدیب دەکات ؟

پێش هەموو شتێك . لەم رووەوە . دەبێ دوو جۆر ئەدەب بناسین :

یەکەمیان : ئەدەبێکە بۆ دارشتنی فیکرەیێك . مەبەست و دەربڕینی جۆرە هەستێك . . هەڵوێستێك . یان بۆ خستنە تەرازوو و هەڵسەنگاندنی بارودۆخێك . . ئامانج و خواست و ویستێك . سیاسی بێ یا کۆمەلایەتی یا رۆشنبیری . . یا هەر لایەنێکی تر . . تەنیا بۆ نووسینەو . . . دوور لە رادیۆیە . واتە راستەوخۆ بۆ رادیۆ نانووسرێ . لەو کاتەشی بویسترێ بۆ رادیۆ پێشکەش بکرێ . بەکارێکی رادیۆیی و کەمە دەستکارێك لە شێوەو جۆری دارشتنی ( لەگەڵ پاراستنی بیرە سەرەکییەکە) تێدە پەڕێت . کارکەرانی رادیۆ بە « ئامادەکردن بۆ رادیۆ»ی دادەنێن .

دووەمیان : ئەو ئەدەبەیە کە راستەوخۆو یەکسەر بۆ رادیۆ دەنووسرێ . واتە نووسەر بۆ مەبەستی بلاوکردنەوە لە رادیۆوە دەنووسێ و یەکاویەکیش دەیخاتە ئەم قاڵبەوە . جا هەر جۆرە لقێك لە لقەکانی ئەدەب بێ . وە بۆ هەر مەبەستێك بێ . . . سیاسی یان کۆمەلایەتی یا رۆشنبیری . . . هتاد .

ئەدەبی هەر نەتەوەیێك بە گوێرەی بارو دۆخی و رادەی بۆ لوان و جۆری خزمەتکردن و خامە لێ تیژکردن و زرووفی لەبار . هەر جوری زرووفێك بێت ، رامیاری . ئابووری ، کۆمەلایەتی ، رۆشنبیری و فیکری . . . تاد . هەنگاو دەبڕێت و پەرە دەسێنێ و گەشە دەکات .

هەر بەمە تەرازووەش . نرخی ئەدەبەکە هەڵدەسەنگێنرێ و . مەشخەڵی رووناکبوونەوەی بیری مرۆڤایەتی . نەتەوەکە بەرزو رۆژ دوای رۆژ . لەم رووەوە . ئاسۆی گەشەداربوونی کاریگەرتر دەبێ .

خزمەتی ئەدەب . هەر رێچکەی ئەدەب . خزمەتی مرۆڤایەتی و ژیارو ژیانە .

ئەدەبی کوردی . هیچ نکۆلی لێ ناکرێ تا سنوورێك دەوڵەمەندە . بەتایبەتی ئەدەبی فۆلکلۆری . وە بە گوێرەی بارو دۆخ و . تواناو جۆری خزمەتکردن و بایەخ پێدان و بۆلو وانی دۆست و شارەزایانی گەشەی کردووەو هەنگاوی چاکی بڕیوە . هیچ کات لە میانی ئەدیب و نووسەرو خوڵقێنەرانیەوە . لە بەردەوام هەڵگرتنی مەشخەڵی رێ رووناککردنەوەی ژیانی کۆمەڵی کوردەواری و پێشکەشکردنی جۆرەها خزمەت . لەم رووەوە بەپێی بۆ لو وانو پێکران ! ! بۆ نەتەوەکەی خۆی دریغی نەکردووەو ، موعادەلەشە ، چەند خزمەت بکرێ ئەوەندە خزمەت دەدات بەقەدەر بەوەی رێی بۆ خۆش بکرێ ، رێ خۆش دەکات ، هەڵە هەڵناگرێ .

جا رادیۆی کوردی . بەرامبەر بە ئەدەبی کوردی – خاڵی یەکەم – واتە ئەدەبی دووره رادیۆ – هەروەك زۆربەی زۆری دام و دەزگایانی رادیۆ لە جیهاندا . بۆ خزمەتکردنی ئەدەب

بەشێوەیەکی گشتی‌و ئەدەبی کوردی بەتایبەتی . وە گەیاندنی ئاسۆی مەشخەڵی پرشەنگداری ئەدەبی کوردیمان بۆ بەرگوێی گشت هاوولاتی کورد . بەتایبەتی بۆ ئەوانەی کە تا ئێستا پــەردەی رەشی چــڵکنی‌ی نەخوێنەوارییان بەتەواوەتی لەسەر خۆیان فرێنەداوەو . زۆربەی ئەوانەی پاشگۆ خستووەو تا ئەم رۆژە چێژیان لەتام‌و بۆی ئەدەب وەرنەگرتووەو نرخێکی ئەوتۆ بە ئەدەب نادەن ، یا بۆ ئەوانەی کە – تا رادەیەك – دوورە پەرێزی ئەدەبن ، وەك ئەوەی بڵێن‌وا تێبروانن گوایە ئەدەب دەورێکی ئەوتۆی لە ژیانداو رادەی رۆشنبیری‌و تێگەیشتن‌و رووناکبوونەوەی کۆسپی رێگای سەختی ژیان‌و گەیشتنە هیواو خواست‌و مەبەست‌نیە ، لەو کاتەی کە خۆراکی مێشك‌و بیرەو خوێنی شادەماری لەشەو ، بڵێسەی شۆڕشی فیکرو ژیارو مرۆڤایەتی‌یە . . . پشتی بە دوو رێگا بەستووە :

یــەکــەم : وەرگێران لە ئەدەبیاتی ترەوە :

ئەمەش بە هەڵبژاردنی ئەو دەقە ئەدەبی‌یانەی کە لەگەڵ مەبەست‌و ویست‌و نەخشەی رادیۆ دەگونجێ‌و بڵاوبوونەوەی بۆ کۆمەڵی کوردەواری دەشێ .

رادیۆی کوردی ، لەم رووەوە ، تا ئێستا لە سەرەتای رێگایە . هەرچەندە – کە لە زووەشەوە دەستی داوەتێ – بەڵام زیاتر پێویستی بەوە هەیەکە :

أ – پتر هانی ئەدیب‌و نووسەرو رۆشنبیران بدات ، بەتایبەتی ئەوانەی لەم بابەتەوە شارەزان‌و دەستێکی بالایان لە گۆڕین‌دا هەیە . دەقی ئەدەبی وا هەڵبژێرێت . بەتایبەتی شانۆ و چیرۆك‌و رۆمانی گونجاوو لەبار . کە لەگەڵ تەبیعەتی کۆمەڵی کوردەوارێمان بشێ‌و . بۆ کردنە کوردی‌و ئامادەکردن‌و دارشتنیان بیانداتە وەرگێرو شارەزایان . ئەوسا بەگوێرەی کاتی پێویست‌و پلانی بەرنامەی خۆی پێشکەش بە جەماوەری کوردی بکات .

ب لە میانی پەیرەوو پلانی بەرنامە رۆشنبیریەکانیدا چەند پرۆگرامێك بۆ ئەم بابەتە گرنگە تەرخان بکات .

ئەمەش بە پیشاندانی لایەنی رۆشن‌و مرۆڤایەتی‌ی ئەدەبی جیهانی‌و روونکردنەوەی سیاو مەبەست‌و وێنە هونەرییە ئەدەبی‌یەکان . دەشێ کۆمەڵێ شارەزاو پسپۆرو زمانزان بەم‌کارە رابسپێردرێن‌و . ئەم بابەتە چاکتر بۆ رادیۆ ئامادە بکەن .

دووەم : وەرگرتن . ئەمەش بە دوو رێگادەبێ :

أ – وەرگرتن لە ئەدەبیاتی بێگانە :
هەڵبژاردنی باسێکی ئەدەبی‌و وەرگرتنی فیکرە سەرەکییەکەی . . . ئەوسا . سەزلەنوێ بە پێ‌ی لووان لەگەل سروشتی رووداو و ویست‌و مەبەستەکە ، دابرێژرێت .

هەڵبەتیشە ، نابێ فیکرە بنجی‌و سەرەکییەکە بەهیچ جۆرێك بشێوێنرێ .

ب – یان وەرگرتنی لە ئەدەبی کوردی‌یەوە .

ئەمەش لە رێگای ئەو نووسەرانەی کە لەزووەوە لە ئەدەب – بەتایبەتی ئەدەبی نەنووسراودا – دەکۆڵنەوە ، سەرلەنوێ بەشێوەیەکی ئەوتۆ دابرێژنەوە کە لەگەڵ شێوازو هۆو مەبەست‌و ویستی رادیۆدا بگونجێ .

بێگومان . لەرووی وەرگرتنەوە «وەرگرتنی فیکرە» چ لە ئەدەبیاتی بێگانە یان ئەدەبی کوردی نووسراوو نەنووسراو» . رادیۆی کوردی پتر پێویستی بە هەنگاونانەو دەبێ زیاتر بایەخ بەم لایەنە گرنگە بدات . . بەتایبەتی ئەدەبێ بایەخێکی ئێجگار زۆر بەئەدەبی فۆلکلۆری کوردی بدات . چونکە سەرەرای ئەوەی باشتر لەگەل ئەم هۆیە راگەیاندنە نوێ‌یە لــەبــارە . سەرچــاوەیــەکی پنگ‌خواردووی لێ‌بنە . وە چونکە بیستەری رادیۆ پێویستی بە بینین نییە لە تێگەیشتنی رووداو کە دەبێ لە دەقەکە دابێت . وە ئەدەبی میللیش . لەم رووەوە . لــەچــاو ئــەدەب‌و رێچکەکانی‌دا . دەوڵەمەندتری ئەدەبە چونکە پشت بە دەربرینی زارەکی‌ی دەبەستێت .

**سوود لەم سەرچاوانە وەرگیراوە :**


١ – مێژووی ئەدەبی کوردی
مامۆستا علاءالدین سجادی . چاپی دووەم – ١٩٧١ .
٢ – بڵاوکراوەیێکی خولانەی رادیۆی کوردی – بەغدا ١٩٧٨ .
٣ – گۆڤاری کۆلێجی پەروەردەی زانکۆی بەغدا «الأستاذ ژمارەی ٣ . بەرگی ١ . بەغداد١٩٨٠
٤ – گۆڤاری (الفنون الاذاعیة »– ژمارە (١٠)ی ئاداری ١٩٧٦ ژمارەیێکی تایبەتی – بغداد .

# سەرهەڵدانی ئەدەبی بەرگری لە چەند وڵاتێکی ئەوروپا

وەرگێرانی : ئازادی حەمەدەمین

ئەدەبی بەرگری :

ئەو ئەدەبە لەگەڵ پەیدابوونی چالاکی و بزووتنەوەی بەرگیریانە لە وولاتە داگیرکراوەکانی ژێردەستەی تەوەرە (المحور) لە جەنگی جیهانی دووەمدا لە ساڵەکانی ۱۹۳۹ – ۱۹٤٥ دا بووژایەوەو گەشەی کرد . ئەدەبی بەرگری بریتی‌یە لەو بەرهەمە هونەرییانەی کە لەگەڵ کاروانی خەباتی نیشتمانی‌و نەتەوەییانە لەدژی داگیرکەراندا نووسراون . هەروەها بریتی‌یە لەو بەرهەمە هونەرییانەی کە لە کاتی جەنگی جیهانی دووەمدا لەژێر کاریگەری بزووتنەوەی رزگاریخوازی گەلاندا هاتوونەتە ئاراوە .

هەروەك ئەو هەموو نووسەرە شۆرشگێرانەی کە داگیرکەران لە وولاتەکانی خۆیانیان دوور خستبوونەوە بەشدارییان لەو ئەدەبەدا کردووە .

داگیرکەرە ئەڵمانەکان بە شێوەیەکی زۆر بێبەزەییانە هەوڵیان داوە کە ئەدەب‌و کولتووری زۆر لەو وولاتانە بشێوێنن‌و دەیانەویست بە جاری کولتووری نەتەوایەتیان نەهێڵن . هەر لە ئەنجامی رەچاوکردنی ئەو سیاسەتە پرتۆقاندنەدا زۆربەی نووسەرە شۆرشگێرەکان ناچاربوون بە نهێنی ئیش بکەن هەروەك لە فەرەنسادا روویدا . یان دەچوونە ریزی هێزی بەرگری‌یەوە هەروەك لە یۆگسلافیادا قەوماو تەنها چەند کەسێك مانەوە کە بەپێی بەرژەوەندی داگیرکەران دەجووڵانەوە «وەکو دریولا روشیل . . . سیلین لە فەرەنسا . . گامسون . . لە نەرویجدا» .

رواڵەتی جیاو بنەرەتی ئەدەبی بەرگری لە بەیەك گرێدان و کار لەیەك کردنی بابەتی رزگاریخوازی نیشتمانی‌و نەتەوەیی لە لایەك‌و بابەتی کۆمەڵایەتیانە لە لایەکی ترەوە دیاری‌دەدا . ئەو ئەدەبە لە دۆخی راپەرین‌و بزووتنەوەو یاخی بووندا پێ‌گەیشت ، هەر ئەو ئەدەبە ئاوێنەیەك بوو تیایدا دەنگ‌و ناڵەی گەلە زۆرلێکراوەکان و چالاکی خەباتگێرانەی دژ بە فاشیزم دەنگی دەدایەوە . لە چوارچێوەی ئەو ئەدەبەدا پاڵەوانێکی نوێ لە دایك بوو کە نموونەی تێکۆشەرێکی قاڵ‌بووی وورە پۆڵایین بێ‌و بەراستی شیاوی ئەو ژیانە تەماوی‌و پر کوێرەوەری‌یە بێ‌و کە هەرگیز چەرمەسەری‌و تاریکی نەتوانێ بیرووخێنێ . نموونەی ئەو پاڵەوانەش لە زۆربەی بەشەکانی ئەدەبیدا بەدەرکەوت کە شیعر لە پێشەوەی هەموویانەوە دێ‌و زۆر بەسۆزو لە ناخەوە ژانی نەتەوەی دەردەبری‌و دەنگی توورەیی گەلی لێ بەرز دەبووەوە .

هەروەها تراژیدیا لە ئەدەبی شانۆگەریدا بە دیارکەوت‌و لە مەیدانی پەخشانیشدا کورتە چیرۆك زۆر بڵاوبووەوە و چەندان نووسەر لە پێناوی ئەوەی کە عیبرەت لە رابووردووەوە بۆ دوارۆژ هەڵێنجن دەستیان بە نووسینی رۆمانی مێژوویی کرد . نامەی زۆر لەو شۆرشگێرانەی کە پەتی سێدارەیان لە مل دە کرا بوونە تۆمارێکی مێژوویی بۆ ئەو رۆژگارانەی کە هەرگیز لەبیر ناچنەوە . هەروەها هەموو ئەو نووسین‌و یادنامانەی گیراوە سیاسی‌یەکان بەشێکن لەو ئەدەبە . ئەدەبی بەرگری لەسەر بنەرەتی نەریتی نیشتمانی‌و نەتەوەییانەی چەسپاو سەقامگیر بوو . تراژیدیاو قارەمانێتی وەکو بەشێك لە واقیعی ژیان بووە خۆراکی بەردەوامی ئەو ئەدەبە . هێزی بزووتنەوە خەڵکی بەرەو حەماسەتی نەتەوەیی‌و بەیت‌و باڵۆرەی میللی‌یانە هەڵوروژاند . بەرەو هەموو ئەو شتانەی کە زۆربەی نووسەرەکانی ئەوروپای رۆژئاوا وونیان کردبوو . بێ‌گومان لێرەوە شتێکی ئاسایی‌یە کە دەبێ بەرگری بەرەو ریالیزم هەنگاو بنێ‌و بیبێتە ئەدەبێکی پێشکەوتوو و رەسەنی ، گۆرینێکی خێرا لە داهێنانی ئەو نووسەرانەدا لەدژی فاشیزمدا بێتەدی ، بەتایبەتی ئەوانەی کە سەر بە جووڵانەوەی نوێ‌کردنەوەی «مۆدێرنیزم» بوون . . (هەروەکو لە شیعری ئیتالیدا) ناوەرۆکی ئەو ئەدەبە پێشکەوتنی ژیانی ئەدەبی لە ساڵانی شەردا دەخستە روو . قۆناغێکی نوێی لە مێژووی ئەدەبی نەتەوەیی‌و جیهانیدا تۆمارکردوو بووە پاڵدەرێك بۆ پێشکەوتنی ئەدەبی ساڵانی دوایی جەنگی جیهانگیری دووەم بەگشتی .

ف . س . نارکیربیر

ئیتالیا :

بزووتنەوەی (۱۹٤۳ – ۱۹٤٥) لە ئیتالیادا گیانێکی تازەی بە ئەدەب‌دا بەرادەیەك کە لە (دیکادنس)[1] و ئەو یاسایانەی کە بایەخ بە روخسار دەدەن داپچراندو دەستی بە دەربرینی ریالیستانەی ژیانی گەل کردو پاڵەوانێکی نوێ لەدایك بوو کە بریتی بوو لە تێکۆشەری دژ بە فاشیزم کە هەموو سیفەتێکی نەتەوەییانەی هەڵگرتبوو ئەو بەرەوپێشەوە چوونە لە هەموو رەنگەکانی شێوەی بەرگریدا دەنگی دایەوە هەر لە فۆلکلۆرەوە . . «گۆرانی . . . بەیت‌و باڵۆرەی میللی‌یانەی دژ بە فاشیزم» . تا دەگاتە رۆڵی دیاری شاعیرە گەورەکانی وەك ئۆنگاریتی ، مۆنتالی و سابادا . هەردوو شاعیریش . . گاتۆو کفازیتمۆدا توانیان بەسەر دابران و نامۆیی خۆیاندا زاڵ بن‌و ئەو رێبازە ئەدەبیەیەی کە لە ئیتالیادا تەشەنەی

کرد بوو و پیی دەگوترا «ئەرمیتیزم»(  ) بەجیٚ بهیٚلن . گاتوٚ کوٚمەلە شیعریٚکی لەژیٚر ناوی «سەریٚك لەسەر شەختەوە» داو کفاریتموٚدا کوٚمەلە شیعریٚکی بە ناونیشانی «شویٚنەوار لەناو دلدا» بلاوکردەوە . لەو دوو کوٚمەلە شیعرەدا ویٚنەی هونەری بەرزو بیروباوەری مرۆڤایەتی ی دژ بە فاشیزم بەئاشکرا دیارە . ئەو شیعرانە روٚلی کاریگەری خوٚیان لە تاودانی گیانی تیٚکوٚشاندا بینی بەلام سەبارەت بە پەخشانی هونەری ئەویش گرنگی بە بابەتی کوٚمەلایەتی ی دژ بە داگیرکەرانو فاشیزم داو لەو بەرهەمانەی کە دەبیٚ دەستی بوٚ دریٚژ بکریٚ کتیٚبیٚکە ناوی «مەسیح لە ئەبوٚلی دا . . راوەستا» وە کە لیڤی (١٩٤٣  ١٩٤٤) نووسیویەتی ، هەروەها روٚمانی «زندوو» کە بروتولینی (١٩٤٥) نووسیوویەتی:

بابەتی دژ بە فاشیزم بە شیٚوەیەکی چرو‌پر لە چیروٚکی دریٚژی «چەند گفتو گوٚیەك لە سیتسیلی‌دا» دەرکەوت کە فیتوریٚنی لە سالی ١٩٤١ دا بلاوی کردوٚتەوە .

هەروەها لە ریٚزی ئەو لاوە روٚشنبیرانەی کە لە کاروانی خەباتدا هاوبەش بیوون کوٚمەلیٚك لە نووسەری هاوچەرخ و ناسراو بەدیارکەوتن وەکو براتولینی ، کالغینو ، کاسولا ، باسانیو هی تر ، ئەو شاعیرانە لە نیٚوان ئەو پیٚنج سالانەی کە دەکەویٚتە پاش جەنگەوە لە بەرهەمەکانیاندا بە بزوتنەوەیان هەلدەگوتو ویٚنەی تیٚکوٚشانی قارەمانانەی گەلیان دەکیٚشا . بیروباوەری بەرگری بووە پشتیوانیٚکی بەهیٚز بوٚ گەشەکردنی ئەدەبی ئیتالیای هاوچەرخو ئەوە پیٚش هەموو شتیٚك لە لەدایك‌بوونی (ریالیستی نویٚ) لە هونەرەوە رەنگی دایەوە .

مز . م . پوٚتاپوٚڤا

**بەلچیکا :**

سان ڤاکاوت ، برات ، تیری ، کورینلیوس و – چەندان نووسەری تر لەبزووتنەوەی بەلچیکادا بەشداریان کرد . دەنگی رقو نارەزایی لەدژی شالاوی نازی پیٚش هەمووشتیٚك لەو شیعرانەدا دەنگی دایەوە کە بە فەرەنسی نووسرابوون و بەناوبانگترین پارچە شیعری ئەو مەیدانە شیعری ل . ئەندریە بوو بەناوی «سەربردەیەکی فیداکارانە» کە رقو توورەییەکی توندی بەرامبەر بە داگیرکەرەکان دەربڕی . هەروەها شیعرەکانی بلیٚك دەنگو ناویٚکی زوٚریان لەو وەختەدا پەیداکرد کە پربوون لە باوەرهیٚنان بە گەلو تواناکەی لە وەدیهیٚنانی سەربەستی . «هیٚزە داگیرکەرەکان ئەو شاعیرەیان لە سالی ١٩٤١ دا گرتو لە سالی ١٩٤٥ دا کوشتیان هەروەك لە سالی ١٩٤٤ لە گرتووخانەی فولفتیبوتیل‌دا کچە پالەوانو شاعیرەکەی بەلچیکا «مارگاریتا بیٚرفیت» یان لە سیٚدارەدا . دیسانەوە لە سالی ١٩٤٥ نووسەرو روٚژنامەنووس غ . ف ئەنیکار . . سەرنووسەری روٚژنامەی نهیٚنی (دەنگی بەلچیکا)یان لە ئوٚرمگای بیلیترین‌دا کوشت .

ف . س . نارکیریر

**بولگاریا :**

ئەدەبی بەرگری بولگاری لە سالانی (١٩٤١ – ١٩٤٤) دا پیٚگەیشتو بە شیٚوەیەکی نهیٚنی بلاوبووەوە . ئەو ئەدەبە دەنگی شوٚرشگیٚرەکانی ناوبزووتنەوەی بەرگری بولگاریا بوو لەناو گیراوە سیاسی‌یەکانو جەماوەری گەل‌دا بە شیٚوەیەکی گشتی تەشەنەی دەکرد . لە ئەدەبی بەرگری بولگاریادا ئەو بابەتو هوٚنراوانە زوٚر برەویان سەند کە گیانیٚکی پیروٚزیان بە خەباتی رزگاریخوازانەی دژی داگیرکەرو نوٚکەرەکانیان‌دا لە ناوەوەی وولاتدا «بافلوٚف»ی رەخنە گرو «کوٚلیا کوٚف»ی سەر نووسەری روٚژنامەی نهیٚنی (باتریوت) لە ریٚکخستنی نووسەرەکانی بولگاریا روٚلی دیاریان هەبوو . پالەوانی ئەو شیعرانەی کە فابتاروفو ئاسایینی دەیان‌نووسی بریتی بوو لە (خەباتگیٚر لە پیٚناوی سەربەخوٚیی‌دا) بەلام ئەو شاعیرانەی کە شان بەشانی چەکدارەکانی هیٚزی بزووتنەوە شەریان دەکرد وەکو (کیریباگیفو سەباسوٚف) بە (سوپای توٚلە سەندنەوەی گەل) یان هەلدەگوت . (فوٚدوٚ نیگارسکی) لە چیروٚکو بابەتە توٚمارەکانیدا باسی ژیانی گیراوەکانی ئوردوگاو بەندیخانەکانی دەکرد . هەندیٚ شاعیریش‌چەند کوٚمەلە شیعریٚکیان بلاوکردەوە لەو شیعرانەی کە خوٚیان لەو کاتەدا کوٚیان کردبوونەوە وەکو کوٚمەلە شیعرەکەی رادیفسکی بە ناوی «کاتیٚ کە هەوا بەتەنها بەس نی‌یە» لە سالی ١٩٤٥ نووسیویەتی .

کوٚمەلە شیعری ئەندریف (چەند گوٚرانییەکی فیداکارانە) – ١٩٤٧ .

کوٚمەلە شیعری ئەفادییا (چەند یاداشتیٚکی شوٚرشگیٚرانە) ١٩٤٩ .

**ف . ی . زولیدنیف**

**پوٚلوٚنیا :**

ئەدەبی بەرگریی پوٚلوٚنی بە بەشیٚك لە بەناوبانگترین ئەدەبی ئەورووپی دەژمیٚردریٚ لەو مەیدانەدا . نووسەرو پیاوە شارەزاکانی پوٚلوٚنیا توانیان ١٤٠٠ چاپکراو چ روٚژنامەو چ کتیٚب بلاوبکەنەوە ، سەرەرای هەموو ئەو بارە ناخوٚشو توشەو سەرەرای کردنەوەی چەندان گرتووخانەو لەسیٚدارەوانی چەندان لە روٚلەکانی ئەو وولاتە شیعر بەشی پیٚشەوەی کاروانی ئەدەبی گرتبوو و کوٚمەلە شیعری «گوٚرانیەکی سەربەخوٚ» ١٩٤٢ ، «گیانی سەربەخوٚیی لە گوٚرانیدا»

١٩٤١ «ووشەیەکی راستەقینە» ١٩٤٣ . . چەندانی تر نموونەی گەشی ئەمّ مەیدانەن .

شاعیرانی نەوەی پێشوو لەوانە ستان ، یاسترون ، دوبرو فولسکیو هی تر . . . هەروەها شاعیرانی نەوەی نوێ . . نەوەی دراماتیکی لەم چالاکییەدا هاوبەشیان کردو دەتوانین بڵێین کە بە شێوەیەکی گشتی شاعیری هەموو نەوەکان بە جۆرێکی زۆر سەیرو فراوان جموجوولّیان تێکەوتو لە شیعرەکانیاندا بابەتی نیشتمانیو سەرفرازییان دەردەبڕی . بەتایبەتی بابەتی نیشتمانی یەکێك بوو لە سیفەتەکانی رۆمانسیەتی پۆلۆنی لە سەرەتای سەدەی نۆزدەهەمدا . . کۆمەڵە شیعری «چەند هۆنراوەیەکی هەڵبژاردە» کە باگینسکی لە ساڵی ١٩٤٢ دا بلاّوی کردەوە لە هەموو پۆلونیا دەنگی دایەوە کە زۆر واقیعیانە بابەتی خەباتو داگیرکردنو ژانەکانی گەلی پیشان دەدا .

چەندان کۆمەڵە شیعری تریش دەنگیان پەیدا کرد وەکو «هەورە تریشقەی ئاسانی» کە گاتیسی نووسیبویو «پەنجەرە» کە سترونیسکی بلاّوی کردەوە . لەو مادەیەدا چەندان رێبازی فەلسەفیو گاڵتەجاری سیاسی لە شیعری پۆلۆنیدا دەرکەوت ، کە هەموو خۆیان لە چوارچێوەی یەك سیفەتدا دەدیتەوە ئەویش نیشتمان پەروەرییە . بەلاّم سەبارەت بە پەخشان ئەوە نووسینەو لێکۆڵینەوەی رۆژنامەگەرییانەو کورتە چیرۆك لەسەر لاپەرەی رۆژنامە نهێنیەکاندا خۆی دەنواند کە سەرەتاکەی بۆ ساڵی ١٩٤٢ دەگەڕێتەوە . وە لەو نووسەرانەی لەو مەیدانەدا ناویان دێ . . براتنیو زوکروفسکیو کامنیسکی بوون . لە ساڵانی شەڕدا کۆمەڵێکی زۆری نووسەران پۆلۆنیایان بەجێ هێشت لەمانە فاسیلیفسکایاو باسترناكو شینفالدو بوترامینت . هەندێك لەمانە چوونە رێزی لەشکری پۆلۆنی کە لە دەرەوە دروست بوو بوو و دەوری خۆیان لە تێکۆشان دژی داگیرکەران دەگێرا ئەو کۆمەڵە نووسەرە بەرهەمی جۆراوجۆر (لە شیعرو چیرۆكو شانۆگەری)یان بلاّوکردەوەو کۆمەڵە شیعری برۆنیفسکی شاعیر بە ناونیشانی «درەختی کەساسی» یەکێك لەو بەرهەمانەیە کە لە ساڵی ١٩٤٥ دا لە لەندەن چاپکراوە .

دیسانەوە شیعرە درێژەکەی «تۆفیم»یش (گوڵەکانی پۆلۆنیا) یەکێکە لە بەرهەمەکانی ئەو کاتە (کە لە ئەمریکادا بلاوکرایەوەو بەلاّم نەیتوانی ئەو وەختە تەواوی بکاتو لە ساڵی ١٩٤٩ دا بەتەواوەتی بلاّوکرایەوە) . لە ئەدەبی پۆلۆنی ساڵانی شەڕدا زۆر کێشەی ئایدیایىو هونەری هاتەگۆڕێ کە بووە هۆی لە دایك بوونی ئەدەبێکی نوێی پۆلۆنی .

**ئا . غ . بیوترو فسکایا**

**چیکوسلۆڤاکیا :**

ئەدەبی بەرگریی چیکوسلوڤاکی گوزارشتو کاردانەوەی ئەو بزووتنەوە بەر فراوانە بوو کە جەماوەری گەل بەرامبەر بە دوژمنان بەرپایان کرد . هێزە داگیرکەرەکانی ئەوێ چەندان رۆشنبیری دیاریان لە سێدارەدا وەکو ڤۆچیك و فانگورا ، کراتوخفیل ، بولاگ ، گابیك ، فاتسلافیك ، کونراز ، ئورکس ) .

ئەدەبی بەرگری لە چیکوسلوفاکیا ، کەوتبووە ژێر چاوەدێری رەسمییەوە بەلاّم هەر لەو کاتەدا چەند چاپخانەیەك هەبوون کە بە نهێنی ئیشیان دەکردو رۆژنامەیان بلاّو دەکردەوەو شیعرەکانی گالاس کە لەو رۆژنامانەدا بلاّودەبوەوە دەنگیدایەوەو کە بانگی بۆ تێکۆشانی گەل دەدا . وە هەر بە نهێنی نووسینەکانی (ڤوتشیك) کە لە دژی فاشیزم نووسرابوون بلاّودەکرانەوەو هەر لە ساڵی ١٩٤٥ کتێبە بەناوبانگەکەی (راپۆرتێك لەژێر پەتی سێدارەدا) چاپو بلاّوکرایەوە . بەلاّم سەبارەت بەو ئەدەبی کە دەکەوتە ژێر چاوەدێرییەوە (الرقابة) ئەوە نووسەرەکان باسی مێژوو و سروشتو سەربردەی میلیو ئەفسانەیان دەکرد لە پێناوی ئەوەی کە بە شێوەیەکی ناراستەو خۆ هەستی نیشتمان پەروەرىو بروا بە دوارۆژ دەربڕن . لەو نووسەرانە نیزفالّ ، سیفیرت ، گۆرا ، نیمان ، گرۆبین ، هەروەك غولان هەمان ئەو هەستەی بە رەمز پیشان دەدا هەروەها فانجۆر بەرهەمە پەخشانەکەی بە ناونیشانی (چەند تابلۆیەك لە مێژووی گەلی چیکیدا) بلاّو کردەوە ، وە چەند رۆمانێکی مێژوویی لەلایەن نۆڤی . . باسو . . . کۆیکادا نووسراو تراجیدیای ئەو قۆناغە مێژوویییە لە شیعرەکانی ئۆرتیندا رەنگی دایەوەو هەستی رەشبینی بەسەر ئەو شیعرە چرو ئالۆزانەدا زال بوو ، هەروەها هەستی تراژیدیانەی تێکەل بە وێڵبوون بە دوای بیروباوەری نەمردا بووە رواڵەتێکی ئەو رۆمانە سایکۆلۆژیانەی کە رگیزاگو خافلیگی رۆمان نووس بلاّویانکردوە بەلاّم لە سلۆڤاکیادا ئەوە باری نووسەران زۆر سەختو ناخۆش بوو چونکە میری ناوخۆ کە لەژێر چاودێری لەشکری نازیدا رەفتاری دەکردو دەیویست دەنگی ئەو نووسەرانە بەلای خۆیەوە رابکێشێ . . ئەوانیش دەنگی نارەزاییان بە شێوەیەکی ناراستەوخۆ دەردەبڕیو لە بەرهەمەکانیاندا گۆرانیان بە سروشتو نیشتمانیان هەڵدەگووتو بە جۆرێکی رۆمانسیانە وێنەی قارەمانێتیو مرۆڤی رزگاریخوازیان دەکێشاو بابەخیان بە نەریتی یاخی بوانەو هەندێ رووداوی شۆرشگێرانەی مێژووی نەتەوە دەدا ، هەندێ شاعیر کە هۆنراوەکانیان بۆ خەباتکردنی لە دژی داگیرکردن تەرخان کردبوو بە نهێنی بلاّو دەکردەوە لەوانە . . نوفومیسکی ،

کرال ، یەسینسکی ، سەمریك ، هتد . . زۆربەی نووسەرانیش لە راپەڕینی نیشتمانیی سلۆڤاکیادا لە ساڵی ١٩٤٢ دا هاوبەش بوونەو هەر ئەو راپەڕینە گەشەکردنی دوابەدوای ئەدەبی سلوڤاکی دیاری کرد .

**س . ئە . شیر لایموفا**

**دانیمارك :**

نووسەرانی دانیمارك زۆر کاریگەرانە لە شۆڕشی بەرگریدا بەشداریان کردو لە ئەنجامی ئەوەدا تووشی چەوسانەوە هاتن و هێزی دەسەڵاتدار کۆمەڵێکی لێ گرتن وەك . . کیرك ، سیرفیگ ، ئەندرسن ، نیکسیو ، . . بەڵام لەگەڵ ئەوەش دا لە چالاکیی خۆیان دژی فاشیزم نەکەوتن . . کیرك لە گرتووخانەدا (سروودی هۆر سیریۆندا) و رۆمانی (کۆیلە)ی نووسی . سیرفیگیش لە وەختی خۆ شاردنەوەدا رۆمانێکی پڕ گاڵتەجاڕی دژی هێزی دەستەڵاتدار بە ناونیشانی (ئایدیالیەکان ) لە ساڵی ١٩٤٤ دا بلاو کردوە بەڵام (مۆنك)ی نووسەرو پیاوی ئایین چەند بەرهەمێکی بلاوکردەوەو تیایدا داوای یەکیەتی نیشتمانی دەکردو هێرشی دەبردە سەر هێزە کۆنەپەرستەکانی دانیمارك ، بەرهەمەکانی بریتیە لە چەند کۆمەڵە شیعرێك و درامایەکی میللی بەناوی (نیلس ئەیبیس) کە لە ساڵی ١٩٤٢ دا بلاوی کردنەوە ، لە هەمان ساڵیشدا لە ئەنجامی چالاکیی بەردەوامی دژی داگیرکەراندا لە سێدارە درا هەروەها (ئەبیل) چەند شانۆنامەیەکی نووسی کە داوای سووربوون دەکات لە تێکۆشان لە پێناوی سەرفرازیدا . وەکو شانۆنامەی (شاژن) ساڵی ١٩٤٣ . بەڵام شیعری دانیمارکی سەرەرای ئەو هەموو ئازارو خەمەی کە داگیرکەران لەگەڵ خۆیان هێنابوو پڕ بوو لە بابەتی نیشتمان و باوەڕ بە دوارۆژێکی رووناك . چەند کۆمەڵە شعرێك بلاوبوونەوە وەکو (لێوارەکانی دانیمارك) و (شیعری دوورخراوەکان) کە (راسمۆسین) نووسیبوونی هەروەك چەند رۆمانێکی مێژوویش کەوتە روو . . کە دەکرێ بە بازنەیەکی گرنگی ئەدەبی دانیمارکییان بژمێرین .

**ی . پ . کۆبریانۆفا**

**فەرەنسا :**

ئەدەبی بەرگری مۆرکێکی میللیانەی هەمە لایی پەیدا کردو لە ئەدەبی بەرگریی فەرەنسەدا باشترین نووسەر بەشداریان کرد . ئەو ئەدەبە بە شێوەیەکی نهێنی زۆر پێشکەوت و چەندان چاپخانەی نهێنی دروست بوون وەکو «نیوە شەو» کە دی لیسکیورم دایمەزراندبوو هەروەها «پەرتووکخانەی فەرەنسی» هەر لە ساڵی ١٩٤٢ وە رۆژنامەی (لیتر فرانسیز) دەرکەوت کە زمانی لیژنەی نیشتمانی ر.ن بوو و (ك . دیکور) دایمەزراندبوو (کە دواییەکەی گوللەباران کرا) . نووسەرانی فەرەنسە لەو رۆژە ناخۆشانەدا زۆر قوربانیان دا وەکو چۆن گابریل بێری لە سێدارە دراو . . گ بریڤۆ . . لە شەڕدا شەهید کراو . . ر . ویسنوس لە گرتووخانەوا مرد . نووسەرانی فەرەنسە چەندان بەرهەمی هونەرییان لە شیعرو پەخشان و ئەدەبی شانۆگەری بلاوکردەوە . لەمەیدانی شیعردا کۆمەڵی شیعری وا بلاوبوەوە کە بەرهەمی چەند شاعیرێك بێ پێکەوە وەکو «نامووسی شاعیرەکان» ١٩٤٣ «ئەوروپا» ١٩٤٤ وە زێری شیعرەکانی — هەروەك پۆل ئیلوار دەڵێ بۆ شۆرشگێرەکان بوو کە گرنگی دانیان بە (خود) رەت دەکردەوەو کەمتر بایەخیان بە روخسار دەداو ئەو شیعرانە بۆ بەرژەوەندی زۆربەی گەل تەرخان کرابوون ، ئەوەشیان بە تەواوی لە شیعرە ناسك و دڵتەزێنەکانی پۆل ئیلوار خۆیدا بۆ دەردەکەوێ لە دیوانی «شیعرو زولاڵ» دا (١٩٤٢) هەروەها «روو بەروو بوونەوە لەگەڵ ئەڵمانەکان» ١٩٤٢ — ١٩٤٥ دیسان ئەو رقە پیرۆزەو ئەو بانگەوازە پڕ حەماسەتە لە شیعرەکانی (ئەراگون) دا دەبینین بە نموونە دیوانی «چەقۆیەك لە ناو دڵدا» ١٩٤١ (چاوی ئەلندا) ١٩٤٢ (بانوبتیکون) ١٩٤٣ (رۆژهەلاتی فەرەنسی) ١٩٤٥ هەروەها لە شیعرەکانی مۆسیناك ، دیسنوس ، بریڤیر ، لە ساڵی ١٩٤٢ «گۆرانیی شۆرشگێرەکان» کە دریون و کیسیل پێکەوە نووسیبویان لەناو زۆربەی خەڵکدا دەنگی دایەوە .

بەڵام لە مەیدانی پەخشاندا ئەراگون و موریاك و کامۆ بە نووسین دژی فاشیزم رۆڵی خۆیان دیت و مۆریناك کۆمەڵە بەرهەمێکی بلاوکردەوە کە بە ئەدەبی بەڵگەنامە (وثائق) دادەنرێ . لەوانە «یاداشتی گیراوێکی سیاسی» ١٩٤٥ . هەر

لەم جۆرەش ئەمپیریر «پشووداني مەزن»ی نووسیو (بلوك) ئەو نووسینانەی خۆی کۆکردەوە کە لەکاتی شەردا نووسیبوی‌و بە ناونیشانی (لە فەرەنسەی داگیرکراوەوە بۆ فەرەنسەی چەکدار» لە ساڵی ١٩٤٩ دا بلاوی کردەوە .

(فیرکور) لە چیرۆکەکانیدا وێنەی قارەمانێتی‌و شۆرشگێرەکان دەگرێ ئەمە هەر وەکو لە کۆمەڵە چیرۆکی «بێدەنگی‌ی دەریا» ١٩٤٢ دا هاتوەو واقیعی کۆمەلایەتی ئیستاتیکی تێکوشان بە هەموو دووریەکانییەوە لە بەرهەمەکانی نایان «یاریەکی نامۆ» وبۆریا «گوندەکەم لە ئاقارەکانی ئەڵاندا» وسیمون دی بوڤوار (خوێنی نامۆ) دا رەنگی دایەوە . بەلام لەبابەت شانۆوە ئەو رەخنەی دژ بە سیاسەتی تۆقاندن لە شانۆ نامەکانی ئانۆی (ئەنتیفونا» و سارتەر «مێشوولە» و کامۆ «کالیگۆلا» دا خۆی نواند .

ئەدەبی بەرگری فەرەنسی بە بازنەیەکی گرنگی نەپچراوی پێشکەوتنی ئەدەبی فەرەنسی هاوچەرخ دادەنرێ بەرەو رێگە گرتنی ریالیستی‌و نیشتمان پەروەرانەیدا .

ف . س . نارکیریر

**نەروێج :**

زۆربەی نووسەرانی نەروێج رێگەی نارەزایی دەربرینیان بە شێوەیەکی هێمنانە هەڵبژاردبوو . لە نێوان پێنج ساڵی تەواودا هیچ بەرهەمێکیان بلاونەکردەوە و هەندێکیان وولاتیان بەجێ هێشت وەکو «ئوسنیت‌و کروگ» بەلام لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ چاپخانەی نهێنی هەر دروست بوون کە چەند شیعری گریگ‌و وریس – ئەندرسن‌و ئیفرلان‌و زۆرانی تر بلاوکردەوە . گریگ چەندان نووسینی لە رۆژنامەو بلاوکراوە نهێنیەکاندا بلاوکردەوە کە لە ساڵی ١٩٤٥دا لەژێر ناوی «ئالا» دا کۆی کردنەوەو چاپی کردن ، هەروەها کۆمەڵە شیعری (سەربەستی) یش خستە بەردەست بەلام ئیفرلان لەبەر بەشداری‌کردنی لە بزووتنەوەی بەرگریدا خرایە گرتووخانە ، ریس – ئەندرسن بۆ سویسرا هەلات و لەوێ لەگەڵ شاعیرە نەروێجیەکانی تردا دەستی بە شیعر هۆنینەوە کردو بە تایبەتی لەگەڵ د . هاغیرۆب‌و کە شیعرەکانیان نیشتمانی‌و بانگی بۆ خەباتکردن لە دژی داگیرکەران داوەداو

چەند کۆمەڵە شیعرێکی چاپکردو بەنهێنی بۆ نەروێجی دەناردنەوە .

لەمەیدانی رۆماندا چەند نووسەرێك چەند رۆمانێکیان لەسەر خەبات و ژیانی گەلی نەروێجیان نووسی کە تیایدا چەمکی مرۆڤی خەباتگێری دەدا بەدەستەوە . لەوانەش رۆمانی (بۆرگین) (هاوین)نی‌یەو نابێ لە ساڵی ١٩٤٢ هەروا رۆمانی (ماڵ) لە ساڵی ١٩٤٥ هەروەها چەند رۆمانێکی مێژوویی بلاوبوونەوە .

**ل . گ . گریگوریفا**

**هەنگاریا :**

ئەدەبی بەرگری هەنگاری یەکەم جار زۆر پێش‌کەوتوو نەبوو بەلام ئەو بارو دۆخەی کە شەرو سیاسەتی تۆقاندنی کۆنە پەرستانە دروستیان کرد و ئەو بیرو باوەرە توندو تیژەی دژ بە فاشیزم لە زۆربەی ئەو بەرهەمانەی کە لە نێوان ساڵانی ١٩٣٩ – ١٩٤٥ دا بلاوبونەوە رەنگی دایەوە شیعر لەو مەیدانەوا رادیکالیانە بوو وە بۆ نموونە ئەو شیعرانەی کە رادنوش لە گرتووخانەی نازی‌یەکاندا نووسیبوی زۆر بە ئاشکرا دەست بۆ ئەو رووخان‌و دارمانەی کە شوێنەواری شەر بوو درێژدەکاو تێیدا داوای خەباتگێران دەکا . . بەلام شیعرەکانی گیبرش ولوکاش بە ئازار هەڵئاوسابوون‌و پربوون لە گیانی یاخی بوون و رەت کردنەوە .

دیسان گیراش دیوانێکی شیعری لە ساڵی ١٩٤٢ – ١٩٦٧ دا بە ناوی (دانوب لە ئازاردا دەتلێتەوە) بلاوکردەوەو ماداراس‌و فولدیاك و زیگموندو فودور و شاعیرانی دیکە هەر بەو رێبازەدا رۆیشتن بەلام سەبارەت بە پەخشانی هونەرییەوە ئەوە زۆر نووسینی دژ بە فاشیزم کەوتنە روو وهکو ئەو نووسینانەی خامی لوکاش نووسرابوون و ئەو چیرۆکانەی کە گابوری چیرۆك نووس بلاوی کردنەوەو هەر وا ئەو بەرهەمانەی کە نووسەرانی هەنگاری لە دەرەوە بلاویان کردەوە .

**و . ك . روسیانۆف**

**هۆڵەندە :**

ئەدەب بە گشتی لە ساڵانی داگیرکردندا دەنگی زۆربەی

گەل بوو و زۆربەی نووسەران دەستیان لەگەڵ دەزگاو رۆشنبیریەکانی بەریۆبەرانی ئەلماندا تێکەڵ نەکردو پەنایان بردە بەر ئیش‌کردن بە نهێنی ئەو شیعرو کورتە چیرۆکانەی کە لە دژی رژێمی نازی نووسرابون هەر بە چاپی دەستی چاپدەکران و بە نهێنی بلاو دەبونەوەو شاعیران رۆڵێکی دیاریان لە ئەدەبی بەرگری هۆلەندەدا گێرا .

لە ساڵی ۱۹٤۳خوێندکارەکانی زانکۆی ئەمستردام کۆمەڵە شیعرێکیان (کە شەش جار لە چاپ درایەوە) بلاوکردەوە کە بە شێوازی گۆرانیە گەرمەکانی چەرخی نۆزدەهەم نووسرابوون بەلام پربوون لە ناوەرۆکی سیاسی بە هێزو هاوچەرخ .

م . پەنهاوەری شاعیر زۆر چالاکی نواندو چەندان کۆمەڵە هۆنراوەی وەکو (بۆ شەهیدەکان) و (ئێمە ئازادین) بلاوکردەوە . بەلام کابرت (ئەو کەسەی کە زۆری ژیانی لە گرتووخانەدا بردەسەر) لە ساڵی ۱۹٤۳ «سروودی ئەو هەژدە شەهیدەی کە ملیان کرا بە پەتا» ی بلاوکردەوە کە دواییەکەی برە سروودی نیشتمانی سالانی داگیرکردن هەروەها . . هورنیك . . دینکیرین . . دونکر خاوەن هەلوێست‌و دەناگی خۆیان بون .

سەبارەت بە پەخشان ئەوە ئەو بەرهەمە هونەریەی کە پێ‌ی دەووترا «یاداشتەکانی ئانا فرانك» ئەوە لە جیهاندا ناوبانگی پەیداکردو بوە تۆمارێکی قۆناغی سالانی داگیرکردن .

دیسانەوە رۆمانی دیکیر بە ناونیشانی (لەژێر پێلاوەوە) ۱۹٤٥ بە یەکێك لەو بەرهەمە باشانەی سالانی شەر دەژمێردرێو کە لە دووتوێ‌ی‌دا زۆربەی رووداوەکانی پێش جەنگو سالانی یەکەمی جەنگەکە تۆمار کرابوو . رۆمان توانی زۆر ریالیستی‌و هونەریانە وێنەی ژیانی زۆربەی بەشەکانی کۆمەڵ بگرێ .

**ی . ف . فولیفیگ**

**یۆنان :**

یەکێتی نووسەرانی یۆنان توانی بەشداریەکی کاریگەرانە لە بزوتنەوەی بەرگریانەدا بکات . شیعری سیکیلیانوس (سەرۆکی یەکیەتی) و لە شیعرەکانی فارنیلیس ، رێسوس . فریتاکوس ، ئیلیتش ، سیفیریس ، ئەنگولیس و چەندانی تر بەدەست دەنووسرانەو بلاو دەبونەوە یان هەر پەنجا تا سەد دانەیان لیّ چاپ دەکرا .

شیعرەکانی کارفونیس‌و نابادکاو روناس بیوونە گۆرانی شۆرشگیرەکان و هەر لە ساڵی ۱۹٤۲ وە ئەو رۆژنامەو گۆڤارانەی کە لە ناوچە ئازادکراوەکاندا چاپ‌دەکران شیعرو کورتە چیرۆکیان بلاودەکردەوە . . لە ساڵی ۱۹٤٥ دا رۆمانی کورناروس بە ناونیشانی (گرتووخانەکانی نازی) کەوتە بەر چاوان و کە تێیدا باسی هەلوێستی قارەمانانەی نیشتمان پەروەران لە گرتووخانەکاندا دەکات .

هەر لە هەمان ساڵدا (خاسدیس) بەرهەمێکی بە ناوی (ئاگر) بلاوکردەوە کە بۆ تێکۆشانی هێزی رزگاریخوازی ونیشتمانی تەرخان کرابوو . . نەریتی شۆرشگێرانەو بەرگریانە بوە سیفەتێکی سەرەکی ئەو ئەدەبە یۆنانیەی کە لە دوا بەدوای چلەکانەوە تا حەفتاکانی نووسرا .

**(یانیس موگاس)**

**پەراوێز :**

۱ — لە ووشەی فەرەنسی Decaeuce هاتووە کە بە مانای رووخانو دارمان و تیّ‌شکان دیّ . بەر هەموو دیاردە شکستی‌یانە دەگوتریّ کە بەرەو کولتوری ئەوروپی لە کۆتایی چەرخی نۆزدەهەم تا سەرەتای چەرخی بیستەم داهات کە بوە هۆی زالّ بوونی هەست بە تیّ‌شکاندو رەشبینی و خنکانەوەو بێزاری لەژیانو دوورکەوتنەوە لە کۆمەلّ .

۲ - لە ووشەی ئیتالی Poes iaermetica هاتوە رەوتێکی ئەدەبیانەیە کە واقیع رەت‌دەکاتەوەو هێز دەداتە بەر ژانەکانی خودی بۆ ناو جیهانی ناوەوەی تاك شۆر دەبێتەوە . لە بیستەکانو سی‌یەکانی چەرخی بیستەم لە ئیتالیادا بلاوبووەوە .

لە ژمارە (٤) ی ساڵی ۱۹۸۱
گۆرینی بۆ عەرەبی

کۆڤاری (الثقافة الأجنبية) – ژمارە (٤) ساڵی ۱۹۸۱ وەرگێردراوە .
کۆرینی بۆ عەرەبی : د . ضیاء نافع




ئەگەر سەر لە هۆنگ‌کۆنگ بدەیت ، کە بریتیە لە نیمچە دوورگەی (کولون) ناچاردە بیت شارەزایی‌یەك بکەیت دەربارەی دورگەکانی پەیدا ، کە (٢٣٥) دورگەن‌و ، بە قەراخی بەشی باشوری وشکانی چین‌دا بلاو بوونەتەوە .

ئەم شارە قەرەبالغترین شارە گوێ دەریایی‌یەکانی جیهانەو ، لە هەموویان زۆرتر سرنجی مرۆڤ رادەکێشێت .

لە هەموو شت گرنگتر ئەو گەلە کەشتی‌ی راوە ماسی‌یە ، کە (٧٠٠) کەشتی‌ی یا میللەتی (کەشتی)ن ، کە تا ئیستاش روون نەبوەتەوە چین ؟ ! . .

## بزوێنەرو بایەوان

هەر بۆ نموونە یەکێك لەو کەشتیە بچووکانە (٧٠) پێ درێژەو دوایەکەی بەرزەو پێشەوەی چوار گۆشەییەو ، لە داری بەڕوو بەشێوەی پتەوو بەهێز دروست‌کراوە . (٣٠) کەسی تیایە ، هەندێکیان ژن‌و منالن ، سەربانە پانەکەی جمەی دێ لە بەرزکەرەوە دارینەکان‌و پەتی بەستراوو ، داری سەولی قورس قورس .

جا لەگەلّ ئەوەشدا ئیستە بەرەو ئەوە دەرۆن کە بزوێنەری بە دیزل کارکردوو بەکاربێنن ، هێشتا ئەم کەشتیە بچووکانە سێ بایەوانە سپی‌یە بابەتە کۆنەکانیان لە پێشەوە لێ‌بەستراوە . .

لە سەربان سێ ژووری پان‌و خاوین هەیەو چێشتخانەو گەرماویان تێدایە . . ژوورەکانی پێشەوە زگورتی‌یەکانی تیا دادەنیشن . . . دەریاوانە خاوەن خیزانەکانیش لە ژوورە ناوەراستەکانان ، کە کراون بە چەند بەشەوە ، ژووری دواوە بۆ خاتو (شان)ی خاوەن کەشتیەکە تەرخان کراوە .

## ٭ لەشی بتەو ٭

بە درێژایی چەند سەدەیەك رۆلّەکانی نەتەوەی (تانکا) لەسەر رووی ئاوی باشووری چین ژیاون بێ ئەوەی کەس دانی‌پیا نابن کە ئەمانە چینین ، هەر لەبەر ئەمەش چین لە سەرەتای ئەم صەدەوە نەبێت رێگای نەداون لەسەر وشکانی بژین‌و ، نەیاندەتوانی خزمەتی میری بکەن ، یا ژن‌و ژن خوازی لەگەلّ ئەهلی ناوچەکەدا بکەن ، لەبەر ئەمەو لەبەر ئەو نیمچە گوشەگیری‌یە کە دووچاری بوون ، ئەم خەلّکە رووخۆش‌و قسەخۆشانە هەستێکی بەهێزی سەربەخۆیی‌یان هەیە . . .

ژمارەی ئەمانە ئەمرۆ دەگاتە صەد هەزار کەس (٦٠) هەزاریان خەریکی راوە ماسین‌و ، ئەوانی تریان خەریکی کارو باری ترن . .

ئەم نەتەوەیە کورتە بالاو لەش بتەون‌و ، لوولاقی قاچیان مەیلەو کەوانی یە ، جا ئەگەرچی ئەمانە وەك ئەوەنین کە ئەفسانەی ئەوناوە دەیلێت : گوایا هەر پێ‌یەکیان شەش پەنجەی هەیە ، پیاوە زیرەکەکانی پۆلیس دەلێن بە ئاسانی دەتوانن پێمۆری ئەمانە بناسنەوە ، چونکە وێنەی پێ‌یان نیمچە چوار گۆشەیی‌یە .

## « ئەفسانەو بیرو باوەڕی پڕو پووچ»

خاتو «شان» کە کەشتیە بچووکەکەی لە باوکیەوە بە میرات بۆ هاتوەتەوە ، تەمەنی (٣٥) سالّە ، ئەگەرچی بەهۆی گۆڕانی کەشی دەریاوە بە دیمەن لەوە گەورەتر دەنوێنێ . . . ، لە مێردەکەی (٨) منالّی هەیە ، لە کوڕێکی حەڤدە سالانەوە هەتا کچێکی بچووکی سێ سالانە ، کە هەموو کاتی لەگەلّ توتکە سەگێکی یاریکەردا دەباتەسەر .

هەتا ئیستاش هەندێ بیروباوەڕی پڕوپووچ هەیە لە نێو ئەمانەدا باوەو برەوی هەیە . . ، زۆر کەس لەمانە باوەڕیان وایە




هەڵگێرانەوەی ماسی لەسەر مێزی نانخواردن پاش لێخواردنی شتێکی زیانبەخش و ترسێنەرە بەڵکو پێویستە بەو حاڵەوە بەرز بکرێتەوە ، هەروەها هەمان رایان هەیە دەربارەی قاپی برنج ، واتە : هەڵگەراندنەوەکە کەشتی یەکە دووچاری مەترسی نوقومبوون بکات ! ! ! . .

**• سروودو گۆرانی •**

(نەتەوەی کەشتی یەکان) مردوەکانیان هەرگیز لە دەریادا دەفن ناکەنو ، ئەو پەری هەوڵدەدەن بۆ ئەوەی نەیەڵن کەسیان لەسەر کەشتی یەکان بمرن ، لە بەندەرە سەرەکی یەکاندا خەستەخانەی سەرئاو هەیەو لەوێ تیمارو دەرمانی نەخۆشەکان دەکەنو ، لەکاتی مەترسیدا دەیانگوێزنەوە بۆ وشکانی تا چار وتیماری پێویستیان بۆ جێبەجێ بکەن .

هەتا ئەم دواییەش تەنها ئەو کچانە دەرۆیشتن بۆ وشکانی کە بۆ ئیش کردن لای دانیشتوانی وشکانی راهێنرابوون ، بەڵام ئێستە هەندێکیان بە بووکی دەچن .

ئاهەنگی بووك گواستنەوەش لەسەر ئەم کەشتیە بچووکانە دەبێتە هەروا هوریاو بەزمو رەزمو ، شەراب وەك ئاو لە نێوان گۆرانیو گۆڵمەزدا دەرژێت .

**• رەنگو رووناکی •**

گەورەترین بەندەری راوە ماسی لەم موستەعمەرەدا (بەردین)ە ، ١٩ هەزار کەسی تێدا دەژی ، ئەم بەندەرە لە ژووری هۆنگ کۆنگەوەیەو ، شەوو رۆژ پڕە لە جموجووڵو بزوتنەوە ، لەم شوێنەدا هەموو چەشنێکی ماسی راو دەکرێتو ، لە هەمان کاتدا کەشتی نەفەرات کە بەهەمە چەشنەی جۆراو جۆر رازێنراوەتەوە مەعمیلەکان دەگەیێنێتە لوقەنتە سەر ئاوی یەکان ، کە ئەوانیش بە رەنگو رووناکی نەخشێنراون ، لەوێدا مرۆڤ دەتوانێ ماسی یەك هەڵبژێرێت لەوانەی کە هێشتا لەنێو حەوزەکاندا مەلەدەکەن تا ئامادە بکرێت بۆ ژەمێکی خواردن !

بە هەرحاڵ ژمارەیەکی کەم هەن لە نەتەوەی کەشتی یە بچکۆلەکان کە بە دەوڵەمەند حسێب دەکرێن ، ئەگەرچی دوای جەنگی دووهەمی جیهانی حاڵیان چاکتر بووەو ، کاربەدەستان دەستی یارمەتی بۆ درێژکردنو ، (رێکخراوی فرۆشتنی ماسی) بۆ دامەزراندن ، کە دەزگایەکی بازرگانیو ئیستیشاری ی سەربەخۆیە ، هەروەها تەکنیکاری و گۆرانی گەلە کەشتی ئەنجامێکی باشی هەبوو ، ئێستە منداڵەکانیان دەتوانن برۆن بۆ یەکێك لەو چواردە قوتابخانەیە ، کە بە تایبەتی بۆ منداڵەکانی ئەم راوچی یانە کراونەتەوەو ، هەندێکیشیان دەتوانن خویندنی ئامادەییش تەواو بکەن ، بەڵام بەشی زۆریان پیشە نەتەوەیی یە تەقلیدی یەکەیان لا باشترە . .

خێزانی (تانکت) هەموو شەوێك خەریکی راوە ماسی دەبن بێجگە حەفتەیەك لەسەری ساڵی تازەی چینی داو لە جەژنی کەشتی یەکانی ماردا ، ئەم مارە گیاندارێکی خەیاڵی ی چینی یە ، کە لە مار دەچێتو گڕ لەناو دەروونی یەوە دەردەچێت ! . .

خێزان لەم کۆمەڵە دا رۆژی سێ ژەم نان دەخوات ، سبەنیان زوو ، پاش هەڵرێژانی ماسی یەکانیان لە بازاری ماسی فرۆشتن لە (بەردین)دا بەرقلیان (فطور) دەکەن . .

ئەم گەلە بەوە ناوبانگی دەرکردوە کە لەوەختو ناوخت دا حەز لە مۆسیقاو گۆرانیو رابواردنی جۆراوجۆر دەکەن .

دەریاوانەکانی «تانکا» زۆر لە مێژە بەری بەدێی ئەستێرەکان ناوجەرگی دەریاکانیان بریوە ، هەر لە سەدەی پێنجەمی زایینەوە کەشتی یە بچووکەکانیان گەیشتوونەتە نیمچە دوورگەی عەرەب . .

هەندێ بەڵگەش هەن ئەوە دەگەیەنن کە ئەم کۆمەڵە لە سەدەی هەشتەمی زایینیدا سەری لە کەناری رۆژاوای کارتی ئەمریکا داوە ، واتە : پێش ئەوەی کە (کریستۆف کۆلۆمبس) لە سەدەی پانزە هەمدا ئەم کەرتە بدۆزێتەوە .

# بولبولی کوردستان

## سەیدعەلی ئەسغەری کوردستانی

**« بولبولی کوردستان »**

– لەو ڕۆژگارەوە کە «گرامەفۆن» گەیوەتە خاکی کوردستانو «قەوان» زایەڵەی دەنگی گۆرانیبێژی کوردیی گەیاندووەتە گیانو گوێی کۆمەڵی کوردەواییی کوردەواری ، لەو تافە تریفە دارەوە مێژووی نوێی کۆرانیی کوردی دەست پێدەکات .

– بۆ یەکەم جار بەگۆیندە وگۆرانیبێژێکی بلیمەتیان گوتووە (بولبولی کوردستان) . ئەم ڕێزو نازو ناوەیان بە خۆڕایی پێ‌نەداوە . بەڵکوو شکۆی ئەو بەهرەمەندە زۆر لەمەپتری شایان بووە .

چونکە نەغمەی بولبول لاڵە ! ! بەڵام نەغمە ونەوای «بولبولی کوردستان» خاوەنی زمانەو زولاڵە . !

شاعیرێکی کورد زۆر بە «ڕێز» و «پێزانی» پەی بە سۆز و سازگاریی ئەو دەنگە خۆشەو بەهرەی ئەو گۆیندە نەوا سازە بردووە . شەپۆلی ئاوازی گوڵبانگی ئەو دەنگخۆشە ، گۆشەو کەناری دڵو دەروونی داگرتووە بۆیە بەکوڵ دەڵێت :–

« گوڵزاری هونەر دوور لەتۆ چۆڵە»
«بولبولان بێ تۆ دەنگیان کڵۆڵە »
« بەزمی دڵداران ، بێ‌تۆ ، بێ‌شەوقە»
« ئاهەنگی‌یاران ، بێ‌تۆ ، بێ‌زەوقە »
«بەهاری هونەر هەرگیزاو هەرگیز »
«کاری تێ ناکا خەزانی پاییز »
«چوون چریکەی تۆ هێشتا بەگەرمی»
«دڵ ئاگر ئەدا ئوستاد بە نەرمی»[(1)]

( ! )






بەلێ ئەم بەهرەمەندە (ئوستاد) بووە . . ئوستادی[٢] هونەری گۆرانیی کوردی ئوستادی (نەغمە)و (نـــــەوا)و ئـــــاوازی ڕەسەنی کوردیی ،

– لە هیچ قوتابخانەیەکی هونەریدا نەیخوێندووە ، لە هیچ مامۆستایەك دەرسی وەرنەگرتووە . تەنیا قوتابخانەی ، (سروشتی جوانی) کودستان بووە

لە چاو هەڵهێنانی (بەیان) دا ، کە ڕەنگی شەبەق لێوی ئاسۆ ئاڵ دەکا . لە (ئێواران)دا ، کە خۆر دەم ئەنێتە دەمی کەلو ڕەنگی زەرد هەڵ دەگەڕێ و لە عاشقێکی لێو بەبار دەچێت .

ئالەو دەمانەدا ، ئەو بەهرەمەندە (ئیلهام)و دڵخوازی خۆی لە (ئەرز) و (ئاسمان) وەرگرتووە .

« نە زانستگای هونەر چوو بووی»[٣]
«نـــەهـــیچ کـــەس ڕێگای پـیشـــان دای»
«نـــــازانم چۆن بووی بــــەوە بووی؟»
« هی چـی یـــە ، چۆن وا شاوەستـــای ؟»

بەم شێوازە مامۆستا (محەممەدی مەلا کەریم) بەهرەی ئەو گۆیندەیەی کورد هەڵدەسەنگێنێ .

بەڵام سەبارەت بە دەنگی دڵکێش و سۆزو ئاوازە خۆشەکانی دەڵێت :

(خوای گۆرانی و ئـــــــــاوازو ساز)
نــــازانم چۆن پـــیـــاتـــا هـــەڵدەم ؟
(هـــەرچی بـــڵێم نـــاگەمـــە نـــیـــاز)
دەم لاڵە وکۆ لە قـــــــــــەڵەم .

● ●

(چـــر یـــیـکـــەی دەنگی خۆش نـــەوات)
هـــــەستی کوردیم ئـــــەبـــــزوێنێ



«گویٚ گرتن بۆ بـــــــەزی سەدات)
داخی دڵم ئـــــــــــەڕەوێنی»[٤]

ئەم بەهرەمەندە «زۆر دڵخواز بووە حەزی بە بەزمو ڕابواردن کردووە»

ئەم گوێندە دەنگخۆشەی کورد هەمیشە سەرمەستی بادەی جوانی بووە بەتایبەتی جوانی ی ئافرەتو ئافرەتی جوان . دەڵێن دوور بە دووریش چاوی لە پەڕۆیەکی سوور بووایە و هەر لە ئافرەت بچوایە . بەس‌بوو . بۆ ئەوەی کەتین و تاو بدەن بە دەروونی و بێتە جۆش و بە کوڵ گۆرانی ی بڵێ ! هەر چەند « زۆر جار بەدەنگ ئەکەوتە ووتن»[٥]

ئەم بەهرەمەندە «بە فارسی گۆرانی نەووتووە ، لەگەڵ ئەوەدا کە فارسی‌یەکی زور باشی زانیوە»[٦]

- سەید عەلی ئەسغەر) یەکەمین گۆرانی بێژی کوردە لە کوردستانی ئێراندا کە ڕێبازێکی کوردانەی گرتووە .

– لەووتنی (مەقام) ی کوردیی و مەقامی (ڕۆژهەلاتی)دا ڕچەی شکاندووە . تەوق فارسی ووتنی لەگەردنی گۆرانی کوردی داماڵیوە . لەسەر شێوازی گۆرانی بێژە کوردەکانی سەردەمی خۆی نەڕۆییوە ؛ کە بە بەهرەو وەستایی یان بەوە داناوە بە فارسی گورانی بلێن ! . بەپێچەوانەی ئەوانەوە (سەید عەلی ئەسغەر) بە قوڕگێکی ڕوون و ڕەوانی بێگەردەوە بە دەنگێکی پڕسۆزوسازی خواپێداوەوە بە زمانی کوردی گورانی ووتوە . با (فارسی ووتن) ڕەواجی بووبێت ئەو گویٚ ی نەداوەتە (پایە ) و (پارە)و کلکە لەقیٚ بۆ ئاغایانی فارسو فارس ویستەکان .

بەڵکوو بەهۆی دەنگی خۆش و ئەو (کۆبەهرە)یەی کەهەی بووە . هەموو کەسێك بە (تامازرۆ) وە حەزی کردووە گویٚ ی لە دەنگی (بولبولی کوردستان) بێت . .

لە چایخانەو دیوەخانەکانی (سنە) گۆرانی ی بۆ هەمووچینەکانی کورد گوتووە . زۆرتر بۆ چەوساوەو ڕەش‌و ڕووتەکانی هاوزمانی خۆی ووتووە . هەم بۆ (ئاغا)و (بەگەکانی ڕۆژگاریی خۆی ووتووە . بەلاٚم مەدحی نەکردوون و بەشان و باڵیا

هەڵ نەداون . کێ حەزی لە گۆرانیی ئەو هونەر مەندە کردبێ بۆی ووتوون و دڵی نەرەنجاندون . هەرچەند زۆر حەزی کردووە لەناو کۆمەڵدا گۆرانی نەڵێت و بەڵکوو بۆ خۆی و بەتاقی تەنیا و لەناو چیمەن و چیاو چۆڵی کوردستاندا گۆرانی بڵێ . رازو ئاوازی خۆی بدا بەگوێی سروشتدا و بەتایبەتی لە ناو (مەزار) و (گۆلزارو لالەزاری) (بناوییلە)ی لەمەر شاری (سنە)کە ئارامگای باپیری لەو جێگەیەدایە و لەوخاکەدا نێژراوە .

– دەنگی (سەیی ئەسغەر) دەنگێکی (بڵندنەوایی)و (بەهرەیەکی خوایی)و (چیایی)یە . دەنگی دڵ‌وکەللەیە .

«کەتێی ئەچریکاند بەئاوازە شیرینەکەی . بەهونەرە بێ هاوتاکەی لە هەموو لایەکەوە خەڵك پۆل پۆل وەکوو پەپوولەی شەیدای چرا بن لێی کۆ ئەبوونەوە . ! (٧)

«ناوبانگی (سەی ئەسکەر) وەکوو ئاگرو پووشوو بە هەموو لایەکی کوردستانا بلاو بووەوە . لە هەموو کۆرێکی رابواردندا باس هەر باسی ئەو بوو» ! ! (٨)

هەر لەم تافەی ژیانیدا و لە هەرەتی هەوا خوازییو نەغمە پەردازیدا . سەرۆکی کۆمپانیای (پولیفۆن) بانگ هێشتنی دەکا بۆ تاران . تا دەنگی بێ‌هاوتای لەسەر قەوان تۆماربکا .

«بولبولی کوردستان» مامۆستای ئاوازەخوان و خۆشنەوا . لەسەر داخوازی ئەو (کۆمپانیا)یە دەچێتە تاران . هونەرمەندانی مۆسیقازانی ئەو رۆژگارە (ئیقبالی ئازەر) و (قەمەر الملوکی وەزیری)و (حسەین خانی نەکیسا) زۆریان حەز بەدەنگی (سەید عەلی ئەسغەر )کردووەو دەبنە هاوڕێو هاوکاریی و زۆر بەدڵسۆزانە مەقەمەکانی (حیجاز) و (غەمەنگێز) و (هەمایۆن)و (دەشت)و (قەتاری سنە) و (شوور)و بەستەکانی . لەگەڵدا تۆمار دەکەن و بەشێوازێکی ناوازەیی مۆسیقای کوردیی ئامێز بۆی دەرازێننەوە .

– لەگەڵ بلاو بوونەوەی قەوانەکانی سەید (عەلی ئەسغەر) . گۆرانی کوردی . پتر جێگەی رێزو رەواج بووە . بەقووڵی ریشەی لەناو کۆمەڵی کوردەواریدا داکوتاوە . تاکوو ئەمرۆش ئەو ئاوازە ناوازانە هێزوپێزو رێزی خۆیان هەیە . نەبێزراونو بە نەمری ماونەتەوە .

– ئەم گۆیندە بەهرەمەندە . هەستێکی پاکو پیرۆزی وولات ویستی هەبووە . زۆر دڵگرو دڵبەندی (شێخ مەحموودی) نەمر بووە . سەی ئەسکەری کورد پەروەر سەودای بینینی شێخی کەوتە سەر . کە ئەوکاتە ساڵی (١٩٣٦) لە بەغدا دەست بە سەربوو .

لەبەر ئەوە لە رێگای قەسری شیرینەوە . رووەو (بەغداد) کەوتەرێ بە دیدەنی شێخی نەمر شادبوو . چەند رۆژێك لەلای‌مایەوە . شێخ مەحمود زۆر دڵی (بەسەی ئەسکەر) کرایەوە» ! . (٩)

– لەم هاتنەی بۆ عێراق لە شاری بەغداد لە (کۆمپانیای بەیزافۆن) تەنیا یەك گۆرانی لەسەر قەوان تۆمار کردووە . کە مۆسیقاکەی لە ئاوازە تۆمارکراوەکانی تر جیاواز ترە . و نەغمەی مۆسیقاکەی (عەرەبی ئامێزە)و ئەومەقامەش کە تۆماری کردووە هۆنراوەکەی بە (زاریی لوڕ)ی‌یە . و واگومان ئەبەم کەهی (بابە تایەری هەمەدانی)یە کە لە شریتێکدا بە تۆمار کراوی لام هەیە . بەلام (سەید عەلی) چۆن لە مەقامەکانی تردا شیعری زۆر شاعیرانی لە یەك گۆرانیدا تێکەڵاو کردووە . لەم مەقامەش‌دا شیعرەکە دەستکاریی‌کراوە : کەبیری تیژو زەوقی خۆی تێدا بەکار هێناوە : وەك من تێی بگەم ودێتە بەرگوێم ، چونکە ئەو گۆرانی‌یە لە قەوانی سواوەوە وەرگیراوە ، دەنگەکە چاك نابیسرێ ئەمە هۆنراوەکەیە :

«هەر ئەم یارو ، کی ، دڵدارەش جگەربی»
«مودامت . عـــــاشقــــانش رێشتـــــەربی»
«بدایەت ، دل ئەز ئین دلبەر فریدەن
«ئەگەر حوسنش ، لە یوسف پێشتەربی» !

( سەی ئەسکەر) پاش ئەوەی بەدیدەنی شێخ مەحمود شادبوو رووی کردە مەڵبەندە نازدارەکەی شێخ -(شاری سلێمانی) ! .

کە گەیشتە کەرکوك ژەندرمەکانی دەوری دوابراو بە توورەیی تێیان خوری کە خەڵکی کوێ‌یە ؟ ! ! (سەی ئەسکەر) ئەم پرسەی بەلاوە سەیر بوو ،زۆر دڵگیر ئەبێ وەرامی ژەندرمەکە ! بەتوورەیی وتوندی دایەوە ، ! لە ئوتومبیلەکە دایان گرت وسەرە وخواریان کردەوە بۆ کونی گرتووخانە . لەپاشا (حەپسە خانی نەقیب) زانی ، ئاگاداری دۆستێکی کرد لە کەرکوك کە (سەی ئەسکەر) رزگار بکات ، توانرا کەواز بەژەندرمەکە بهێنرێ لەشکاتەکەی ، (سەی ئەسکەر) بە بەندی ناردیانە سلێمانی و شەو لەسەرا مایەوە ، بەیانی لە رێگای پێنجوینەوە رەوانەی (ئێران)یان کرد» . (١٠)

– ئەبێت (سەی ئەسکەر) چەند جارێك هاتبێتە کوردستانی

عێراق . .

سەبارەت بەهاتنی بۆ کوردستانی عێراق ،

– پیری بەبیر کاکە (م . صالح ئەفەندی) بۆی گێرامەوە[11]

– پاییزی ساڵی (١٩٣٥) : دەنگخۆشی بەناو بانگی کورد (سەید عەلی ئەسغەری کوردستانی) هاتە (هەڵەبجە) کەلەو ڕۆژگارەدا (سەعید قەزاز) قائیمقام بوو ئەو هونەرمەندە لەبەغدا خۆی داوای کردبوو کە لە ڕێگای هەڵەبجەوە بنێرنەوە بۆ «ئێران» ! ! .

لە (هەڵەبجە) . . . دا «ئازادکرا» و بەسەربەستی دەگەڕا . چونکە (سەعید قەزاز) ووتی هونەرمەندێکی وەکوو (سەید عەلی ئەسغەر) پێویستی بە (کەفیل) نی‌یە .

لە ماڵی ( ! ) کەئاشنای (سەی‌عەسکەر) بوو و لەڕەچەڵەکدا خەڵکی شاری (سنە) بوو لای ئەوان میوان بوو .

(سەعید قەزاز) لەیانەی فەرمانبەرانی هەڵەبجە ، دەعوەتێکی چاکی بۆ کرد و زۆر ڕێزی لێ‌نا . هەروەها (حەسەن بەگی جاف) و (ئەحمەد بەگی صالح بەگ) دەعوەتیان بۆ کرد . (سەید عەلی ئەسغەر) زۆر شارەزای شیعری کوردی بوو ، یەکجار ئەدەب دۆست بوو بە جۆرێك کە (حەسەن بەگی جاف) شیعرێکی ئەخوێندەوە لە کوێدا هەڵەی بکردایە ، ئەو گۆرانی بێژە بلیمەتە ، بۆی ڕاست ئەکردەوە ، تا چووەوە بۆ ئێران زۆر ڕێزو نازی گیرا .»

(مامۆستا علاء الدین سجادی) لە ڕشتەی مرواری دا نوسیوێتی کە (حەسەن بەگی عەلی بەگی مەحموود پاشای جاف) بۆی گێڕاوەتەوە :[12] .

«ئەوا ساڵی (١٩٢٦)ە لەگەڵ (ئەحمەد بەگی وەسمان پاشادا) کە ئەو سەردەمە ، هەردووکمان جۆشی گەنجێتی‌مان بوو ، لەهەڵەبجە شەوێکی دەمەو پاییز لە ژوورە بچکۆلەکەی ماڵی ئەحمەد بەگا دانیشتبووین ئەحمەد بەگ پیاوێکی هەبوو (حەمەعەلی) ناو بوو ، بەحەمە عەلی ووت کە نەیەڵێ ئەو شەوە کەس بێت بۆلای ، بەو نیازەی کە ئێمە ئەوشەوە بەزمێکی تاجرانە بگێڕین !

ئەحمەد بەگ بەدەستی خۆی هەموو جۆرە خواردنەوەو مەزەیەکی ئامادەکردو بەڕاستی نەوەك بوو بە بەزمێکی تاجیرانە بەڵکوو بوو بە بەزمێکی شاهانەی دوور لە هەموو دڵتەنگی‌یەك ، سەروپێك نرا بەسەرەوە ونەنرا حەمە عەلی لەناکاو کردی بەژوورا ووتی ئەواسەیدێك هات نازانم چی‌بکەم ؟ ! ئەو قسەکەی لەدەما بوو کوتو پڕ یەکێکی تر کردی بەژوورا ، کە سەرمان بەرز کردەوە زەلامێکی باڵابەرزمان بەرچاوکەوت ، (باوەشێ مێزەری سەوزی بەسەرەوەیە (عەبایەکی ڕەشی ماوتی بەشانەوەیە) (ڕیشێکی ڕەشی قەڵەم کراوی پێوەیە ، ووتی : – «سەلامون ئەلەیکم» وبەبێ قسە دانیشت . حەسەن بەگ ووتی بەڕاستی ئێمەش لەو سەرو دیمەنە بەتەواوی شڵەژاین‌و لەشەرمانا بە پەلەپەل کەوتینە شاردنەوەی قاپە عەرەق‌و پێك‌و مەزەو هەڵساینە سەرپێ‌و لەبەری ڕاست بووینەوە ، کەسەید دانیشت زمانی هەڵهێناوەو ووتی : «ئاغا گەل بەندە سەی ئەسکەری کوردسانیم فەرموون دانیشن» ! ! کە ئەمەی ووت تۆزێ ڕوومان کرایەوە دانیشتین وبە خێرهاتن مان کرد ! .

ئەویش تێ گەیشتبوو کە ئێمە خەریکی چین ! ووتی :

«ئاغا گەل بەزمی خۆتان تێك مەدەن ئەو ئەسپاوگەلە دەرکەن» ئێمەش دڵێك ڕازی و دڵێك نارازی شت‌و مەکەکان کە شاردبوومانەوە هێنامانەوە مەیدان ، بەڵام هەر شەرمان ئەکردو دەستمان بۆ نەئەبرد ئەمجا ووتی :

«پێکێك بۆ منیج تێکەن» ئێمە هەم پێمان خۆش بوو هەم پڕکێشیشمان نە ئەکرد . (ئەحمەد بەگ) سێ پێکی تێ‌کردو یەکەمینی دایە دەست ئەو و ئێمەش هەریەکەمان یەکێکمان گرت بە دەستەوە (سەی عەسکەر) پێکی وەرگرت‌و هەستایە سەرپێ ، پێکەکەی نزیکی پێکی ئەحمەد بەگ کردەوەو دای لەپێکەکەی تەقەی لێ هەستان‌و ووتی بە (سلامەتی سەری ئێوە) نای بەسەری‌یەوە و دانیشتەوە ، سەیرمان کرد ڕاستە زۆر ئەرباب بوو ئەو لەئێمە گەلێ وەستا تر بوو ، تۆزێ مات بوو پاشان ووتی : «ئاغا پێکێکی تر بۆ ئەم ئاغەی خۆتانە تێکەوە) پێکێکی تری بۆ تێ‌کرد ودایە ، ئەویشی نا بەسەری‌یەوە .

سەیرمان کرد ووردە ووردە ڕەنگی سوور هەڵ گەڕاو دەستێکی بەرز کردەوە وتۆزێ مێزەرەکەی لارکردەوە ولەبەر خۆیەوە دەستی‌کرد بە ووتن ، پاش ماوەیەك کە گەرم بوو ، دایە چریکەو دەنگی بۆ بەرز کردەوە لەگەڵ (حەنجەرەکە یا شووشەی پەنجەرەکان کەوتنە شەك وشۆك ئەوەندەمان زانی ، خڕ ، شووشەی هەموو کەوتنە خوارەوە جامی پەنجەرە خڕەی کرد ! ! کەچاك سەیرمان کرد هەرچی ئەهلی (هەڵەبجەیە) بە دەوری ژوورەکەدا کۆ بوونەتەوە لەو (نەوا) یە سەرسام ماون . ئەوی ڕاستی بێ ئێمەش هیچ ئیختیارێکمان تیا نەماو ئەتوانم بڵێم کەوتین» .

زۆر باس وبابەتی جۆراوجۆر لەمەڕ دەنگ وسەدای سەید عەلی ئەسغەر دەگێڕنەوە ، هەر چۆنێك بێت ئەو گۆرانی‌یانەی

کەوا بە تۆمارکراوی ماونەتەوە ئەو ڕاستی‌یە دەسەلمێنن کەوا (لەرە) و (لۆرە) ی دەنگی یەکجار بەکارو دڵ‌هەژێنە ، نەوایەکی بەرزو هەوایەکی کاریگەر لە گۆرانی‌یەکانی‌دا هەیە ، کە تا ئەمڕۆی گۆرانی‌ی کوردی ئەو (لەرە) و (لەرزە) و (ئەو نەغمەبەرزە) لەدەنگی گۆیندەی کورددا هەڵ نەکەوتۆتەوە و **(محەممەدی مەلا کەریم) دەڵێت** : [١٣] .

**«بەڵام ئێستاش هەر دڵنیام»**
**«نەتەوەی کوردی خوێن جوڵاو»**
**«حەق فەوتاوی تۆی ناکام»**
**«ئەداتەوە دەستت تەواو»**
**«پەیکەرێکت بۆ دائەنێ»**
**«یادت زیندوو بکاتەوە»**
**«بۆ بەختی کورد پێ‌بکەنێ»**
**«کە ڕۆژی تیشك با تەوە»**

لەم باسەدا بە کورتی ژیانی ئەو گۆیندەیەی کورد ، دەنوسین مامۆستا غفور رشید داراغا دەڵێت : [١٤] .

– سەی ئەسکەر : لە ساڵی (١٨٧٦) لە (سەڵوەتاوا) لەدایك بووە .

– لە تەمەنی (٦١) ساڵی‌دا لە ساڵی (١٩٣٧) زایینی کۆچی دوایی کردووە . لەگۆڕستانی (تایلان) لە گەڕەکی (چوارباخ)ی سنە نێژراوە .

ئەردەڵان دەڵێت : [١٥]

وەکو بیستوومەو هاتوومەتە سەر ئەو قەناعەتەی لە دەورو بەری شەستەکانی سەدەی نۆزدەهەم دا لەدێی (بایەوە) ! ! کە نزیکەی (١٠) کیلۆمەترە لە ڕۆژهەڵاتی شاری پێنجوینەوە دوورەو لەسەرسنووری ئێرانەو لە (کوردستانی ئێران) لەدایك بووە .

زوربەی ژیانی لە کوردستانی ئێران لە (شاری سنە) بەسەر بردووە ، هەر لەوێش کۆچی دوایی کردووە .

– تەمەنێکی مام ناوەندی ژیاوە –

– هەر ئەمەندە ناوونیشانی ئەم هونەرمەندە ئەزانین خۆزگایەژیانو ، بەسەرهاتو ، هونەری ئەم گۆرانی بێژە وون‌نەبایە» .

– منیش لە نامیلکەی (بەستەو مەقام) دا : [١٦]

– ساڵی (١٨٧٦) م داناوە بۆ لەدایك بوونی و گڵکۆکەی (گۆڕەکە)ی لە (گۆڕستانی تایلان) نوسیومە بە خاك سپێراوە . .

لەو نوسینەدا کەڵکم لەزانینی خواڵێ خۆش بوو ، مامۆستا (غفور رشید داراغا)وەرگرتبوو ، کە ئەویش لە (ڕەشۆڵ) و (مەجیدی قادری حەمامچی) وەرگرتووە ، خواڵێ‌یان خۆش‌بێت . . (ڕەشۆڵ) و (کاك مەجید) نەخوێندەوار بوون هەر ئەوەندەیان لەیاد بووە و زانیوە .

. (بەڵام دوای سەروسۆراغێکی زۆرو بەتایبەتی کوردێکی هونەر دۆست شریط (نەوار)ێکی پێشەکەش کرد بە گۆشەی (کاروانی گۆرانی کوردیی) کە لەئێستگەی کوردیی بەغداد ئامادەم دەکردو پێشکەشم دەکرد ، لەمەوپێش .

ئەو (نەوارە) بەڕاستی زانینێکی زۆری تێدابوو دەربارەی ژیانو گوزەران ومانومردنی (سەید عەلی ئەسغەر) کەوا لێرەدا برێکی بەکورتی لێ‌بلاو دەکەمەوە !

جا هەر کەسێکی ترو هەر خەمخۆرێکی تری هونەریی گۆرانی ومۆسیقای کوردیی دەربارەی ئەم ، ڕازی لایە . . دەری ببڕێ ، جێگای سوپاسە .

– (+ سەی ئەسکەر : ناوی تەواوی سەید (عەلی) کوری سەید (نیزامەدین) کوری سەید (ئیبراهیم)ە . . –کە ناوبانگی بە (سەیی عەلی ئەسغەری کوردستانی) دەرچووە .

• لەنەوەی (جەولێر) ی (سەید بابا عەلی شای کشمیری)یە .

• ساڵی (١٢٦٠ خۆریی = ١٨٨١ م) لەدێی «سلاوەت ئاوا»ی لەمەڕ شاری (سنە) لە کوردستانی ئێران لەدایك بووە .

• لەتەمەنی حەوت ساڵی‌دا چووەتە قوتابخانەی ئایینی (حوجرە) لەلای باپیری (باوکی دایکی) کە بەناوبانگەبە «شێخ عەبدول ڕەحمانی کانی مشکانی» قورئانی پیرۆزی خوێندووەو تەواوی کردووە .

• ئەمجا چووەتە مزگەوتی «دار الأسلام» لە (سنە) لە گەڕەکی (پردی بەندە) . . مزگەوتی (جامع)ی ئێستاکەی (سنە) کتێبەکانی (گوڵستان) و (بۆستان)ی شێخی سەعدیو سەرەتای عیلمی شەرعی لەلای مامۆستا (مەلا ابراهیمی شیخ الأسلام) خوێندووە .

• چووەتە دیدەنی (شێخ عەبدوڵلای) ئایینی لە موکریان ، وهاتۆتە دیدەنی (شێخ مەحمودی نەمر) لە (بەغداد) .

• چووەتە دیدەنی (ملك الکلام – مەجدی سەقزی)

• زۆر هۆگری شیعرەکانی (تایەر بەگی جاف) و (مەولەوی) و (حەریق) و (شێخی سەعدی) بووە .

* سیٚ رۆژ پیٚش مردنی ڕاسپیٚری دەکا کە مرد لە دیٚی (سلاٚوەت ئاوا) ی شوێنەزاکەی خۆی بەخاکی بسپیٚرن .
* لەقەبزی پاییزی ساڵی (١٣١٥ خۆری = ١٩٣٦ م) کۆچی دوایی دەکات .
* لە گۆرستانی دیٚی (سلاٚوەت ئاوا) بەخاك سپیٚراوە .

«ئەم گوێندەیە زۆر سەرو ساختی لەگەڵ شیعری کوردیی‌دا بووە لەو مەقامەدا کە لیٚرەدا بلاٚوکراوەتەوە هۆنراوەکەی هی یەك شاعیر نی‌یە . بەڵکوو لەو مەقامەدا کەپیٚی دەگوتریٚ نەغمەی (حیجاز) . گوڵ بژێری کردووە لە شیعری چەند شاعیریٚکی گەورەی کورد . کام دێڕ دڵی گرتبیٚ ئەوی هەڵبژاردووەو بەلیٚزانی خۆی زەرەبی . . . ەمەکەی لەگەڵ کیٚشی هەر دێڕ هۆنراوەکاندا هاودەنگ‌و هاو ئاهەنگ کردوون . زۆر بە ڕیٚکو ڕەوانی مەقامەکەی ووتووە .

**مەقام :**

**نەغمەی (حیجاز)**
**هۆنراوە (تیٚکەڵاٚو)**
**گۆرانی (سەید عەلی ئەسغەر)**

«ئەی ڕەفیقانی تەریقەت      دەردی عیٚشقم چارەکەن»[17]
«یا بەجریٚ بمکوژن .      جەرگم بەخەنجەر پارەکەن»
«ڕۆژی جەژنە چاوەکانم      مەوسمی ئازادی یە»
«بۆ بەلاٚ گەردانی بالاٚت      قوچی قوربانم وەرە»[18]
«سەد حەکیم هات‌و عیلاجی      ئەم برینەی قەت نەکرد»
«تۆعیلاجی زامەکەم‌کە . زوو      بـــــــەلوقمانم وەرە»
«چاوەکەم بۆ ڕووی فیراقت      دڵ‌دەناڵیٚ وەك ڕووباب»[19]
«بۆ دوو ئەبرۆی میسلی تاقت      بەندی‌جەرگم‌بوو . کەباب»
«هەر کەسیٚك هات‌و ووتی      من عاشقم بڕوامەکە»
«تا لەسەر گۆنای نیشانەی      زەخمی مارانگاز نەبیٚ»
«من کەسوتانم نەدیوە      مەنعی گریانم مەکە»
«عاشق ڕووتم بە قوربان      تیرە بـــارانم مـــەکـــە»
«سەد حەکیم هات‌و عیلاجی      ئەم برینەی قەت نەکرد»
«تۆ عیلاجی دەردەکەم کە      زوو ، بە قوربانم . وەرە»
«چـاوەکـەم‌ئیـمڕۆلـەگوڵشەن .      گوڵ بەعیشوەت خۆی‌نواند»
نەك نمەك گیریم بە چاوی      تۆقەسەم‌هیچ‌نەم‌دواند» ![20]

– ئەم هۆنراوەیە تیٚکەڵە لە شیعری (فکری) و (تایەربەگی جاف) و (ئەحمەدی کۆری موکریانی) و (حەریق) . ئەمە نموونەیەکە لە زرنگی سەید عەلی ئەسغەر کە لەو سەردەمەدا دیوانی چاپکراوی ئەم شاعیرانە یا هەڵبەستی بلاٚوکراوەیانی

**دیی نێ شیعری ئەم شاعیرانەی لەمەقام‌دا بەکارهیٚناوە . دیارە کە دەستنووسی شیعری هەموو ئەمانەی هەبووە . .**

**«دینت بردم»**

– بەستە لە مەقامی (عەجەم)ە

هۆنراوە : فۆلکلور

«هەرچەند دەکەم فکرو ئەندیٚش»
«تەوەلا بوومە لەخزم وخویٚش»
«لەبەر بالاٚت بووم بەدەرویٚش»

کافر بووم . تۆ وات لیٚ‌کردم
بەجوانی‌یەکەت دڵت بردم

«ماڵی ویٚران کردم چاوت»
«دیٚوانەم بۆ زوڵفی خاوت»
«ئەمنی هەژار کەوتمەداوت»

کافر بووم تۆ وات لیٚ کردم
بەجوانی یەکەت دڵت بردم

مەمکت دوو میم‌و کافیٚکە
لەمابەین سینە سافیٚکە
هەر ماچیٚکت تەوافیٚکە

قوربانت بم ئەی بای شەویٚ
خەو بیٚ لە چاوم ناکەویٚ
دڵ مەجنوونەو لەیلی دەویٚ

## مەقامی دەشت)

## (سەید عەلی ئەسغەر)

«غەمگین و دڵ پەشیوم .      بـڕوانـە باری لیٚوم»
«حەیرانی خاڵی لیٚوت بم .      جەرگم سوتاوە بە قاوە» !
«دوونـەبرۆی تیـغی دی‌بوو ! !      دڵ ئاوی پیاهات ! ! »
«بەفتوای چاوی مەستت      قەتلم واجیب کراوە»
«بۆ تۆ شیٚت‌و شەیدابووم      بۆتۆ پیرو ڕیسوا بووم»
«وەکوشەوی‌زریـــان‌بووم ! !      بۆچی تۆ رەحمت نەماوە ؟»
«لەسەرتاق دوو ئەبرۆت .      مەیلی زولفان دەمکیٚشیت»
«بۆچ دەمکوژی . خۆم‌قوربان .      پردی سەیر نەپچڕاوە»
«لە دەردی بیٚ دەرمانی .      کەوتوومە سەر گەردانی»
«بۆچ دەمـــکوژی‌مـــاڵ‌ویٚران .      جەرگم بۆچی بڕاوە ؟ ! ! »
«لە دەردی بیٚ دەرمانی .      کـەوتـوومـەسەر گەردانی»
«بـــەجوانی(لـن تـــرانی      چی‌بـکـەم‌جەرگم‌بڕاوە ! ! »
«لە بۆ هیجری دووری تۆ ،      جەرگ‌و ڕۆحم نەماوە»
«چی بـکـەم‌لـەدووری‌دۆستم ،      هۆش وفیکرم فەوتاوە»

**(بەستە) زادەی مەقامی**
**(سێگا)یە**
**هۆنراوە : فۆلکلۆر**
**ووتنی : (سەید عەلی ئەسغەر)**

«ئەی نابێ نابێ»
«نە بیرتە پێ شەوەکەی سەرجۆ» ؟
«عەزیەت کردن من . مەکەو لاوەی تۆ»
«ئەی نابێ نابێ چاوجوان وانابێ»
«بەم دەمو دەستە یار پەیدانابێ»
«هەی داد هەبێداد دەردەم تاو تاوە»
«ساتێ لەرزم هات . ساتێکم لاوە»
«ئەی نابێ نابێ چاوجوان وانابێ»
«بەم دەمو دەستە یار پەیدانابێ»
«ئەوا گیان دەرهات بۆ پابۆسەکەت»
«کەمێ مەیلت بێ بەلای دۆسەکەت»
«ئەی نابێ نابێ چاوجوان وانابێ»
«بەم دەم ودەسە یار پەیدانابێ»

## (پاشکۆ)

١ – ئەم هۆنراوە هی شاعیرێکی کوردستانی رۆژهەلاتەو ناوی شاعیرەکە نازانم .

٢ – (ئوستاد = أستاذ) ووشەیەکی عەرەبی نی‌یە ، (وەستا)ی کوردیی‌یەو بەو مەرەدە براوە . تەنیا ئەوەندە هەیە (مام وەستا = مامۆستا نەکراوە بە (مام أستاذ) . بڕوانە گۆڤاری (العربي) کوێتی ژمارە (٢٤٠) ل ١٢٦ دێری (٢٥) تشرینی دووەم ساڵی ١٩٧٨ م

٣ – گۆڤاری (هیوا) ژمارە (١٠) لاپەرە (٢٣) ساڵی (١) (نیسان)ی (١٩٥٨) م .

«بۆ گیانی پاکی «سەید عەلی ئەسغەر»
محەممەدی مەلا کەریم .

٤ – هەمان سەرچاوەی پێشوو .

٥ – گۆڤاری (ڕۆژی نوێ) ژمارە (٩) ساڵی (١) مانگی سەرماوەزی ساڵی (١٩٦٠) سلێمانی : غەفور رەشید داراغا .

٦ – (هاوکاری) ژمارە (١٥٢) ١٩٧٣/٢/٢ – ئەردەلان .

٧ – گۆڤاری (ڕۆژی نوێ) سەرچاوەی باسکراو .

٨ – گۆڤاری (ڕۆژی نوێ) سەرچاوەی بەسکراو .

٩ – گۆڤاری (ڕۆژی نوێ) سەرچاوەی بەسکراو .

١٠ – سەرچاوەی پێشوو .

١١ – م . صالح ئەفەندی : پیرێکی ڕەوشەن بیرو چۆست وکارامەیە لەورۆژگارەدا لە (هەڵەبجە) فەرمانبەر بووە .

١٢ – (ڕشتەی مروای) بەرگی (شەشەم) ل (١١٧ تا ١٢٠) مامۆستا (علاء الدين سجادی)

١٣ – (هیوا) ژمارە (١٠) ساڵ (١) نیسان (١٩٥٨) – (محەممەدی مەلا کەریم) .

١٤ – گۆڤاری ١ (ڕۆژی نوێ) ژمارە (٩ سالی ١) سەرماوەزی ساڵی ١٩٦٠ ل (٥ تا ٨) غەفور رشید داراغا .

١٥ – ڕۆژ نامەی (هاوکاری) ژمارە (١٥٢) – ١٩٧٣/٢/٢ (ئەردەلان) .

١٦ – بەستەو مەقام : عثمان شاربا ژێڕی ل ٥ : چاپخانەی ڕاپەڕین سلێمانی ١٩٧٨ .

١٧ – ئەم دێڕ هۆنراوەیە هی شاعیری کورد (فیکری)یە (١٨٢٢ – ١٨٨٧م) .

١٨ – شاعیری کورد (تایەر بەگی جاف ١٨٧٥ – ١٩١٧) شیعرەکەی بەم شێوەیە دارژتووە .

«دڵ نەخۆشی دەردی هیجرە جانی جانانم وەرە»
«لەت لەتە جەرگ وهەناوم ماهی تابانم وەرە»
«سەد شوکر دووبارە جەژنە وەختی عەیش وشادی‌یە»
«بۆ بەلا گەردانی بالات قۆچی قوربانم وەرە»
«دوور لەبالای نەونەمامت زامی جەرگم ناری‌یە»
«وەك عەرەب سەد جار دەخیلەك زوو بە لوقانم وەرە»

دیوانی (تایەر بەگی جاف)
چاپخانەی (نەجاح – بەغداد)
ل (١٥ و ١٦) ساڵی (!)

١٩ – ئەم دێڕ هۆنراوەیە هی شاعیری کورد (ئەحمەدی کۆری موکریانی‌یە) .

٢٠ – ئەم دێڕ هۆنراوەیە هی (حەریق = مەلاساڵحی زێوێ‌یی‌یە (١٨٥١ – ١٩٠٧) .

٢١ – ئەم هۆنراوەیە هی (میرزا عبد الرحيم = وەفایی‌یە (١٨٤٤ – ١٩٠٢ مردووە = عثمان ! !)

بەتەواوی لەدیوانەکەی‌دا نووسراوە ، بڕوانە دیوانی (وەفایی) ل (١٥١) ئامادەکردن ولێکۆڵینەوەی مامۆستا (محەممەد عەلی قەرەداغی» ساڵی ١٩٧٨ . بەلام (سەید عەلی ئەسغەر) چەند دێڕێکی لە سەرەتاوە ، لەسەرناوە . نازانم هی خۆیەتی یا هی شاعیرێکی تری کوردە ؟ .

* ئەحمەد موختار جاف (١٨٩٧ – ١٩٣٥) شاعیری ناسراوی کوردە – (ئەحمەدی وەسمان پاشای جاف)

* (ملك الكلام = مەجدی سەقزی ١٨٤٩ – ١٩٢٥) شاعیرێکی بەناوبانگی کوردە .

* سوپاس بۆبرای هونەردۆست کاك (کەمال فەرەج تۆفیق) لە سلێمانی کە (وێنە) ی (سەید) و دوو شریط (نەوار) لە گۆرانی‌یەکانی بولبولی کوردستانی پێشکەش کردمو بۆ ئەم باسە کەڵکم لێ‌وەرگرت .

– عثمان شاربا ژێڕی –

هونەر خۆی دەدوێ‌و پێویست بەوەرگێرانی ناکات لە زمانێکەوە بۆ زمانێکی تر ، خۆی بەگوێگرو بینەر دەناسێنێ . زۆر جار کە هەندێ بەرهەمی هونەریت بەرچاو دەکەوێت ، هەستێکی ناوەوە دەت هەژێنێ‌و لە ناخەوە پێت دەڵێ : ئا ئەمەشتە ، ئەمەیە دروست کردن‌و داهێنان . خۆشت لەوانەیە نەزانی ئەوهەستە نهێنی‌یەی کە تا ئێستا لە کرۆکەی نەگەیشتووین بۆ وایە ؟ ! چۆن وای هەژاندی و دڵگیری بەرهەمەکەی بووی ؟ ! لەوانەیە خۆت مرۆڤێکی ئەوەندە بەلەدو شارەزا نەبی‌و پسپۆریت لە هونەری شێوەدار نەبێ ، بەڵام جووڵایت‌و بەرهەمەکەت کەوتە بەر دڵ وپەسندت کردو ئافەرینت لە هونەر مەند کرد .

ئەمەیە راحتی‌ی هونەری رەسەن زادەی دوو چار بوونی هونەرمەندو راستگۆیی لەگەڵ خودی خۆی‌و چۆنیەتی مامەلە کردنی لەگەڵ کەرەسەی هونەرکاری‌یەکەی . لەم روانگەوە دەچینە ناو پێشانگەکەی حەمە عارفی هونەرمەند ، بێ ئەوەی لە رێگەی ئەوەوە لەناو چەند پرسیارێك‌و چەند وەلامێك‌دا لە تابلۆکانی بگەین ، بە چاوی خۆیان سەیریان دەکەین ، لە ئاستی‌یان دەوەستین و سەرنجیان دەدەینێ . . . پێشانگەی ئەم جارەی لەوانی پێشووی ناکات ، بابەتێکی ترە ، لەخاڵێکی بچووکەوە دەرگای چوونە ناو جیهان دەکاتەوە . لە بەردەم پەنجا تابلۆی هۆڵی «الرواق» لەبەغدا ، کە شوێنی پێشانگەکەیە تەنیا چاوت بە پەنجا تابلۆی هونەرمەند دەکەوێ کە گوڵبژێری سەرجەمی کارەکانی‌یەتی لەماوەیەکی دوورو درێژدا . هونەرمەند گەشت‌و گەرانی خۆی بەناو هەموو دونیادا دەکات ، سۆفی‌یەکی سەر هەڵگرتووی کەشکۆڵ بەکۆڵە بەدوای دۆزینەوەی راستیەك دەگەرێ ، کەراستی‌یەکی دەروونی‌یە ، لە چوار چێوەی دەرەوەی خۆی‌دا . حەمە عارف لەخۆی ، خودی خۆی ، دەروونی خۆی دەگەرێ ، نەك لەناوەوەی خۆی‌دا بەڵکو لە دەرەوەیدا . لەگەرانەکەیدا سەرلێشێواو وگومراو نابەڵەد ینە ، بەڵکو لەناو هەر تابلۆیەکی‌دا خۆی دەدۆزێتەوە . . راستە پێشانگەکە بەناوی باری سەرنجی هونەرمەندە بەرامبەر



جیهان تێکرانی تابلۆیەکان ئەڵقەیەکی گرنگن لەسەر جەمی کارە هونەری‌یەکانی (هونەرمەند) بەڵام ئەمەشتێکی ئاسایی نیەو بە شێوەیەکی لە خۆوە نەهاتۆتەکایەوە ، بەڵکو پرۆژەیەکی درێژ خایەنی چەند سالێك و سەرەنجامی ئەرك‌و هەوڵ‌و تەقەلایەکی زورەو ، ئەو قۆناخانەی کە حەمە عارف پیاروێشتوەو ، شێوازی تەکنیکی جور بەجۆری هەر قۆناغێك دەستێشان دەکات ، وەك چۆن سەرنج‌و رای بەرانبەر ئەو شوێن‌و وڵاتانەی کە چاوی پێیان کەوتووە ، یا بەناویاندا گەراوەو لە هەندێکیان ژیانی بەسەر بردووە کۆمەلێك بیرەوەری خوش وناخۆشی لەگەڵ خۆیدا هەڵگرتووە ، ئاواش بەرەنگی هەمە جۆرو بەشێوازە تایبەتی‌یەکەی خۆی رەنگی بەیانی‌و رۆژ لەزەردان‌و ئاوابوون ، دەمی ئێوارەو شەوو باران‌و ئاسمانی ساوو هەورو تەم لەو دیمەنانەی کە کامیرای چاوی گرتوویتی ، گشتیان دادەرێژی‌و گیانێکی تریان دەکاتەبەر . جیهان لای هونەر مەند لە گوندێکی خنجیلانەی قەد شاخی سەفینەوە دەست پی‌دەکات ، ئینجا بەرەو ئەستەمبوڵ‌و پاریس دەکشێ . لە کۆڵانەیەکی تەنگە بەری قەڵای هەولێرەوە بۆ لەندەن‌و بۆ لێگرادو مۆسکو . لە پێشانگە

بچووکەکەیدا هەموو جیهان کۆ دەکاتەوە ، بینەر دەخاتە بەردەم بازنەیەك کە لەناویا جیهانی کۆ کردۆتەوە ، تابەچاوی خۆی سەرنج بداتە تابلۆیەکان یەك بەیەك وبگاتە ئەو قەناعەتە کە ڕەنگ‌و هێڵ‌و شێوازی تەکنیکی تابلۆیەکان یەك نین وجیان ، هەر چەند هەموویان بەرهەمی هونەرمەندێکن . لەناو تابلۆیە جۆر بە جۆرەکان مۆرك‌و شەقلی کوردەواری‌و ڕۆژ هەڵاتی‌و




ڕۆژئاوایی بەدی دەکەی ، کە لە ئاستی هەندێ تابلۆدا دەوەستی وەك تابلۆی « بەندەرێك لە ریکا» مۆرکی ڕۆژئاواییت دێتە بەرچاو ، بەخانووی سەرئاوو بەلەم دارو درەختی دەم ئاوەکە سروشتێکی ڕووتی ڕۆژ ئاوایی بەدی دەکەیت .

کەچاو دەبڕی‌یە تابلۆی ڕوانین یاخود سەرنجدانێکی ئەستەمبوڵ لوتکەی منارەو گومەزی مزگەوت مۆرکی ئەوشارەت دێتە بەر چاو کە هونەرمەند واقیعەکەی بەر جەستە کردووە ، بەلاّم ئەو قووڵی‌و بەپێزی‌یەی لە تابلۆی « بارانی ڕێگەی سلێمانی » و گوندێکی بناری سەفین دا ، دەردەکەوێ لەم تابلۆیە دانیە ، لەشێوەی فۆتۆگراف نزیکترە . جا ئەگەر مەبەستی تایبەتی هەبێ‌و بیەوێ ڕاستی‌یەك دەربڕی کە پەیوەندی بە مێژوویەکی زور دێرینەوە هەیە ، ئەو سەردەمەی کە سولتانەکانی عوسمانی کاریان دەگێڕا ، ئەمەشتێکی ترە ، وەك ئەستەمبۆڵی پایتەختی جاران‌و جێ‌ی سەڵتەنی ئالی عوسمان ، ئەم شارە کۆنە بەشێوەیەکی ساکار دەردەبڕێ وشوێنەوارەکان کەرەمزو نیشانەی سەر دەمێکن کە لە ڕۆژ گارێکا واقیعێکی دی بوون ، وا ئێستاش تەنیا شوێنەوارەو چی‌تر ، ئەمەش هەقی هونەرمەند خۆیەتی

کەبەشێوەیەك واقیع دەربڕێ کەجۆرە لێکدانەوەیەکی تایبەتی تێدابێ . هەر بۆیەش هونەرمەند بەدەستی ئەنقەست ڕەنگەکانی بەوشێوە ساکارە بەکار هێناوە کە پەیوەندی نێوان ئەمڕۆو دوێنێ تا چ ڕادەیەك دەوری خۆی دەبینی ؟ ! تەنیا وەك ڕەمزو شوێنەواری ڕووت ، یاخود هێشتاش دینامیکی‌یەتی پێوەیەو کۆنە کە وارەگی داکوتاوە کەلە ئەمڕۆ جیاناکرێتەوە . هونەرمەندی کۆنی لەسەر بۆش بنیاتنراو بەم شێوە نیشان دەدات ، تابلۆی «ئاشە سوورە لە پاریس » کە ناوبانگ‌و شۆرەتێکی گەورەی هەیەو ، تابلۆی – کەوانی سەرکەوتن لە پاریس – دیمەنی سروشتێکی مردوو نابەخشن ، لەناویاندا تەرزی ژیانی خەڵکەکەو سیاو ئادگاری سروشت دەردەکەون . تابلۆی – لەندەن لەشەودا – جۆرە ڕەنگێکی تیا بەکار هێناوە کە لەهی تابلۆیەکانی دی ناکەن ، هەروەها بەریگەیەکی جیاوازترو شێوازێکی جیاترکراوە ، نیشانەی ئازایەتی ڕەنگ دارشتنی پێوەیە کە (لەندەن) ئەم شارە ناودارە تەنیا چەند کۆشك‌و ساختمانێکی چەند نهۆمی و چەند شەقامێك نیە ، بەڵکو ڕەنگدانەوەی هێز وپێزی شارستانی‌یەتی دەیان سەدەو نیشانەی پێشکەوتنی تەکنیکە . کە دێ‌یە سەر تابلۆی «کۆنە بوراگ» کڵێشە خانووەکانی‌و ئاسمانی جۆرە بابەتێکی ترن ، هەروەها سەبارەت بە تابلۆیەکانی تریشەوە وەك تابلۆی : دەوروپشتی مۆسکۆ لەناو تەمومژدا ، گۆمێك لە دەوروپشتی مۆسکۆ ، بەریڤان کاتی باران ، ڕۆژێکی هاوین لەکیف ، ڕۆژ ئاوابوون لە بەندەری ئۆدیسا ، وارشۆ لە زستانا وهی‌تر ، هەر چەندە شارو شوێنی ڕۆژ ئاوان ورەنگ‌و روخساری تایبەتی خۆیان هەیەو هونەر مەند جورەتەکنیکی تایبەتی بەکار هێناوە بەلاّم بە چاوی هونەرمەندێکی ڕۆژئاوایی سەیری نەکردوون‌و وێنەی نەکێشاون ، بەڵکو لەناو هەر تابلۆیەکدا خودی خۆی تیا دەربڕ بوە وحاڵەتە دەروونی‌یەکانی خۆی بەرەنگ‌و هێڵێ جیا جیا دەربڕیوە ، بۆیە ئیقاعی ڕەنگەکان وەك خۆیان نامێنن و دەگۆڕێن . هەندێ جار خاوو لەسەر خۆن ، جار جارەش توندو تیژن ، رەش بین‌و ڕوون بین . هونەر مەند لە هەندێ تابلۆدا زۆر بە وردی تەکنیکی ڕەنگ دارشتنی بەکار هێناوە ، بە پێوانە حیسابی بۆ چۆنیەتی ڕەنگە جۆرە بەجۆرەکانی کردووە ، لە هەندێکی تر وەك بڵێ‌ی گەرم داهاتووەو بارو دۆخێکی تایبەتی سایکۆلۆژی بەسەرهاتووە ولەکاتی دارشتنی ڕەنگەکاندا هەڵچووە ، زور ئازاو خێرایانە ڕەنگەکانی داناوە .



ئەگەر بگەڕێینەوە سەر تابلۆیەکانی کە دیمەنی خۆماڵین وەك : « ڕۆژ ئاوابوون لە دەوروپشتی هەولێر » ، بازار لە هەولێر ، کۆلانەیەك لە هەولێر – تابلوی یەکەم و دووەم – سلێمانی پاش باران ، بارانی ڕێگەی سلێمانی ، دەوروپشتی سلێمانی ، هەرچوار تابلۆی مەخموور ، قەلای کەرکووك ، تابلۆیەکانی خانووە کۆنەکان و بارانی بەهارو گوندێکی شەقلاوەو ، تابلۆیەکانی تری هاوینەهەواری صلاح‌الدین و مزگەوتی الخلفاء لە بەغداو هی تر ، ئەمانەگشتیان شەقلی کوردەواری و خۆ ولاتی یان پێوەیە ، ڕەنگی ڕۆژ هەلاتی لەهی ڕۆژ ئاوا جیا دەکرێتەوە ، سروشتی هەر شوێنێك مۆرکێکی تایبەتی هەیە ، ئەوەتا لە هەر چوار تابلۆی – مەخموور – جۆرە جیاوازی یەك لە نێوانیان‌دا بەدی دەکرێ . ئەمەش بارە دەروونی یەکەی هونەرمەند دەردەبڕێ . ڕاستە هەر چوار تابلۆ (مەخموور) دەردەخەن ، بەلام هەر تابلۆیەك جیهانێکی سەر بەخۆیەو قەوارەیەکی تایبەتی خۆی هەیە . هونەرمەند کەلەم شارەدا ماوەیەکی لێ بەسەر بردووە ، سەردەمی مندالی و هەرزەکاری و لێ ی دوور کەوتۆتەوە چەند جارێك گەڕاوەتەوە ، کۆمەلێك یادگارو بیرەوەری لەمێشکی دا کۆ بوەتەوە ولەدەروونیدا پەنگیان خواردۆتەوە ، کەدەربڕبون جۆرە هەستێکی ناوەخۆی دەروونی وورووژاندوویەتی و تابلۆیەکانی پێ هێناوەتە بەرهەم .

بۆیە ئەگەر سەرنجێکی وورد بدەیتە هەر تابلۆیەك دەبینی هونەرمەند تەعبیر لە قۆناخێکی تایبەتی خۆی دەکات ، ئەگینا کەی ئاسمانی – مەخموور – ئەو جۆرە ڕەنگەی بەخۆیەوە دیوەکە دوورە لە ڕەنگی ئاسمان ، مەخموورێك کە لەقرچەی هاویندا دیوارە قوڕەکانی لە بەرتین وتەوژمی هەتاوی گەرم سوور دەبنەوە و لە پالێ هەتاوەکەش سێبەرێکی تیر وخەست سەرهەلدەدا ، ئاسمانەکە بۆ وابێ ، بەرِنگێکی شینی تۆخی مەیلەو ڕەش خۆی بنوێنێ ؟ ئایا دەبێ هونەرمەند ئەوەندە نابەلە دبێ کە نەزانێ چۆن ڕەنگەکان لەگەلێ یەك دەگونجێن و بێ لە خۆیەوە ڕەنگی ئاسمان ئاوا لێ بکات کە لە ئاسمانی ڕاستە قینەی – مەخموور – نەکات ؟ ! یان دەربڕینی هەستێکی قوولێ پەنگی خواردۆتەوە ، تەم بەر دلی گرتووەو ، هەموو گیانی وروووژاوە ؟ دیارە دەبێ ڕەنگی ئاسمانەکش ڕەنگدانەوەی باری دەروونی کەیل وتا ساوی بێ .

لە تابلۆی – بارانە بەهاری لەشەقلاوە – ئەو دیمەنە پڕ لە مەزنی و شکۆیەی سروشت و جوانی و بەرزی‌یەتی کە سەرنجی



بینەر ڕادەکێشن ، خانووەکان لەبەر تەوژمی ڕەشەبا لاربوونەتەوە خەریکە بکەون ، دەرختەکان کەوتوونەتە ژێر باری ڕەشەبا ، لەناو ئەو دیمەنەدا جوانی و نازداری شەقلاوە – بووکی کوردستان – بەدی دەکەیت ، هەروەها لە تابلۆی گوندێکی دەرەوەی شەقلاوەی بناری سەفین و دیمەنی شایی وزەماوەندو بووك گواستنەوەو کچانی جل ئاڵو والای دەم کانی لەلایەك و گەڕانەوەی بەرەو ماڵو ژیانی خەڵکی ساکار لەلایەکی ترەوە دیمەنێکی دڵگیر پێك دێنن . جۆرە ڕووناکی یەك و گەشانەوەیەك لە ڕەنگی زەوی‌و ئاسمان بە دڵی دەکەیت .

تابلۆی دەمی ڕۆژئاوا بوون لە دەوروپشتی هەولێر ، دیمەنێکی پڕ لە داهێنانی هونەرکاریی حەمە عارفە ، ئەوەتا چەند شۆڕەسوارێ لە ژێر ڕێژنەی بارانی دەم باوە وەك بروسکە دەبەزن ، بەیەك ئیقاع دەبەزن ، هەر ئەوەندە گوێت لە ترپەی ناڵەکانی ولاخەکانیان نیە ، ئەو دیمەنە دڵڕفێنەی باوەش سروشت جوولاندنی بەم شێوەیە . نیشانەی بەهرەو داهێنانی هونەرمەندن ، بەتایبەتی سەر لە ئێوارەیەکێ درەنگ کە لە دوورەوە دیمەنی دێیەکانی قەد شاخ دیارە ، ڕەنگی گەرمی ناو ڕەنگی سارد کە وەك تروسکە ئاگر دینە بەرچاو . قووڵی لێدانی فرچەکانی هونەرمەند وحیساب کردنی چۆنیەتی بەکار هێنانی ڕەنگ‌و هێڵەکان ، ئەمانە گشتیان زادەی خولیاو بۆ چوون‌و هەژارن‌و ورووژانی هونەرمەندە ، کەراچڵەکان‌و هەژانی ناوەوەی باڵی داهێنانی لێ ڕواندووە .

بڕوانە «بارانی ڕێگەی سلێمانی» ئای لەو دیمەنە دڵکێشە ، لەوانەیە تۆ ڕێبوارێکی ماندووی ئەم ڕێگەیە بی وبکەویتە ژێر ڕەحمی ڕێژنەو ڕەهێڵەی باران ، یاخود بەئۆتۆمبیلەوە بۆ سلێمانی دەچی و خۆت لەناو ئەم دیمەنەدا دەبینی ، تۆ وەرە لە ئاستی بەرزی و مەزنی سروشت بوەستەو بتوانە وینەیێك بکێشی کە دەروونی خۆت لەگەڵ واقیعی بەرچاوت تێکەڵاو بکەیت ، کام ڕەنگ بۆ ئەم دیمەنە دەست دەدات ؟ ئەو هەورە تڵخە ڕەشەی کەبەری ئاسمانی گرتووەو دەوروبەری ڕێگەی قووت داوە کەوا دەزانی ئەم باووبارانە ووچانی بۆنیە ، بەلام لەناو ئەم هەورە تووشەدا هەورێکی تەنك بەدی دەکەیت کە ئاسمانی شین لەژێریا خۆی پەنهان داوە ، کە لە تابلۆیەکە وورد دەبیتەوە ، ئیقاعی ڕەنگەکان دەنگی بارانت دەخەنە بەر پەردەی گوێ ، لەوانەیە دەیان خەیاڵو خولیا لەناخەوە بتەه ژێنن و دەیان بیرە وەریی شەوانی زستانی بەر ئاگردانت بێتەوە یاد «هونەر ئەوەیە کە کارت تێ بکات‌و بتجوولێنی» ، کە لە ڕێگاوە بەناو ئاوو باوباران ڕێگەشەق دەکەیت و لە سلێمانی نزیك دەبی یەوە ، بەرە بەرە شارت لێ دەردەکەوێت تا خۆت دەکەیت بەناو شارا . وادیارە لە تابلۆی سی‌یەمدا بارانەکە خوشی کردووە وشەوت بەسەر دادێ ، شار خامۆش‌و بێدەنگ نیە . خانووودوکانەکانی ئەم بەرو ئەو بەر دیمەنی پاش بارانت دەخەنە بەرچاو ، لەناویا زنجیرەی ئۆتۆمبیلەکان‌و گلۆپەکانیان وچراکانی سەرشەقام زیاتر دەتخەنە ناو دیمەنەکەوە . هەست دەکەیت ئیقاعێکی بەردەوام خامۆشی جیهانێکی دی . هونەرمەند لە ڕێگەی ڕەنگەکانی یەوە زیندوویی بەشەقام‌و ئۆتۆمبیل‌و خانوو وبەرەکان دەبەخشێ . . .

باله سلێمانی‌یەوە با دەینەوە سەر هەولێرو لەناو تابلۆی دوو کۆڵانەی تەنگەبەری قەڵاتی هەولێر ، سەر لەو قەڵاتە دێرینە خوار بکەینەوە ، ئەوەتا دیارترین ڕەمزی شارستانییەتی کۆنت دێنێتەوە بەرچاو ، لە نەخش‌و نیگار و جۆری بینای قەڵاتەکە . ڕاستە قەڵاتەکە گەردی کۆنی لێ نیشتووە ، بەلام هێشتا ژیانی تێدا دەگەڕێ . هونەرمەند هەردوو کۆڵانەکەی بەشێوەیەکی جیاجیا وێنە کێشاوە ، تەکنێکی نوێی لەگەڵ نەخش ونیگاری کۆن تێکەلاو کردووە ، تەنانەت شتەووردەکانی سەر دیواری ماڵەکانیشی خستۆتە سەر تابلۆیەکە ، هەرچەندە کە ساکارو ووردیشن ، بەلام ئەو وەك هونەر مەندێکی واقیعی ڕەسەن و ڕاستگۆ هەست ونەستی خۆی تێکەڵ بە تابلۆیەانی دەکات .

کمال غەمبار

# راوەستیانەك ل نك داڤنشی و مونالیزا





•وصفي ردیني•

یا خویابە کو مەهەمیا ناڤێ (داڤنشی) یێ بهیستی ئو هەر دەمێ مە گول ناڤێ داڤنشی دبیت بێ گومان کەڤالێ (مونالیزا) دێ هێتە بەر چاڤێ مە ئەڤە ژلایەکیڤە، ژلایەکێ دیڤە ئەڤ کەڤالە گەلەکێ ب ناڤ و دەنگە وگەلەك نڤیسەڤاناو رەخنەگرا یێ ل سەر نڤیسی لەورا من دیت ئەڤ کەڤالە هەژی لێکولینێ و شروڤە کرنێ دا خویندەوارێ هێژا پتر ئاگەهداربیت ل سەر رێبازێ چێکرنا ڤی کەڤالی و بزانیت مەبەست ژی چیە ؟؟..

بەری ل سەر کەڤالی باخڤین مە دڤێت ئەم پیچەکێ لسەر ژیانا (لیوناردو داڤنشی) باخڤین دا بزانین کاڤ کەڤالی چ پەیڤەندی دگەل ژیانا وی هەیە !..

ناڤێ وی (لیوناردو بیرودا ئنتونیو داڤنشی) یە سالا ١٤٥٢ ل باژێرێ ڤنشی ل ئیتالیا) یێ هاتیە دونیایێ بابێ وی دژینا خودا چار ژن ئینانە ... ل سالا ١٤٦٤ چو

کەڤالگەها (ڤیروکیو) . . . ل سالا (١٤٧٣) یێ ئێکەمین وێنە چێکر . . ژنا ئێکێ ژچار ژنێت بابێ وی دایکا وی بو ناڤێ وێ (کانزینا) بو ئێك زاروك ب تنێ هەبو ناڤێ وی (لیوناردو) بو پشتی مرنا (کانزینا) خودان کرنا . .(لیوناردو) ما ل هڤیا وان سێ ژنێت دی .

ب ڕاستی داڤنشی گەلەك دایکاخو دڤیاو هەر دایکا وی ژی گەلەك گەلەك کورێ خو دڤیاو پشتی (داڤنشی) بسپورو مەزن بو وینێ دایکا وی‌و بشکورینا وێ‌و هەستی سڤکیا وێ‌و نازکیا دەست‌و لەش‌و جوانیاتیا وێ هەر ما دمەژیێ داڤنشی‌دا .

ئەم دێ هینە ل سەر وێنەی . . .

خودانا وێنەی ژنکەکا خەلکێ (فلورنسا) بو ژی یێ وێ (٢٣) سال بو ناڤێ وێ (مونالیزا یان جیوکندا) بو ، ژنا فرانشسکو جوکندا . . . مونالیزا ژنەکا گەلەکا جوان‌و نازك‌و هەستی سڤك‌و خودان ژیربو ، مونالیزا مێرێ خو نەدڤیا . . . ژبەر جان‌و ژێهاتیا وێ ناڤ‌و دەنگێ وێ بەلاڤ بو ژی یێ مونالیزا شازدە سال بو ل دەمێ شوی کری . . کورەك هەبو هێشتا ژی یێ وی نەبویە (سێ سال) مر ! ! ب ڕاستی مونالیزا یێ گەلەك کورێ خو دڤیا . . . چاڤێ مری گەلەك پوسیدە بوو نیشانێت تنگژینێ ل سەو چاڤێت وێ دیاربو . داڤنشی ل دەمێ ب مونالیزا یێ زانی‌و جوانیا وێ حەسیای دیت گەلەکا دامایە ڤێ چەندێ کار تێکر کو ل دیڤ بچیت‌و بزانیت بابەت چی‌یە ئەڤجا دەست هاڤێتە چێکرنا وێنەکی بو وێ . چاوا وێتە چێکر ؟ ؟ ؟

هەر جار دا مونالیزایێ بەتە ئۆدا خو ل دەمێ بوهارێ نەمازە دەمێ ل روژ ئاڤاو دا فرمانێ دەتە تیا موسیقی وئاوازا ب لێدانا ئاوازێت خوش دا کو ڕەنگك‌و دلێت مونالیزا خوش ببن .

وێنێ مونالیزا دوو سێ هاتە چێکرن . . .

دڤنشی مونالیزا چێکربو ژنکەکا پوسیدەو پرژیرو جان‌و وەسا دیارکر کو دڤێت ئەڤ وێنێ وێ ب پیروزی بێتە ارزتن ژبەر هندێ نهو ئەڤ کەڤالە (کەڤالێ مونالیزایێ) ل موزەخانا (لوڤەر) دا پاریسێ مایە . .

کەڤالێت دی (مونالیزا) کرە ژنکەکا جحێلو جوان‌و خودان هزرو بیرو نازك‌و یا بەرێ خو ددەتە جیهانێ ب بەرێ خودانەکا کویرو دویرو ل پشت سەرێ وێ چیایێ (ئەلب) خویا دکەت . . دڤێت بزانین کو هزرو بیرو بەرێ خودانا (داڤنشی بو مونالیزا) نەوەك هزرو بیرو بەرێ خودانا زەلامەکی بو ژنکەکا جان‌و ژێهاتێ ، بەلکو پتر بو یانکو پەرستن (التقدیس) بو ئەڤ هزرە وەك هزرا . بچوکی بو دایکاخو دەمێ یێ ئامادەیە بو پەگوداریا دایکا خو . .

بشکورینا (مونالیزا یێ) گەلەك یا ل سەر هاتیە نڤیسین ل دویماهیێ گوتن . .ئەم نزانین مەبەست

ڤێ بشکورینێ چیە ؟ ؟ ! ! . . ئەڤجا (معجزە) یە ! ! بەلێ ئەز دبێژم نە (معجزە) یەو نەهندە . . . بەلکو تشتەکێ خویایەو ئاشکرایە کو رامان‌و مەبەستا (داڤنشی) ب چێکرنا بشکوورینێ (ببرهاتنە بو بشکورینا هەر دەم ل سەر لێڤێت دایکا وی) و من هندە بەلگە هەنەبو ڤێ چەندێ . . .

١ – هەر وەکو مە گوتی هەر دەم بشکورین‌و جوانیاتیاو نازك‌و نازداریا دایکاوی ل بەر چاڤێت وی بوو دڤیا بەزرە نەبیت‌و بێخیتە بەر چاڤ . . . ڤێجا دیت یا چاکتر ئەوە ب ڕێکا ڤی وێنەی بشکورین‌و نازداریا دایکا خو دیار بکەت . .

٢ – باشە بوچی گەریا مونالیزا ژێ گرت ؟ ؟ .چونکی بابەتێ مونالیزا وەك بابەتێ دایکا وی بو (مونالیزایێ) زاروکەك ب تنێ هەبو ئەو ژی زوی مر . . . دایکا داڤنشی (داڤنشی) ب تنێ هەبو و هێژ داڤنشی یێ بچویك دایکا وی مر . . خویندەڤانێ هێژا بەرێ خو بدێ چاوا پەیڤە ندبەك دناڤبەرا هەردوو بابەتادا پەیدا دبیت .

٣ – هەر وەکو مەگوتی ئەڤ کەڤالە دوو سێ جارا چێکرو جارا ئێکێ چێکری چێکر ژنکەکا جوان‌و هەژی پەرستن . . . ! ! خویندەڤانێت هێژا ئەم هەمی پێ دزانین ئاوایەکێ پەرستنێد ناڤبەرا مروڤ‌و دایکاوی دا هەیە . ئەڤ سێ گروڤە (دلیل) من ئینان بو ڕاستیا هزرا خو هەر برادەرەکێ هزرەکا دی هەبیت هیڤیدارم خویابکەت . . . ئەڤ کەڤالە (لوحە) ڤێ گاڤێ پاراستیە ل موزەخانا (لوڤەر – ل پاریس

### ژێدەر


١ – الجمال والحب والفن لبيب الرياش دار الاندلس بيروت

٢ – الفن عبر التأريخ عفيف بهنسي مطبعة الجمهوريه دمشق

٣ – ليوناردو داڤنشي أحمد أحمد يوسف دار المعارف مصر

٤ – أفاق النقد التشكيلي عباس العراف بغداد

٥ – الابداع في الفن والعلم د – حسن أحمد عيسيه مطابع اليقظة كويت

# چارەکاری دەروونی منداڵ

وەرگێڕانی : ع.ع. شەونم

منداڵ گوڵی ژیانی ئەم جیهانەیەو ، شێوەی شیرنییەتی ، هەر کە ژیان لە لەشە ناسکەکانیاندا پڵی‌دا ، چەندان سۆزی بەرز بەرزیان تێدا دەشەکێتەوە . سۆزی باوکیەتی ، سۆزی دایکیەتی . دایکانو باوکان لەسەر ئاوازی دەنگیان بە شادمانییەوە لەخۆشیاندا سەما دەکەن .

هەر لە سەرەتاوە کە مەلۆتکە سەر دەردەهێنێ بەرەو ژیان دەنگی زریکەی لێ بەرز دەکاتەوە بۆ ئەوەی جارێکی باش بدا کە هەیە . هەرچەند زانیاری زریکەی ساوای تازەبوو ، بەشێوەیەکی تر لێك دەداتەوە – جیایە لەگەڵ جاردانی بووندا ، جا ئەو هاوارە ، وا لێك دەردرێتەوە ، کە پێویستیە کە بۆ هەردوو سیەکەی تا دەست بکەن بە ئیش‌کردنو ، هەناسەی ژیان پێشکەش بە تازە میوان بکەن ، دوای ئەوەی کە دایکی ماوەیەك ئەو کارەی بۆ هەڵسووراندوە – لەگەڵ ئەم روونکردنەوەی زانیاریەیشدا ، ئەو باوەرە ، هەمە جۆرانەی ، بەسراوە بە زریکەی منداڵەوە لە کاتی لەدایك بوونیا ، جوانیو شوێنێکی خۆی هەیە لە ژیانماندا ، تەنانەت با ئەو باوەرانەش مایەی زوربوونی خایلەی خراپیش بێ . هەروەکو مەعەرەی فەیلەسوف بۆی چووەو دەڵێ :

هەرکە بانگی کارەساتو گوێبەندێ لە جیهاندا بڵاو بووەوە ئەوە زریکەی منداڵێکی تازە لەدایك بووە . ئەگینا چی هەیە بێ‌گرێنێ لەم جیهانەدا کە خۆشترو فراوانترە لەوەی تێدا بووە .

ڕای دوکتۆرەکان ئەوەیە کە زریکەی منداڵ لەگەڵ سەرەتای مانگی سێهەمی تەمەنیدا بایەخێکی تایبەتی هەیە . چونکە منداڵ هاوارەکەی– لەم تەمەنەدا بەتەواوی – دەگۆرێ‌و دەیکا بە هۆیەکی دەربرین ، ئیتر مەلۆتکە لە مانگی سێهەمدا دەتوانێ زریکەی خۆی بەباشی بەکاربهێنێ بۆ دەربرینی پێویستیەکانی . هەرکە دایکی لێ دوورکەوتەوە دەگری ، دەگری ئەگەر برسێتی زۆری بۆ بهێنێ ، یان کاتێ کە پیسایی قارسی بکا . هەروەها ئەگری ئەگەر هەر جۆرە مەترسیەك رووی تێ بکات ، ئەو توانایەیش بەسەر بەکارهێنانی زریکەدا بۆ مەبەست دەربرین لە منداڵی دوومانگاندا کەمە ، چونکە ساوا لەم تەمەنە ئەو « شارەزاییەی » نی‌یە بتوانێ زریکەی خۆی بەکاربهێنێ بۆ بەجێ‌هێنانی پێویستیەکانی . بەڵام ئایا رەنگ هەیە مەبەستێکی تر لە زریکەی منداڵدا هەبێ بێجگە لە مەبەستی بەجێ‌هێنانی پێویستی ؟ ئەی ئایا زریکەی بەردەوامی منداڵ ، یان برانی زریکەی بەتەواوی دەبێتە هۆی جۆرە پەشێوییەکی ئەندامانە ، – یان دەروونی – ؟

وەلامی ئەو پرسیارە لای ئەم لێکۆڵینەوەیە کە لە «مەڵبەندی لێکۆڵینەوە تەندروستیەکانی ژیری‌یەوە ، لە میریلاندی ولایەتی میشیگانی ئەمەریکاوە هاتوە .

**منداڵ بە دەروون گرێ‌باویە :**

ئەوی دەڵێ منداڵ «گەوجن» و مێشکیان پووتە بەهەڵەدا چووە ، چونکە بەڕاستی منداڵ لە دروست‌بوونیدا لە مرۆڤێکی

گەورە کەمتر نی‌یە ، هەست بە هەموو ڕووداوێکی دەوروبەریشی دەکا ، جا ئەگەر خێزان بێ‌دەنگ‌و خامۆش بێ ، ئەوا تین دەکاتە سەر ساواو ، لە پەنای ئەو خامۆشییەدا دەحەسێتەوە . خۆ ئەگەر ئاژاوە کەوتە ناو خێزانەوەو ، سەرچاوەی خامۆشی تێ‌دا ، ئەوا ساوایش بەشدار دەبێ تێیدا ، ئەویش شپرزە دەبێ‌و ، لە کپ‌و کری دەردەچێ .

د . جستن کول لە مەڵبەندی پزیشکیی ئیرڤیندا ، کە لەژێر دەستی زانکۆی‌کالیفۆرنیادایە دەڵێ : زۆر کەس وا دەزانێ کە منداڵ تووشی نەخۆشیی دەروون نابێ ، هەروەها دەڵێ لەهەندێ منداڵەوە ، کە تەمەنیان لە چەند ڕۆژێکی کەم زۆرتر نی‌یە ، گەلێ نەخۆشیی دەروونیان بۆ دەرکەوت ، وەکو ماتەمینی‌و شپرزەیی‌و ، وڕی (وڕی ، خایلەکردێکی گرنگە تێك‌چوونی سەلارەیی تێدابەو تاس دەبیاتەوە) .

گەلێ لایەنی تەندروستی دڵنیامان دەکا لەوە کە ئەم کۆرپە بچووکانە تووشی نەخۆشی دەروونی دەبن . لەبەر ئەوە لە ناوچەی لێکۆڵینەوەی تەندروستی ژیری‌یەوە لە میریلاند — کە خاوەنی ئەم لێکۆڵینەوەیە — دکتۆر ستانلی جیرنیزیان کە پزیشکی تەندروستی سایکولۆجی‌ی منداڵانە . دەستی کرد بە شی‌کردنەوەی تەنگوچەڵەمەی منداڵێك لە دووەم مانگی تەمەنیدا . ئەوەبوو منداڵەکە خامۆشییەك خامۆش بوو ، لەگەڵ سروشتیدا نەدەگونجا ، دەموچاوی نیشانەی ماتەمینی تێدا کێشرابوو . ئەو منداڵە — کە ناوی لیندابوو — ڕووی لەو کەسانە وەرگێڕا کە نزیکی دەکەوتنەوە . خۆ کە دایکی لە پێخەفەکەیدا دەری هێنا ، هەردوو قاچی بوکڵە تەکەی دەهات ، هەرچەند زۆر لە دوکتۆرەکان تەقەلایان‌دا چارەسەری «لیندا» بکەن ، لەگەڵ ئەوەیشدا کۆرپەلە هەر بە دەردی خۆیەوە مایەوە تا د . جریتزیان ، سەیری کردو نەخۆشییەکەی دۆزییەوە ، کە تووشی «خایلەکردنی زووبەزوو بووە» دوای تێپەڕبوون بەسەر چارەکردنی دەروونیدا لیندا هاتەوە سەر سروشتی خۆی‌و ، زەردەخەنەی تێ گەڕایەوە .

د . جیرینزیان‌و — ئەو دوکتۆرانەی لەگەڵیدا لە هەمان بواردا ئیشیان دەکرد — دڵنیان لەوەی ، کە شپرزەیی باری دەروونی منداڵ کار دەکاتە سەر توانایان بۆ فێربوون . هەروەها دەبێتە تەگەرە لەبەردەمی دامەزراندنی سەلارەیی‌یەکی بێ خەوشدا . خۆ ئەگەر ئەو منداڵانەی کە شپرزە دەروونن ، وازهێنرا لە چارەسەرکردنیان بەنیازی ئەوەی گەورە دەبن‌و لەو کۆتە ڕزگاریان دەبێ ، ئەوسا زۆر درەنگ دەبێت‌و . کات لە کیس دەچێ بۆ بەربەست‌کردنی ئەو جۆرە شپرزەییانەی تینێکی وێرانکاری بەجێ دەهێڵێ بەسەر سەلارەیی منداڵدا .

ئەوەی شایانی باسە ئەوەیە ، دەروون شپرزەبوونی منداڵ ، دەگەڕێتەوە بۆ ، لاوازیی ئەو پەیوەندییەی لە نێوان ئەوو ، دایکیدایە . چونکە زۆری دایکان ، پشت بە کەسانی تر دەبەستن — بەتایبەتی لە مانگەکانی سەرەتادا — بۆ ئەوەی منداڵیان دایین بکەن ، هەروەها زۆربەی دایکان ، لە جیاتی ئەوەی شیری خۆیان بدەن بە منداڵ ، کەبە شیری دەستکرد ، بەخێویان دەکەن ، ئەوەیش ، دەبێتە هۆی ئەوە ، کە منداڵەکە هەست بکا بێبەشە لە دایکی‌و ، پەیوەندییان لە یەکتر پچڕاوە . لە ئەنجامیشدا ئەو شپرزەییە دەروونیە پەیدا دەبێ ، کە جگەرگۆشەکان تووشیان دەبێ — بێ ئەوەی گوناهێکیان هەبێ .

**لەدایك‌بوونی زانیارییەکی تازە :**

زۆر بایەخ دان بە شپرزەیی دەروونی منالو ، ئەو کارەی ئەی‌کاتە سەر سەلارەیی . بوو بە هۆی لێکۆڵینەوە لەم بارەیەوە . ئیتر شان بە شانی مەڵبەندی لێکۆڵینەوەی تەندروستی میشلك‌کاری لە میریلاند ، کە لەم بوارەدا بە پێشەنگ دائەنرێ ، مەڵبەندی «ئیرڤینی پزیشکی»یش هەیە کە لەژێر ڕکێفی زانکۆی کالیفۆرنیا دایە . هەروەها نزرگەی زۆریش هەیە بۆ لێکۆڵینەوەی تەندروستی دەرونی کە لەژێر ڕکێفی زانکۆی ییل دایە : زۆری تریش لەو مەڵبەندانەی بایەخ بە لێکۆڵینەوەی ئەو باسە ئەدەن .

لە هەمو ئەو باس‌و لێکۆڵینەوانە کە چەنان سەرچاوەو ڕێبازیان هەیە ، تۆوێك بۆ زانیاریەکی تازە پەیدا بوە ئەویش «چارەکاری دەرونی منداڵ» .

ئەم زانیاریە تازەیە — وەکو ئاشکرا ناو ئەبرێ بە — تەندروستی دەرونکاری منالان، بەتایبەتی ئەوانەی لە سێ سالان کەمترن . ئەمەیش ئەوە ناگەیێنێ کە منداڵ ئەگەر لە سێ سالان تێپەڕی ، لە سنوری بایەخ پێدان ئەچێتە دەرەوە ، یان لەوە ئەخەڵەسێ کە تووشی پەشێوی دەروونی ببێ . بەڵکو مەبەست لەوە جیاکردنەوەیە کە لە بەینی ئەوەی کە ئەتوانێ ئێش‌و ئازاری خۆی دەربڕێ‌و ، ئەوەیشی کە هیچ توانایەکی نی‌یە ، چونکە منداڵی سێ سالانو بەرەوژوور ئەتوانێ بە ئاسانی قسە بکات ، ئەتوانێ — هەرچەند بەتەمەن بچووکە — ئەوەی

تووشی ئەبێ‌و ، بە هەشتی منالّیەکەی تێك ئەدا دەری‌بڕێ . جا لێرەدا ، دکتۆری منداڵان ، ئەتوانێ سکالاّکەی شی بکاتەوەو ، دوایش چاری بکات – سادەروونی بێت یان جەستەیی – بە پێ‌ی ئەو بارەی کە هەیە .

بەلاّم کۆرپەلەیەکی یەکەم پلەی ژیان ، نەك هەر ناسك‌و خلیچکە ، بەڵکو نایشتوانێ ، لەش بە باری خۆی ، دەربڕێ . تەنها هۆیەکی هەیە بۆ دەربڕین ، ئەویش ئەو زریکەیەیە کە جاروبار ، لە گەروە بچووکەکەیەوە دێتە دەرەوە ، ئەوەیش هەوڵی زۆری ئەوێ بۆ تێگەیشتنی‌و ، شارەزاییەکی فراوانی لە دەروونی منداڵی ئەوێت . جا بۆ ئەوەی بەراستی لێکی بداتەوە ، زانیاری تازە پێویستی بە پسپۆڕیە .

**دانانی بنچینەی چارەسەرکردن**

ئەوە زانراوە کە توانای مێشك‌و جەستەی منداڵ بە چەند قۆناغێکی پێگەیشتنی‌و ، پەرەسەندنا تێ‌ئەپەڕێ ، لێکۆڵینەوەی زۆریش کراوە بۆ روون‌کردنەوەی پلەکانی پێگەیشتنی دەروون‌و سنوور بۆکێشانی . ئەم لێکۆڵینەوانە ، ئەو هێڵە پانانەی داناوە کە سنور بۆ پێگەیشتنی دەروونی بێ‌خەوشی منداڵ ئەکێشێ ، ئەو نیشانانەی لەم هێڵە پانە دایە ، بەڵگەیە ، لەبەردەمی پزیشکی چارەدۆزا بۆ نیشانەکردنی نەخۆشیەکە . هەندێك لەو هێڵە پانانە ئەمانەیە :

لە مانگی یەکەم‌و دوەمی تەمەنی ساوادا ، پەیوەندیەکی فیزیایی قوولّ پەیدا ئەبێ ، لە بەینی منداڵەکەو دایکیا . هەروەها منداڵی تەندروست خواردنی ئاسایی‌و ڕێکو پێکەو ، نوستنیشی ئاساییە . دیسان لەم دوو مانگەدا ، منالّەکە دەست ئەکا بەوەی سەرنج لە دەوروبەری خۆی بدا کەچی رووئەدا ، لەگەڵ شوێنەکەیدا جۆش ئەخوا .

لەگەڵ کۆتایی مانگی دووهەما ، یان سەرەتای مانگی سێهەما ، منداڵی تەندروست ئەتوانێ زەردەخەنە بیگرێ .

بەلاّم لە ماوەی بەینی مانگی دووهەم‌و ، هەشتەمدا منداڵ فێری ئەوە ئەبێ کە دەم‌و چاوی دایکی بناسێ‌و جیای کاتەوە . دوای ئەوەیش ئینجا دەموچاوی باوکیشی . لەناو ئەو هەمو دەموچاوانەدا کە لە لای ئەو نامۆن . هەر لەو ماوەیەدا ، منداڵ پێویستی بە دڵنیا یی‌و پەنایەکە بیپارێزێ ، جا ئەگەر پەیوەندی خۆشەویستی ، لە بەینی ئەوو ، دایك‌و باوکیا ، بەهێز بێ ، ئەوە ئەتوانێ هەر شتێ بەدڵی نەبێ بەرهەڵستی بکاو نارەزایی خۆی دەربڕێ بەرامبەری . بەلاّم ئەگەر پەیوەندیەکە کز بێ ، ئەوسا منداڵەکە «گۆشە گیر ئەبێ»و ، زۆر کاتیشی شپرزە ئەبێ . هەروەها ئەو شەش مانگەی کە ئەکەوێتە بەینی دووهەم‌و هەشتەمەوە ، خۆ هەڵقورتاندن لە منداڵا پەیدا ئەکا ، ئارەزوویەکی سەرەتایی تیا پەیدا ئەبێ بۆ ئەوەی شت بناسێ .

هەروەها لە ڕێگای یاری‌کردنەوە لەگەڵ دایکوباوکیا ، توانای بیرکردنەوەی دەست پێ ئەکات‌و نیشانەی ئەو شتانە ئەزانێ کە چۆن بەڵگەیەکن لە پێگەیشتنا .

چامنداڵێ لەم قۆناغەدا لەلایەن دایکو باوکیەوە فەرامۆش کرابێ ، ئەوا پێگەیشتنی مێشکی هەروەها دەروونیشی لە هاوسەرانی دوا ئەکەوێ ، هاوسەرانی کە گیراونەتە خۆشەویستی‌و بە دەربەست بوونی باوکو دایکیانەوەن .

لە نێوان مانگی نۆهەم‌و هەژدەهەمدا ، منداڵ دەست ئەکا بە یەکەم هەوڵ بۆ ئەوەی سەربەخۆیی بۆ خۆی پەیدا بکا . ئەم قۆناغە پێویستی بەوەیە کە باووك ودایك باشی تێ بگەن بۆ ئەوەی منداڵەکانیان بەرەو چاکە هان بدەن‌و ، ئاراستەی بکەن .

جا لە ماوەی ئەو مانگانەدا شێوەی ڕەوشت‌و سۆزی منداڵ پێ ئەگاو لە پێشو زۆرتر ئاڵۆز ئەبێ ، نمونەیەکی سادە بۆ ئاڵۆزی ڕەوشتی منالّ لەو قۆناغەدا ئەوەیە هەوڵ ئەدا خۆی بشارێتەوە لە هاوسەرانی دایکی ، ئەم خۆشەویستیە درۆ نیە چەشنە پێگەیاندنێکی ڕەوشتی‌و دەروونی لە منالا ئاوەژوو ئەکاتەوە .

لەپاش حەڤدە مانگ منداڵ بە شێوەی نیشانە دەست ئەکات بە بیرکردنەوە . – بۆ نمونە – ئەزانێ ڕەنگی سوور نیشانەی تەنگو تووشیە . هەروەها دەست ئەکات بە فێربوونی قسەکردن . بەهرەی ئەوەیشی تیا پەیدا ئەبێ کە حەز لە جوانی بکات .

منداڵ لەم تەمەنەدا پێویستی بە دایکو باوکیەتی بۆ ئەوەی هەمیشەو بەردەوام هەڵی نێن‌و ئاراستەی کەن ، ئەگەر بیانەوێ پێگەیاندنێکی سروشتی‌و بێ‌خەوش پێ بگات .

بە ئامادەکردنی ئەم روە سەرزاریانە لە مێشکا ، کاری دوکتۆری دەروونی منالّ ئاسان ئەبێ – تا ڕادەیەك – چونکە سەیری منالّەکە ئەکات هەر لادانێك هەبێ لەم هێڵە پانەدا دیاری ئەکا . هەر چەند دوا دەست نیشان‌کردن‌و ، و وردبوونەوە بە چ قۆناغێکی تردا تێ ئەپەڕێ ، ئەوە دکتۆری چارەکردن

بەکاری‌ئەهێنێ ، پزیشك ئەوە تاقی ئەکاتەوە بزانێ کاری ماسوولکەکانی ڕێك‌وپێکەو بە شێوەیەکی گشتی باشە یان نا . نموونە بۆ ئەمە : توانای منداڵەکە تاقی ئەکرێتەوە ، بەوەی شتێ ئەخرێتە دەستیەوە بزانن ئەی‌گرێ ؟ . یان لە کاتی لێ‌وردبوونەوەیدا ، منداڵەکە ڕوو ئەکاتە کوێ ، یان کە بەرز ئەکرێتەوە بەرەو ژوور تا چەن پلە پشتی بە ئەچەمێتەوە . لە کۆتاییدا . ئایا یاری‌کردنی منالەکە وا دەر ئەکەوێ کە بێ سەرو پێ‌یە یان بە ئامانجە .

کە پزیشك لەمانە بوەوە ، لە ڕێگای دەستنیشان کردنی نەخۆشیەکەدا ، هەنگاوێکی ترئەنێ ، لە هەنگاوەکانی لێ‌وردبوونەوە . ئەم هەنگاوەیان پەیوەندی هەیە بە وردبوونەوە لە پەیوەندی منالەکە بە باوك و دایکیەوە . جا پزیشك چاودێری ئەوە ئەکات بزانێ دایکەکە چۆن منداڵەکەی هەل‌ئەگرێ‌و ، چۆن ئەی‌لاوێنێ و گۆرانی بۆ ئەڵێ . لە هەمان کاتیشا منداڵەکە چۆن گاڵتەو گەپ‌و نازگرتنی دایکی وەرئەگرێ .

سەیر لەوەدایە ، ڕەوێڵی دایکان بەرامبەر ڕۆڵەکانیان بەشێوەی گشتی لەم هەنگاوی لێ‌وردبوونەوەدا دەرئەکەوێ . هەر چەند لە پێشا وادەرئەکەوێ کە کەڵکی کەمە ، بەڵام دایکەکە چۆن منداڵەکەی ئەگرێتە باوەش ، زۆرو کەمی خۆشەویستی چۆنە بەرامبەری . هەروەها کە دایك منداڵەکە بە مۆنی‌و ڕقەوە هەڵگرێت ، ئەبێتە بەڵگە بۆ زانینی سەرچاوەی تەنگوچەڵەمەی منداڵەکە . بەڵکو چەشنی ئەو گۆرانیانەی کە دایکەکە ئەی‌لێ بۆ منداڵەکەی‌و ، ئەویش سەر ئەنێ بە سنگیەوە ئەوە نیشان ئەدا ئایا ئەو منداڵە – هی ئەو دایکەیە – پێگەیشتنێکی دڵسۆزانەی ڕێکوپێك پێ ئەگا یان نا . تەنانەت سەرنجی دایکەکە – هەروەها منداڵە کەیش – لە کاتی گاڵتەو گەمەکردنا بەڵگەیەك ئەدەن بەدەستەوە لە بەڵگەکانی پێشوو بایەخیان کەمتر نی‌یە .

جا ئەگەر پزیشك بەم هەمو هەنگاوانەدا تێپەڕی ، ئەگاتە ئەوەی بزانێ منالەکە تووشی چ گێچەڵێ بوەو ، سەرچاوەکەی کامەیە . ئیتر لەسەر ڕووناکی ئەوە دەست ئەکات بە دانانی .چارەسەرکردنی منداڵەکە .

**کەڵکی زانیاریی تازە :**

کەڵکی چارەکاری دەروونی منداڵ بەوەوە ناوەستێ کە چاری منداڵی دەروون پەشێو بکات‌و بەس ، بەڵکو ئەڕوا بۆ ئەوەی لە بنچینەدا بەرهەڵستی پەشێوی دەروونبکات . ئەیشتوانرێ ئەم هیوایە بهێزێتە دی لە ڕێ‌ی فێرکردنی دایکنموە – هەروەها باوکانیشەوە – کە چۆن هەڵسوکەوتی ڕاست ئەکەن بەرامبەر ڕۆڵەکانیان .

لە سەرەتاوە ڕوونمان‌کردەوە کەچۆن پچڕانی پەیوەندی لە نێوانی دایك‌و منداڵا سەرچاوەی گۆبەنە . هەر لەم خاڵەیشەوە تەنگوچەڵەمەی دەروونی منداڵ دەست پێ ئەکات‌و ، ڕێگا ئەگرێ لە پەیدابوونی سەلارەیی منداڵەکە ، پەیدابوونێکی پێ خەوش .

بۆ ئەوەی زیاتر لەسەر ئەم مەبەستە جەخت بکەین ئەم دوونموونەیە ئەهێنینەوە ، هەردوکیشیان هی پێچراوەکانی «ناوچەی لێکۆڵینەوەی تەندروستی مێشك‌کارین» لە میریلاند . منداڵێ لە تەمەنێ چوار مانگیدا تووشی ماتەمینی بوە حەز ناکات سەرنجی هیچ دەموچاوێك بدا لە ڕوی ئەو مرۆڤانەی سەیری ئەکەن . بە لێکۆڵینەوەی گیروگرفتی ئەم منداڵەو لێ‌وردبوونەوەی بە پێ‌ی ئەو هەنگاوانەی لەپێشەوە باسمان کرد ، دەرکەوت کە دایکەکە هەرگیز چاوی خۆی بەکارنەهێناوە بۆ ئەوەی چاوی پیادا هەڵێنێ .

نموونەیکی ترئەوەیە منداڵێکی شیرە خۆرە لە تەمەنی سێ مانگانا بە توندی ئەی زریکان دایکەکەیشی لەگەڵ هەمو زریکەیەکیا هەڵی ئەگرت ، دوایی دایکەکە بۆ ئەوەی لە گیروگرفتی زریکە ڕزگاری بێ ، هات بە تەواوی وازی لە هەڵگرتنی منداڵەکە هێنا ، لە پاش مانگێ منداڵەکە کەوتە بارێکی شپرزەییەوە بەزەیی ئەجوولان . کە گیروگرفتەکە شی‌کرایەوە دەرکەوت کە دایکەکە بە ڕقەوە منداڵەکەی هەڵگرتوە . وای‌لی‌کردوە کە هەست بکا بەتەواوی ئاسایشی لێ براوە ، لەبەر ئەوە هەرچەند دایکی هەڵی گرتوە ئەو زریکاندوێتی .

ئیتر چارەکاری دەروونی منداڵ چەنان ئاسۆی فراوانتر ئەکاتەوە لەبەردەمی دامەزراندنا بە خشتی منداڵانی بێ‌خەوش کە لەڕێ‌ی پەیدابونیانا بە پاکی‌و ناشکستی ، بە تواناتر هەست بە پلەی قووڵی مەبەستی ژیان ئەکەن‌و ، زۆرتر ئەبەخشن بە ژیان .

**مانای چەند ووشەیەك کە لەم ووتارەدا بەکارهاتووە :**

**وڕی : الذهان**

**سالارەیی : شخصیة**

**خایلة کردن : اضطراب عاطفي**

**بوکڵە : بووکە شووشە**

**زریکە : قیژە (صیاح)**



هيڤيدار هروری

ڕاگەیاندن دیاردەکا ئاشکرایە ژ دیاردێن چەرخێ بیستێ ، دسەر هندێدا کو ڕهو ڕیشالێن وێ دگەهنە کویراتی‌تا دیروکا کەڤن .

دیسا ڕاگەیاندن دەنگ‌وباس‌و زانین‌و بابەتێن خوگرو ڕاست دگەهینیتە جەماوەری[1] .

ڕاگەیاندن دهەر ملله‌تەکیدا ، ئاڤاکرن‌و بزاڤا ڕامیاری‌و کومەلایەتی‌و کوپوراهی‌یا (الأقتصاد) وی ملله‌تی پێش‌چاڤ دکەت ، نابیتن دویر بیت ژ ڕاستی‌یا ملله‌ت تێدا ، نابیت بێتە جوداکرن ژ مەرج‌و کارو بارێن کوپوراهی‌و ڕامیاری‌و کومەلایەتی ، چونکی ژیان بهەمی دەراڤ‌و کەلێڤێن خوڤە نەشێت بژیت بێی ڕاگەیاندن .

**پێنگاسینا ڕاگەیاندنێ :**

گەلەك پێناسین بو ڕاگەیاندنێ یێن دهاتینە گوتن‌و بەرپەرێن دیروکا یێن ماچ‌کرین ، لێ یا ژهەمی‌یا کاریگەرترو خوگرتر تانوکە ئەوە یا زانایێ ئەڵەمانی «ئوتوجروت»ی دانای کو دبێژیت : «ڕاگەیاندن دەربڕینەکا ڕاست‌و دجهێ خودایە بو ژیری‌و گیان‌و ئاڕاستا جەماوەری هەر دێنك دەمدا»[2] .

ئانکو ڕاگەیاندن نە دەربڕینەکا خویی‌یە (ذاتی) ژلایێ ڕوژنامەنوسی یان بەلاڤکەرێ ئێزگەی یان کاربەدەستێن تلفزیونێ یانژی ئەکتەرین سینەمایێ ، بەلێ دەربڕینەکا دجهێ خودایەو ڕادبیت بڕاستی‌یێ‌و دانانا ڕاستی‌یێ .

**پەیدابونا ڕاگەیاندنێ :**

ژنڤیسینو ڕاستیو گوتنا یا خویا بوی کو چاپخانێ جهەکی ژ هەمی تشتێن دی بلندتر بێ گرتی بو جودا کرنا چەرخێن نوکەو چەرخێن کەڤن ژ لایێ ڕاگەیاندنێڤە .

دیسا ئەم دشێین بێژین کو چاپخانە ئێکەمین شورشا ڕاستو دجهێ خودایە کو ڕاگەیاندن گهوری ژ دەمەکی بو دەمەکێ دیو ژ چەرخەکی بو چەرخەکێ دی .

پاشی شورشا دووێ ژ شورشێن ڕاگەیاندنێ بنگەهێ خو دەیناو ڕویدا ئەوژی «ئاژانسا دەنگ‌وباسیە» کو سالا «١٨٣٥» سالا بونا ویێیە .

دوماهیێ شورشا سیێ سەرێ خو ڕاکر دکەلیڤێن ڕاگەیاندنێداو گەلەك داهێنەرێن نوی دگەل خو ڕاکرن وەکی سینەماو ئێزگەو تلفزیونێ .

دڤان چەند ڕێزێن بوریدا بومە خویا دبیت کو ڕاگەیاندنێ هندەك ڕێك هەنە پێ دگەهیتە جەماوەری ، ئەوژی ئەڤنە :

ڕوژنامەگەری ، ئاژانسا دەنگ‌وباسا ، ئێزگە ، تلفزیون ، سینەماو ئەڤاژی پال ددەنە ئەڤێن بوری ، پیشانگە ، کونفرانسێن ڕوژنامەنوسی ، سەرەدانێن (رسمی)و ێین نە (رسمی) [3] لێ دڤێ ژبیرامە نەچیت کو ئەڤ ڕێکە ڕاگەیاندنێ نوی ێین ڤدەست خوڕا گەهاندین ، ڕێکێن کەڤن تەنێ پوستەو هندەك جارانژی کەسەك ڤرێدکر د ناڤبەرا خێلو هوزادا دەنگ‌وباس دگەهاندن ، دیسا ڕەنگەکێ کوترا هەبو دگوتنێ کوترا «زاجل» پوستەو نامە دگوهاستن ژ جهەکێ بو جهەکێ دی .

**تۆخمێن ڕاگەیاندنێ :**

ڕاگەیاندن وەکی هەر تشتەکیدی ژ چەند توخما پێك‌هاتیە ، کو هەر توخمەکی کارێ خویێ نەخاسم یێ هەیو بێ ێ ڤا توخما ڕاگەیاندن نەشێن کارێ خو بسەرێکڤە بینیت ، ئەم دشێین بێژین توخمەك نەنێژی ژڤا توخما دگەل نەبیت ڕاگەیاندن دێ وەکی مروڤەکی ب‌پیەکی لێهێت .

ئەو سێ توخمژی ئەڤەنە :

١ – ڤرێکەر .

٢ – وەرگر .

٣ – ڕێکا بەلاڤ‌کرنا بابەتێ ڕوژنامی [4] .

هەرئێك ژڤا توخمانژی گرێدایە بکارەکیڤەو هەرئێك لدویڤ کارێ خو کارتێکرنێ دهەستو بیرێن جەماوەریدا دکەت .

١ – ڤرێکەر :

خودانێ بابەتێن ڕوژنامەگەرییێیە ، یان ئەو جهێ ئەڤ بابەتە ژێ دەردکەڤیت ، چ میری بیت ، چ کومپانییەك یان دەزگایەك یان کەسەك یا گەلەك کەس بن .

٢ – وەرگر :

ئەو کەسەیێ ئەو بابەتێن ڕوژنامەگەرییێ قەستاوی دکەن ئەوێن ژدەڤ ڤرێکەری تێن ، چ گوهدێر بیت چ خاندەڤا بیت چ بینەر .

٣ – ئەو ڕێکن ئەوێن ئەو بابەتێن ڕوژنامەگەری پێ تێنە بەلاڤ‌کرن چ ئێزگە بیت چ ڕوژنامە بیت چ تلفزیون یان گوتارەك یان ئاژانسا دەنگ‌وباساو . . تاد . . ژ ڕێکێن ڕاگەیاندنێ .

**پشکێن سەرەکی ێین ڕاگەیاندنێ :**

ڕاگەیاندنێ گەلەك تاوو پشك هەنە ، بەلێ ێین سەرەکی دوونە ئەوژی :

١ – ڕونامەگەری .

٢ – ئێزگەو تلفزیون .

دڤێ هەر ئێکێ ژڤا پشکا تشتەکی ژێ بزانینو بزانین کارتێکرنا هەر ئێکێ تا چ ڕاستیێیە لسەر هەستو بیرێن جەماوەری .

ڕوژنامەگەری :

ڕوژنامەگەری بشیانترینو بهێزترین ڕێکە ژ ڕێکێن ڕاگەیاندنێ بو ڕاڤەکرنو ڤەکولینا ڕاو پسیارێن گشتی دهەر کومەڵەکێدا ، یا بومە ڤێ ڕاستییێ ڕونتر دکەت ئەڤ گوتنەیە «هەر کومەڵەکی ڕوژنامەگەرییەکا لدویڤ بیرو ڕاێین خو یا هەی» .

ڕوژنامەگەری هەر دناڤ خودا پیشەسازیو بازرگانیو نامەیە ، ئو پشکەکا خودان ڕێزو بهایە ژکو ئەندامێ ڕامیاری ل هەر دەولەتەکێو هویەکێ سەرەکییە بۆ ئاڤاکرنا کومەڵگەها [5] .

ڕاگەیاندن خودانا ڕاستییێیەو لسەر پێتڤیە جەماوەری ڕوشنبیربکەتو تێ بگەهینیت بو برێڤەبرنا بارێن کومەلایەتیو کوپوراهیو ڕامیاری ، دیسا لسەر پێتڤیە تەناهییێ دناڤ خەلکێدا بەلاڤ بکەتو بپارێزیت [6] .

بکورتییا ڤێ چەندێ ، ڕوژنامەگەری نەك هەر کارەو بەس ، بەلکی ژیو ژیانە ، ئەڤجا ئەوێ ڕوژنامەگەرییێ بو خو داخازکەتو قەستا بکەت نە دێ بۆ خو ژیگریت تەنێ دا بۆ خوکاری بکەتو پێ بژیت ، نەء ، بەلکو دێ ڕهێت ژیانەکێ د مەژییێ خودا چینیت پڕی خو گوری کرنو خەبات دریا ڕاستیێدا .

**کارێن ڕوژنامەگەرییێ :**

ڕوژنامەگەرییێ چار کارێن سەرەکی ێین هەین کو ئەڤێن خارێنە :

١ – دەنگ وباس .

٢ – بلاڤ‌کرنا ڕاو ڕوشنبیریو زانیارییێ .

٣ – ڕابوراندن (تسلية) .

٤ – جاردان (إعلان) .

كورتی‌یا ڤاكاراو دگەل پەیوەندی‌یا هەرئێكی ب رۆژنامەگەریێڤە.

١ – دەنگ‌وباس :

ژگەلەك رەخاڤە ئەڤ پەیڤە یاهاتی‌یە خەپارەكرن بتەڤشیكێن زانا لیّ تا نوكە نەگەهەشتینە راستی‌یا پێناسینا دەنگ‌وباسی .

پێناسینا ژهەمی‌یا سەردەڤ ترو جهیّ خو دمێشكیّ خەلكێدا كر: ئەڤەیە :

«دەنگ‌وباس راپورتەكا دجهیّ خودایە لسەر رویدانەكیّ یا رایەكیّ یانژی راستی‌یەكیّ»(٧) .

٢ – بلاڤكرنا راو تی‌گەهەشتن‌و زانیاری‌یێ .

رۆژنامەگەری نەك گرێدایە ببابەتەكیڤە یان دوا یان سی‌یا بەلكو هەمەرەنگێن دەنگ‌وباس‌و بابەتا بەلاڤ دكەت ژ راو تورەیی رۆشنبیری‌و زانیاری .

٣ – رابوراندن (تسلیة) :

دیسا ژكارو ساخلودانێن رۆژنامەگەری‌یێ بەلاڤكرنا بابەتێن هرز بیراو بكارئینانا مێشكی‌و پسیاریێ هژماری‌و گوتنێن بكەنی‌و گالتەنە

٤ – جاردان (إعلان) :

جاردانا هەر تشتەكی كوكەس چو ژیّ نەزانێت ، دا هەر كەسە تشتەكی ژیّ بزانیت .

**ئاستەنگێن رۆژنامەگەری‌یێ :**

رۆژنامەگەری‌یێ گەلەك ئاستەنگ هەنەو دكەڤنە پێشی‌یێ‌و ناهێلنە برەنگەكیّ راست‌و جوان كاریّ خو بكەت‌و پێشڤە بچیت ، ژێدەرا ئاستەنگاژی تەنیّ ئێكە ئەوژی .

**ئێزگەو تلفزیون :**

هەر ئێكی ژڤانا كارتیّكرنا خو یا جودا یاهەی لسەر هەست‌و بیرێ جەماوەریّ وەرگر .

أ – ئێزگە :

پشكەكە ژ راگەندنیّ كاریّ خو یێ نەخاسمە برێڤە دبەت‌و كارەكی مەزن دهەست‌و بیرێن جەماوەریدا دكەت ، برێكا بەلاڤكرنا هەر تشتەكیّ دقەنجی‌و راستی‌یا ملەتیدا بیت . ژدەنگ‌و باس‌و بابەتێن هەمەرەنگ .

لڤیّ رێكیّ یان ڤیّ پشكیّ هنەك كێماتی یێن هەین ، هندەك ژیّ : هەر تشتەكی دەمیّ خوێی تایبەتی‌و دیار یێ هەی بۆ بەلاڤكرنیّ ، هەر تشتیّ ژمروڤی چو ئەو چودیسا جەماوەریّ وەرگر دیّ شێت پیّ كاریگەر بیت بتنیّ برێكا گوهـ لی‌گرتنیّ ، نەشێت بخوینیت وەكی رۆژنامیّ یا بیبنیت وەكی تلفزیونیّ . ژلایەكیّ دیڤە ئێزگە نەشێت وێنەی بەلاڤ بكەت دگەل دەنگ‌وباس یان پروگرامی ، ئەڤەژی ڤاژی رۆژنامیّ‌و تلفزیونیّ‌یە .

ب – تلفزیون :

دیسا پشكەكە ژراگەیاندنیّ جهیّ خو یێ نەخاسم یێ هەی دچاندنا رهێن رامیاری‌و راگەیاندن‌و هەر تشتەكیّ دخێرا گشتیدا بیت‌و دمەژی‌یێ ملەتیّ ناڤ خوییدا . تلفزیونیّ هندەك رۆخسارو سالوخدان هەنە كوپیّ تێتە جوداكرن ژ پشكێن دی یێن راگەیاندنیّ ، هندەك ژیّ وەكی :

جەماوەر دشێت دەنگ‌و باس‌و بابەتێن هەمەرەنگ ببینیت‌و گوهـ لی‌بگریت‌و گەلەك جاراژی بخوینیت ، ئەڤە ژلایەكیڤەو ژلایەكیّ دیڤە وێنەی بەلاڤ دكەت كو شیانا بزاڤیّ هەبیت دگەل دەنگ‌وباس‌و پروگراما ئەڤەژی دیّ پتر جەماوەری رازی كەت‌و كار لسەر هەست‌و بیرێن وی كەت(٩) .

ژێدەر :


١ – پەرتوكا (الدعایة والاعلام) د . عبد اللطیف حمزه ، چاپیّ دوییّ ١٩٧٨ بەرپەریّ ٧٥ .

٢ – هەر ئەو ژێدەر بەرپەریّ ٧٦ .

٣ – هەر ئەو ژێدەر .

٤ – دەرسا سەیدا عدنان عبد المنعم ، سەیدایێ پشكا راگەیاندنیّ لكولیجا تورەیی لزانكویا بەغدا ١٩٨١/١٢/١٣ .

٥ – پەرتوكا (الدعایة والاعلام) یامە نوكە گوتی بەرپەریّ ٩١

٦ – پەرتوكا (ماذا یعملون مخبروا الصحف) دانانا داڤید بوتر ، گهورین بو سەرزمانیّ عەرەبی (محمد مصطفى غنیم . سەرپەرشتی‌یا د . محمد محمد حسان .

١٩٦٦ قاهرة – نیویورك .

٧ – دەرسا سەیدا عدنان عبد المنعم ١٩٨١/١٢/٥

٨ – ژێدەری بەری نوكە (الاعلام والدعایة) بەرپەریّ ١١٦

٩ – دەرسا سەیدا عدنان عبد المنعم ١٩٨٢/٤/١١

Roshinbiry Nwe
General Cultural Monthly Magazine
Issued by: Kurdish Culture and Publication House
Ministry of Culture and Information
Baghdad - Iraq

رۆشنبیری نوێ
مجلة ثقافية شهرية عامة
تصدر عن : دار الثقافة والنشر الكردية
وزارة الثقافة والاعلام
بغـــداد

رئيس التحرير
مصلح مصطفى الجلالي

ناونیشان: دار الثقافة والنشر الكردية ساحة الجلاني بغداد
تەلەفون ۸۸۷٥۷۹٥ پێنج خەتە

نرخی ٥٠ فلسه

ئەم ژمارەیە ۸۰۰۰ دانەی‌لێ چاپکراوە

رقم الايداع في المكتبة الوطنية ببغداد ١١٢ لسنة ١٩٧٩

مسجلة بدائرة البريد برقم ١١٩

مطبعة الاديب البغدادية هاتف 8881232